# دیوانی ڕاجی

مەلا عەبدولڕەحمانی بارامی شارەزووری

مەسعوود محەمەد
پێشەکی بۆ نووسیوە

محەمەدی مەلا کەریم
پێداچوونەوە

د.عوسمان دەشتی - ئیسماعیل ڕاجی
ساغیان کردۆتەوە و ئامادەیان کردووە

٢٠١١

# دیوانی ڕاجی

( مەلا عەبدوڕڕەحمانی مەلا ئیبراهیمی کوڕی مەلا مەحمودی
بارامی شارەزووری)

مەسعود محەمەد
پێشەکی بۆ نووسیوە

محەمەدی مەلا کەریم
پێیداچۆتەوە

د. عوسمان دەشتی        ئیسماعیل ڕاجی
ساغیان کردۆتەوەو ئامادەیان کردووە

لەسەر ئەرکی زانکۆی کۆیە لە چاپ دراوە

٢٧١١ کوردی        ٢٠١١ زاینی

# دیوانی ڕاجی


- ساغکردنەوەو ئامادەکردنی: د. عوسمان دەشتی و ئیسماعیل ڕاجی
- بابەت: شیعر
- پیتچنی و هەڵەچنی: ئیسماعیل ڕاجی
- نەخشەسازی بەرگ: محەمەد زادە
- نەخشەسازی ناوەوە: خەلیل هیدایەت مام شێخ
- تیراژ: ( ١٠٠٠ ) دانە
- شوێنی چاپ : چاپخانەی ڕۆژهەڵات / هەولێر
- لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (٦٤١) ساڵی ( ٢٠١١) ی پێدراوە.

## سەرەتایەك

## بۆ چاپی دیوانی ڕاجی

ئەو سەردەمو ڕۆژگارەی كە (ڕاجی) شاعیر تێیدا پێگەیشتووەو تێگەیشتووە، سەردەمێكی پڕ لە جموجۆڵو گۆڕانكاری بووە. نێوان هەردوو جەنگی جیهانیو بە دروستیش ساڵانی نێوانی ١٩٢٠ - ١٩٤٠ لە سەدەی ڕابردوودا شوێنەوارێكی دیاری لە بواری ئەدەبو ڕووناكبیریو، بەگشتیش بەسەر ژیانو مێژووی كوردستانو كوردەواریدا بەجێ هێشتووە. لەو نێوەدا پێگەی شارستانی كۆیە لە لایەنی برەوپێدانی زانستو زانیاریو گەشەسەندنی شیعرو ئەدەبیاتی كوردیو دواتریش نەشونمای خەباتی نیشتمانییەوە، دیارو ڕوونو ئاشكرایە.

ڕاجی لەم كەشو هەوایەدا چاوی كردۆتەوە، لە ئامێزی مەدرەسە ئاینییە نێو بەدەرەكانی ئەو شارەدا پێگەیشتووە، لە ژێر سێبەرو دەواری قوتابخانە ئەدەبییە بە پیتو بەرشتەكەی؛ نالیو سالەمو كوردیو حاجی قادردا نەشونمای كردووە، كە چەندین زاناو ئەدیبو شاعیری مەزنی لە وێنەی، كەیفی جوانڕۆییو مەلا عەبدوڵڵای جەلیو ئەختەرو مەلای گەورەو قاصیدو عاصیو خادیمو ئاهیو دلاوەرو عەونیو سامی عەودالّو دڵدارو دلزاری .... پێگەیاندووە.

نوێكردنەوەی شیعرو ئەدەبیاتی كوردی لەو ئانوساتەدا لە بزاوتو جموجۆڵدا بوو، بۆیە ڕاجی لەگەڵ ئەوەشدا كە لە ژێر دەواری ئەدەبی كلاسیكی - عەرووزی پێشیناندا پەروەردە ببوو، وەلێ بە ناوەرۆكێكی ئەدەبی - كۆمەلایەتی ڕەخنەگرانەی نوێوە هاتۆتە مەیدانو بەهرەو هونەرەكەی پژاوە. هەر بۆیەشە دەبینین كە ناواخنو زمانو فەرهەنگو تێگەیشتنێكی جیاواز لە پێشینان، تانوپۆی هەموو تێكستو بەرهەمە شیعرییەكانی چنیوە. واتا ئەو لە بەرگو فۆرمو ڕوخسارێكی كۆندا شتی تازەو نوێی داهێناوە.

ڕاجی لەگەڵ ئەوەدا كە ژیانو ڕۆژگارێكی سەختی گوزەراندووە، بەلام مرۆڤێكی بەهرەوەرو بەهرەمەند بووە، جگە لە زمانی كوردیو شێوەزارە خۆماڵییەكانی، سۆرانیو كرمانجیو گۆرانی، بەسەر هەر سێ زمانە ڕۆژهەلاتییە ناسراوەكانی (عەرەبیو فارسیو توركی) دا زاڵ بووە. شارەزاییو ئاشنایی لەگەڵ زانستو ئەدەبیاتی ئەو زمانانەشدا هەبووە، ئەنجا بە هەر چوار زمان شیعرو بەرهەمی داهێناوە. سەرلەبەری دیوانەكەی نیشانەیەكی بەلگە نەویستە بۆ ڕادەی تواناو بلیمەتی ئەو مرۆڤە لە بوارەكانی زانستو زانیاریدا، ئەنجا چ زانیاری ئایینی بووبێت، یا زانستەكانی هاوچەرخ، یا لە مەیدانی زانستی شیعرو ئەدەبیاتدا بووبێت. وا نەبێ شاعیر لاسایی كەرەوەو شوێنپێ هەلگری ئەدیبو شاعیرانی پێشە خۆی بووبێت، بەلكو ئەو مرۆڤێكی داهێنەر بووەو ناوەرۆكی بیرو بارستایی دیوانو شیعرو بەرهەمەكانی پێمان دەڵێ، كە ڕاجی خاوەنی جیهانبینی كەسایەتیو تایبەتمەندی شیعری خۆی بووە. ڕاستە لە زۆر شوێنی دیوانەكەی ڕاجی

دا ئەوە بەدی دەكرێت كە ئەو لە ژێر ڕۆشنایی ئاوێنەی شاعیرانی وەكو: جزیری، نالی، سالم، كوردی، حاجی، شێخ ڕەزا، حەریق، حەمدی، بێخود، ئەسیری و تەنانەت عەلی بەردەشانی شاعیری میللی هاوچەرخیشی شیعرو بەرهەمەكانی خۆی هۆنیبێتەوەو سێبەرو تارمایی ئەوانی بەسەرەوە دیاربێت، بەلام لەمەشدا وەكو داهێنەرێك هەڵسوكەوتی كردووەو كەش و هەواو جیهانبینی تایبەتی خۆی، لە شیعرو هۆنراوەكانیدا ڕەنگی داوەتەوە.

ئەنجا ئەگەر بمانەوێت لایەك لە هونەرەكانی شیعری لەدیوانی شاعیردا بكەینەوەو كەمێك وتووێژی لەسەر بكەین، ئەوا لە زۆر ڕووەوە دەشێ شیكاری بۆ بكرێت. بۆ نموونە لە باری ناوەرۆك و مەبەستەكانی شیعرییەوە، دیوانی ڕاجی دەوڵەمەندو ئاڵو واڵایە، لە بوارەكانی وەصف و شیعری دڵداری و كۆمەلایەتی و نیشتمانی و ئایینی و لاواندنەوەو ستایش و داشۆرینەوە.. بەرهەمی بەپێزی هۆنیوەتەوەو سەرلەبەری دیوانەكەی پێ ڕازاندوەتەوە.

لە باری فۆرم و ڕوخساری شیعریش لەم دەرفەتە كورتەدا، دەشێ لە چەند ڕوویێكەوە هەڵوەستەی لەسەر بكەین:

- لەباری كێش و ئاوازەوە، ڕاجی لە بەشی هەرە زۆری شیعرەكانیدا پێرەوی لە كێشی عەرووزی كردووەو قاڵبە كێشە باوەكانی، هەزەج و ڕەمەڵ و ڕەجەزو سەریع و موتەقاریبی بەكارهێناوە.

لە بەشێكی هۆنراوەكانیشیدا ئاوڕی لە كێشی خۆماڵی كوردی داوەتەوەو قاڵبە كێشەكانی (٨ برگەیی و ١٠ برگەیی و ١٤ برگەیی) بەكارهێناوە.

- لە ڕووی سەروای شیعرییەوە شاعیر بە گوێرەی نیزامی عەرووز لە زۆربەی پارچەو غەزەل و قەسیدەكانیدا پێرەوی لە یەكێتی سەروا كردووەو زۆربەی دەنگە سەرواكانی ئالفوبێی كوردی لە هۆنراوەكانیدا بەكارهێناوە. ئەنجا سەروای هەمەڕەنگ و لەمانەشدا سەروای مەسنەوی و تەشتیرو هونەرەكانی تری سەروای لە شیعرەكانیدا بەكارهێناوە. تەنانەت ڕاجی لە مەیدانی هونەرەكانی (سەرواداری و كەرتكردن و سەروای ناوەوەدا)، ئەوەندە هونەرەوەرو وەستاو دەست ڕەنگین و خۆش ئاواز بووە، كە لە شیعرو دیوانی كەم شاعیری كورد دا ئەو جۆرە هونەری وا بەچڕی و سەركەوتوویی و وەستاییدا دەبینرێت، ئەنجا لێرەداو بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونە تكا ئەوەیە ئاوڕێك لە تێكستە لیریكەكانی لاپەڕە (٢٣٣-٢٤٨-٢٤٩-٢٨٥-٣٢٢-٣٣٨-٣٦٣) ی ئەم دیوانە بدەنەوە.

دیارە لێرەداو لەم كەمە دەرفەتییەدا ماوەی ئەوەمان نابێت كە نموونەی شیعری هەموو ئەو بەهرەو هونەرانەی شاعیر ڕوون بكەینەوە، چونكێ ئەم كارە پێویستی بە نەفەس درێژی و لێكۆڵینەوەو هەڵوەستە لەسەر كردنی تایبەت هەیە.

- هەر لە بواری ڕوخساری شیعرییەوە ڕاجی ئاوڕی لە هەموو جۆرو بەشەکانی هونەرەکانی ڕەوانبێژی وەکو، (ڕوونبێژیو جوانکاریو وتاناسی) داوەتەوەو لە ڕازاندنەوەی شیعرەکانی سوودو بەهرەی لێ وەرگرتوون.

- ئەنجا وێنەی شیعری بە جۆرەکانی کۆنو تازەیەوە، ڕایەڵی ئانوبۆی زۆرێک لە هۆنراوەکانی ئەخشاندووە. لەولاشەوە قاڵبە شیعرییەکانی وەکو (غەزەلو قەسیدەو مولەممەعو چوارینو پێنجینو پێنج خشتەکیو تەرجیعو تەرکیب بەند...) فۆرمی باوو بڵاوی هۆنراوەکانی پێک دەهێنن.

- هونەرێکی دیکەی ناوازە لە فۆرمو ناوەرۆکی شیعری ڕاجی ئەوەیە کە ئاوڕی لە (بەندو بەیتو باوی) کوردەواری داوەتەوە. کە بەشێکە لە هونەری شیعری داستانی کوردی، کە بە زمانێکی سادە لەسەر بنەمای کێشی خۆماڵی فۆلکلۆریو سەرەوای ڕەنگاوڕەنگەوە دەهۆنرێتەوە. ئەنجا ناوەرۆکەکەی لای ڕاجی دڵداریو کۆمەڵایەتییە، ئەم شیعر هۆنینەوەیشی لەسەر شێوەی بەیتو باوی فۆلکلۆری، بە هونەرێکی دیکە بۆ ڕاجی ئەژمار دەکرێت کە تێیدا خەیاڵ ناسکو زمان پاراوو سەرکەوتوو بووە.

<u>**چیرۆکی ئەم دیوانە:**</u>

کە بەوردی لە ژیاننامەو بەسەرهاتی شاعیرەوە ڕامێنین تا ئەندازەیەک تێ دەگەین کە ژیانێکی چەند پڕ لە ناسۆرو ڕەنجو دەردی بەسەر بردووە. لە بەرانبەریشدا مرۆڤێکی چەند بە هیممەتو بلیمەتو ژیان دۆستو بەورە بووە. زۆر جاران دەگوترێت ژیانو بەسەرهاتی مرۆڤی کورد، ڕەنگدانەوەی هەلومەرجی مێژوویيو سیاسی میللەتەکەی خۆیەتی !، ئەنجا چیرۆکو سەربوردەی دیوانی ڕاجیش ئاوێنەی تەواو بالانوێنی ژیانی خاوەنەکەی بووە. ئەو کە هێشتا لە هەرەتی تەمەنو ژیاندا بووە، لە ڕێگەی نزیکایەتیو دۆستایەتییەک کە لەگەڵ مامۆستا گیوی موکریانیدا بوویەتی، نیازی وابووە لە کۆتایی پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا، شیعرو هۆنراوەکانی لە بەرگی دیوانێکدا بە چاپ بگەیەنێت، هەر بۆ ئەو مەبەستە کورتەیەکی پێشەکیو چەمکێکی ژیاننامەکەی بۆ دیوانەکە، بە قەڵەمی خۆی نووسیوەتەوەو ئامادەکردووە، کە ئێمە لێرەدا وەکو ئەمانەتێک کە نیو سەدە بەر لە ئێستا نووسراوەتەوە، وەکو خۆی هێناومانەتەوە. بەڵام دیارە کە ڕۆژگار لەگەڵیدا یار نەبووەو بۆی هەڵنەسووڕاوە ئەو خواستەی بێنێتە دی.

لە ساڵانی (٧٠) داو دوا بەدوای کۆچی دوایی شاعیر، دیسان ڕەشنووسی دیوانو دەستخەتەکانی لەبەر دەستی ڕووناکبیرانی کوردا بووە لە چاوەڕوانی دەرفەتێک و هیممەتێک تاوەکو ئەم نیازە بێتەدی، بەڵام دیسان هەوڵەکان بە ناکامیو وەکو پێشووتر ماونەتەوە.

لە هەشتاکاندا دوو کەرەتی دیکە هەوڵو تەقەللا لە ئارادا هەبووە بۆ بە چاپ گەیاندنی

دیوانەکە، جارێکیان لە لایەنی کۆڕی زانیاری کوردەوە لە بەغداو جارێکیش لە لایەن بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری کوردی لە هەولێر، وەلێ ئەو هەوڵانەش سەرناگرنو کارەکە هەروەکو نیازو ئاواتێك هەر جارەی تەگەرەیەكو هەر ڕۆژەی گرفتێك لەبەردەمیدا... تاکو ئەم ساڵانەی دوایی هەروا بە ناکامی دەمێننەوە.

ڕاستی ئەوەیە من لە ساڵی ١٩٧٠ وە بوو کە بۆ یەکەم جار ڕاجیم ناسیو ڕاستەوخۆ شەیداو ئاشنای هۆنراوەکانی بووم، ئەویش لە ڕێگەی کورتە باسێکی مامۆستا عەبدولڕەزاق بیمارەوە بوو سەبارەت بە شیعرەکانی شاعیرو کورتەیەکی ژیاننامەکەی، کە لەو ساڵەدا لە یەکێك لە ژمارەکانی گۆڤاری (برایەتی) دا بڵاوی کردبۆوە.

لەم ساڵانەی دوایی کە لە زانکۆی کۆیە بووم، ئەو دەرفەتەم بۆ هەڵکەوت کە لە نزیکەوە پەیوەندی بە کاك ئیسماعیل ڕاجی کوڕی شاعیرەوە بکەمو مەسەلەی بە چاپ گەیاندنی دیوانەکەی لەگەڵ دا باس بکەم، داوام لێ کرد هەوڵ بدەین وێکڕا قۆڵی لێ هەڵماڵین و کار لەسەر دیوانەکە بکەین و ئامادەی بکەین بۆ چاپو بە هاوکاری دەزگایەك بڵاوی بکەینەوە. دیم ئەو جوامێرە بێ خەم دانەنیشتووەو بەشی زۆری کارەکانی ئەنجامداوەو دیوانەکەی سازو ئامادە کردووە بۆ بە چاپ گەیاندن. ئەنجا لەو ناوەدا مەسەلەیەك لە ئارادا هەبوو کە وای کرد ساڵێکی دیکەش بە دیار کارەکەوە دابنیشینو لە چاوەڕوانیدا بمێنینەوە. تا ئەوەی لەم بەهاری پڕ لە ماجەرایەداو دوای هەماهەنگی کردن لەگەڵ کاك کاوە ڕاجیدا کە ئێستا لە دەرەوەی وڵاتە، بڕیارماندا کەچی دیکە نەوەستینو کارەکە ڕاپەڕێنین، دوای ئەوەش کە لە ئەیلوولی ٢٠١٠ دا نامەیەکی زانستی - ئەکادیمی، وەکو لێکۆڵینەوەیەکی شیکاری بۆ شیعرو بەرهەمی ڕاجی بەشێوەیەکی تێرو تەسەل لەلایەن کچە خوێندکارێکی کوردی کۆییەوە، بۆ بەدەستهێنانی پلەی ماجستێر لە ئەدەبی کوردی، ئامادەو پێشکەش بە بەشی کوردی/ کۆلێجی پەروەردەی/ زانکۆی سەلاحەددین کرا. ئێمەش کەوتینە کار سەرەتا بۆ بەدەستهێنانی پشتگیریو هاوکاری بەمەبەستی چاپکردنی دیوانەکە، یادداشتێکمان بۆ سەرۆکایەتی زانکۆی کۆیە نووسیو ئەم خواستەو داواکارییەمان تێدا خستە ڕوو. ئەنجا هەڵوێستی جوامێرانەو بە دەنگەوە هاتنی سەرۆکایەتی زانکۆو بە تایبەتیش یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ (د. جەواد فەقێ عەلی چۆم حەیدەری) کە ڕاستەو ڕاست داواکەی پەسند کردینو هەموو هاوکارییەکی پێویستی زانکۆی بۆمان خستە ڕوو، وای کرد کە زیاتر سوورو ڕژد بین لەسەر ئەنجامدانی پرۆژەکە. هاتین سەر لەبەری دیوانەکەمان بەسەرکردەوە، هەڵەی ڕێنووسو کەمو کەسەرییەکانیمان ڕێكو ڕاست کردەوەو دامان بە چاپخانە تاوەکو نەخشەسازی کۆتایی بۆ ئەنجام بدرێتو دوابەدوای پێداچوونەوەیەکی کۆتایی دیوانی ڕاجی ڕۆشنایی چاپو بڵاوکردنەوە، لە دوای پەنجا ساڵ لە نیازو خەباتو هەوڵو تێکۆشان،

ببینێت.

ئەمە بوو چیرۆكو چارەنووسی دیوانی شاعیرێکی کورد. ئێستا لە جێگای خۆیەتی بپرسین: ئاخۆ چیرۆکی ئەم دیوانە چەند لە چیرۆکی خاوەنەکەی‌و مێژووی میللەتەکەی دەکات؟؟.

لە دواییدا هیواداریین بەم کارەمان توانیبێتمان خزمەتێکی بچووك پێشکەش بە دنیای شیعرو ئەدەبیاتو کتێبخانەی کوردی بکەین‌و گیانی بەرزە فڕی (ڕاجی) مەزن شاعیرو مرۆڤی کوردیش لە گۆڕەکەیدا ئاسوودە بکەین.

**عوسمان دەشتی**

**هەولێر ٢١/٤/٢٠١١**

**ڕابەری سەرچاوە بۆ ئەو باس‌و وتارانەی**

**تاوەکو ئەمڕۆ لە بارەی (ڕاجی)یەوە نووسراون‌و بڵاوکراونەتەوە:**

(١) گەڕانێك بە دیوانی شاعیری گەورەدا: ڕاجی، عەبدولڕەزاق بیمار، گۆڤاری (برایەتی)، ژمارە (٨)، بەغدا، ١٩٧٠.

(٢) ڕاجی و دوو هۆزان، نورەددین سەعید، گۆڤاری (بەیان)، ژمارە (١١٨)، بەغدا، ١٩٨٦.

(٣) مەلا ڕاجی، عەبدوڵڵا دارتاش، گۆڤاری (بەیان)، ژمارە (١٢٨)، بەغدا، ١٩٨٧.

(٤) دوو پارچە شیعری مەلا ڕاجی، محەمەد داریاس ڕۆژنامەی (دەنگی میللەت)، ژمارە (١٥٢)، ٢٠٠٤.

(٥) ڕاجی، لە ناوجەرگەی جەنگی نێوان گومان‌و باوەڕدا، ئیسماعیل ڕاجی، لێکۆڵینەوە، ڕانیە، ٢٠٠٤/٩/٢٠

(٦) کۆیە لە ڕەوتی شارستانییەتیدا، کەریم شارەزاو چەند نووسەرێك، بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆژنامەنووسی‌و چاپ‌و بڵاوکردنەوە. هەولێر، ٢٠٠٩.

(٧) گومان‌و مەستی لە شیعرەکانی خەییام‌و ڕاجی دا، عومەر حاجی برایم، باسی دەرچوون، بەشی کوردی. زانکۆی کۆیە. ٢٠١٠.

(٨) لێکۆڵینەوەیەکی شیکاری لە شیعرە کوردییەکانی (ڕاجی) دا، کانیاو عوسمان مستەفا، نامەی زانکۆیی، بەشی کوردی، کۆلێجی پەروەردە، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ٢٠١٠.

# پێشەکی

من کە عەبدورڕەحمان ڕاجی کوڕی مەلا ئیبراهیمم لە تیرەی میکایەلی هۆزی جافی شارەزووریم، بە هەموو سوپاس‌و دڵسۆزییەکەوە ئەوەندەی پێویستی شانی خزاوو جەرگی هەڵکزاوو هەناوی سووتاومان بێت، لە بابەت دڵداری‌و نیشتمانپەرستی، سەربەستیی بیر، ئازادیی مێرو سوودو قازانجی ئەبیات، بەرزی‌و شکۆمەندی، پێرەوی زانایان، خەسارەتمەندی ئارێکی، لێکدانەوەی ئەملاولا، سوپاسی سەروەران، دەستگوشینی قەلەمندەران، وریایی لەتالان، خۆپاراستن لەمالان، تەگبیرکردن‌و جاسووسی، گوێ گرتن‌و سالووسی، وتاری بەمانا، تێگەیشتن‌و تەوانا، وە هەرچی پێویستی خاکی وەتەن بێت پێشکەشی گەنجە سالارەکان‌و لاوە ناودارەکان‌و کچە هۆشیارو نازدارەکانی دەکەم. بەتایبەتی بۆ هەموو گیاندارو دارو بەردو واری کوردستانی کۆنە ولات‌و نوێ هەوار، هەتیوی بێ باوک‌و دایک‌و بێ کەس، بەشکو بە پارووە نان‌و ناوێکی زانین ببووژێتەوەو بەدەستەچیلێکی هۆنین خۆی بدۆزێتەوە. چیکە کوێستانی لەبەر هەتاوا سەر سپی نەکا .. چیکە گەرمێنی لەناو درک‌و داڵ بێ بەتی نەکا. بەڵام زۆر تکا لە لاوە کوڕو کچە خوێندەوارو سەربەستەکان دەکەم بە چاوی پەسەندانەوە و دڵی ئەرجومەندانە تەماشای ئەم دیاریە نادیارەمان بفەرموون‌و، لەهەر کەموکورتی‌و لەسەرچوونێکمان ببوورن‌و، هەرچۆنێکی بەباش دەزانن لە تەرازووی بەرانبەری خۆیاندا هەڵی بکێشن. ئیدی خوا هاوکاریمان بکا.

سوپاس بۆ پیرە نیشتمانییەکان.. سوپاس بۆ گەنج‌و لاوە کوردستانییەکان.. سوپاس بۆ هەمشیرە نازدارو سەربەست‌و ناوانییەکان.

ڕاجی

هەڵگری ئاواتی کوردستان

(١٩٥٩)

## ڕاجی لە ژیانی دوای مەرگیدا

مەسعود محەمەد

بەغدا: ١٩٨٤/١/٣٠

مەکانە شـەوقی بە عێلاتە، پەشمە کۆنە هەوار
حەیاتـە زەوقـی بـە نەحبابـە، بایە ئاب‌و هەوا

ڕەحمەت لەگۆڕت، ئافەرین لە یادت ئەی ئاخێوەر بە زمانی غەیب: حاجی قادر!

بـە مـن چی گـوڵزاری بـێ بولبـول! بـە تـۆ چـی بـاغی بـێ قـومری! بـەجیهان چـی مەیکەدەی بێ کۆڕی دڵداران!!

تۆپەڵە بەڵەکی زەوی لـە چـەرخ‌و فەلـەکی بـێ دۆلاب‌و مەنگەنـە دەنیـشێت‌و، دانـە تەزبێحی نیوە ڕەش نیوە سپیی شەوو ڕۆژان لە گشتەکی نەبـەد قـەتار دەکات‌و کۆرپـە هـەرە زرینـگ‌و زیـت‌و نرخـدارو بایەخدارەکەی، مـرۆڤ، لـە کـۆش‌و باوەشـی پـڕ گـەڵاو چـڵ.. پـڕ گـوڵ‌و دڕوو هـەڵگێڕو وەرگێـڕ دەکـات‌و، بەهـەزاران بـاری فرەچەشـنی خۆشـی‌و ناخۆشـی.. هێمنی‌و بێ ئۆقرەیی.. هەستیاری‌و بێ هەستی.. گومان‌و یەقین.. ڕق‌و ئـەڤین، بەژێر بـارانی فرمێسک‌و تریفەی بزەدا، جۆلانە ئاسایی دەهێنێت‌و دەبات، هەر لەو دەمەدا بـە مەلۆتکە لـە هەناوی عەدەمەوە بەر دەبێتەوە تا ئەو دەمەی بە کفنەوە بەرێ دەکرێ بـۆ هـەناوی عـەدەم؛ دەست بەتاڵ، مازوو جنی کون لـە پاشـۆڵ، نـە تووشـەیێکی ڕێـی بـێ بڕانـەوە بـە کۆڵەوە، نـە فلسێکی گەنجی داخـراو لەگیرفانـدا.. دەبێتـە خـەیاڵ بەسـەر پـەردەی خوولیـای خەڵقـەوە.. شـەبەنگێکی یادگـار لـە دەروونـی بەجێماوانـدا، تـەنها بـۆ ماوەیـەکی کورتیلـە.. لـەوە بـەولاوە سـپیپات دەبێتـەوە وەك تیـشکی جلوە نەبەسـتووی نـاو بۆشـایی، خـەون‌و وڕێنـەی نووسـتن‌و لـەرزوتا.. تـۆ بڵێ هـەر هـیچ.. زەمـان حـاڵی چۆلایی پـێش مـەرگی لـە زڕە تارماییەکـەی دەم دادەپچڕێت‌و دەمرێنێ:

بنـواڕە بوونـی ئەووەڵت‌و چوونـی ئاخیـرت
هاتی چ ڕووت‌و قووت‌و، هەڵاتی چ لووس‌و پووس

کێلی قەبرەکەی؟ لەوانەیە ناوی لـێ هەڵنەکەنـدرابێ! هـەڵیش کەنـدرابێ چـی: بـاران دەیسڕێتەوە، ئەویش ئەگەر قەبری بەکێلی هەبێ!

کوڕو وەچەی؟ کێ دەڵێ لە ڕێبازێکی پشت لەڕێبازی ئەوەوە ناڕۆن؟

ماڵەکەی؟ ڕەنگە لە شوێن بەرماڵەکەی عەرەق بخورێتەوە، یان بە عەکسەوە..

داهاتەکەی؟ بەهەمموو ئومێدو ئاواتییەوە، بارتەقای لەشە عەنبار پۆیەکەی ناو قەبری، ڕزایەوە، بڕایەوە..

ژینێکی کە مردنی لەدوو بێ چ نییە
باغێکی بەقونجرەو دڕووبێ چ نییە

ملیۆنەها، ملیارەها ئاپۆرەی بنیادەمی بێ ناوونیشان، بێ شوێنەوار، بێ ئاستەوار، دەورو تەسلیمی پەلەکوتەکەی پێنج و دوو ڕۆژی ژیانی کولەمەرگیی لەگەڵ فریشتەی مەرگ، یان لەگەڵ هیچدا کرد، بەچاڵی نەبووندا سەرەنگرێی بڕانەوە بوو، وەك نەخشی سەر ئاو.. ترووکەی چاو سڕایەوەو کوژایەوە مەگەر بەخێرو سەدەقە فەیلەسووفان لە ژێر سەرەناوی ساردو سڕی (سەربازی نەناسراو)دا بۆ ئیسپاتی دەسەڕەنگینیو دڵسۆزیی سیاسەتبازانەی خۆیان، شرە ترنجۆکێکی پوایەوە قەڵەمچن بکەن بە دروشمی (مێژووی گەلان....) کە خۆیان لەژێر سایەیدا دەحەسێنەوە نەك گیانی هاوڕێیە نەناسراوە بە قەنارەدا کراوەکانی سپارتاکۆس!!. هەر بڕۆ سەربازی نەناسراو، تەپە لەبنی چاڵی بزربوون و نەبوون هەڵستێنە.. زەردایی شەرمەزاری لەڕەنگی بزرکاوتەوە بەسەر ڕووی بوونەوەری مێژوودا بهێنە.. ئەگەر بۆت بلوێ - کە نالوێ - لێی مەسەلێنە گویا؛ ڕەحمەت بۆ مردووان.. فاتیحە بۆ گیانی کۆچ کردووان! یەق کەرەوەی ناوی سڕاوەو گۆڕی نراوەتە.. کوا دەنگت ئەم زریکەیەت بگەیەنێتە بەر گوێی بیسەران؟ کوا ڕەنگت؟ نە دەنگ نە ڕەنگ، نە سەنگ.. تۆ نەهەنگ نەبوویت گردۆڵکەی پشتی پۆزت زگی دەریای مێژووت بۆ بقەڵاشێتەوە.. تۆ هەنگ بوویت، شیرناییت بەسەر لێوی سیاسەتمەدارانەوە مڵچ و هۆڕی؛ (هەر بژیو نەمری) دەداتە بەر گوێی ئەو ملیارەهایەی سەر لەنوێ: نە دەنگێك.. نە ڕەنگێك .. نە سەنگێك...!!

خەسارەتمەندی دەست بەتاڵ لەماڵی دنیا!
ڕەنجەڕۆی بێ بەش لە ناوونیشان!
خۆراکی هیچایەتی! خۆت.
لە ژین بەدەر .. هەی مێوانی پوانەوە!
بۆرە پیاو!!!

..................

لەگەشتی ڕووەو عەدەم، بە پاش ماوەی ئەم دیوی قەبر، چی بێ مەرگ بۆ مرۆ دەمێنێتەوە: بزەیەکی سەر لێوان، ترووسکەیەکی فکر، جۆشێکی دەروون - ئەگەر لێی بەجێ مابێ - بەمیرات بۆ ئەوانەی بەدوا ئەودا لە مەیدانی نێوان دوو عەدەمدا مەقەسە دەکەن..

نەسرانەوەو لەبیرنەکران‌و بەردەوام بوون سەرمایەی جاویدانە لەکۆڵەباری هەموو ڕێبوارێکدا دەست ناکەوێ: خوا پێ داوەکان لە خەوتنیشدا باڵایان کەڵەگەتر دەبێ.. خەڵق‌و خوا بۆیان بەسەرەوە دەنێن. ڕەش‌و ڕووت، هیچ نەدار، بێ دەسمایە، جگە نییە پێی بچێتە جگێنە لە قومرغانەی مێژوو: دەبێ جگ و دەسکەلا لە مەهارەت.. لە هونەر.. لە مەعلانی.. لە دەسڕەنگینی بسازێنێ دەنا پێی دەڵێن‌و دەریشی دەکەن:

( سر زده داخل مشو میکده حمام نیست)

گوناهی هەرە گەورەی (عەبدوڕڕەحمانی ڕاجی)، بێ جگ‌و دەسکەلایی.. بێ مووشەیی.. بێ تووشەیی بوو: گوناهی نەبەدی.. بەدرێژایی عومر.. لە هەموو هەوارێکی. لێی باخەبەرم.. زارەوزار بیستوومە.. بەچاو دیتوومە.

نانێکی بێ منەت‌و لانێکی بە بنەمای هەبوایە حاڵی لەبارێکی دیکەدا دەبوو.

ئەگەر لیستەیەك بگێڕێتەوە بۆ دارایی! و سامانێکی بەمیرات پێی گەیشت.. ئەگەری بۆچییە؟ ئەمەتە لیستە!

١- لەپارەو پوول: هیچ.

٢- لە مڵك‌و خانوو: بەولای هیچەوە.

٣- لە وەزیفەو داهاتی مسۆگەر: توون.. چش.

نامزەدێکی زەق‌و ڕەق‌و تەقی ئامادە بۆ چاڵی فەرامۆشیدا چوون..

لەبەر خۆمەوە دەڵێم: ئەگەر بەو تەبیاتەو خەسڵەتەی پێوەی ڕسکاوم چووبامایە کلێشەی باری ژیانی ڕاجییەوە، ناوونیشانێکم لێ بەجێ دەما؟ دەستم قەڵەمی دەگرت؟

ڕاجی، بەگژ هیچایەتی‌و بۆشایەتی ژیانی مادی خۆیدا، سەرەو ژوور لە خورگە مەلەی کرد.. دڵی بەهێزو مێشکی تریسکەدارو زمانی پاراوی لە شەرگەی گوزەراندا بەگەڕ هێنا: وەك دامەزانی مەعلان گەرەوی ناسراوی لە هەژاری‌و نەداری بردەوە بەرێز لێ گیراوی.. بە خۆشەویستی.. بە هەستیاری.. بە شاعیری.. بەچاوی خەڵق لە ڕێیەوە بوون.. بە ڕۆشندڵی. دەشتی کاکی بەکاکیی ژیانە موفلیسەکەی کردە مەزرای زەکای زگماك‌و هۆشی بە برشت‌و ڕوح سووکی‌و قسە شیرنی، وێڕای باخەبەری‌و هۆشیاری‌و ئازایی‌و ئازادی.

ڕاجی، لەبنی بیری دەست بەتاڵییەوە بە پێپلکەی لێهاتوویی فیتری خۆیدا سەرەو ژوور چوو، وەك منارەی چرا بەسەرەوە، لە دوورەوە بوو بە پەنجەنیشان.

پێوەندیم بە ڕاجییەوە بەردەوام‌و نەپساو بوو: تا ئەوەندەی لە کۆیەو دەوروبەری بووبێ‌و هەڵکەوت یارمەتی دابێ تام‌و شامم لە ڕەفاقەتی چێشتووە. چەندین دەیەها جارو بار، شەوانە لە دانیشتنی فەقێیانەی پاش تەراویح‌و سەرەتای دەهۆڵی پارشێوی ڕەمەزان،

هەر شەوە لە مزگەوتێك، بەزۆریش لە مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەدی جەلی، تەمبوورەمان دەبەست.. بێنە باسووغ‌و کاکڵە گوێز.. حەلقووم‌و حاجی بادام.. چەرەزی تێکەڵ پێکەڵ.. جگەرەی بێ شەما.. سەماوەریش گیزەی دێت‌و تێکەڵ بە تریقوهۆڕی بێ خەم‌و خەیاڵ دەبێت: هەر کەسێکی هونەری لایەق بەو مەجلیسەی هەبوایە پێشکەشی دەکرد. سینی‌و زەرف‌و کارەمستێنە (حەلواو شەکراتی پێوە بوو)، فەنەی بێ دەنگ، قەساب‌و گۆشت بەشینەوە، هێلکە بە بۆنێ، کوورەی ئاسنگر، شارە هەنگ بڕینەوە، ئاشەوان‌و جۆگە هەڵبەستنەوە، زرم‌و هۆڕی گەمەی جەردەو قافلە، (ئێمەنی وەرە)و چەپلەڕێزانی هەی کەر هەی کەر بۆ ئەشارەزایەکان، گەنم گەنمێنە.. و چەندین فەندو فێڵی فۆلکلۆری کۆنینە کە فەقێیان لەگەشتی خوێندن بە هەموو کوردستاندا فێریان دەبوون‌و شارەو شار لەگەڵ خۆیاندا دەیانگێڕا لەو مەجلیسانەدا هەر شەوە بۆ ماوەی ٦ - ٧ سەعات دنیایەکی گەش زەنوێڵی هەڵ دەنا. لەو ناوەدا ڕاجی، بەڕاستی، پێشەوای هەموان بوو چونکە لە هەموو گەمەکان شارەزا بوو، چەند گەمەیەکیش هەبوون هەر ئەو دەیزانین، فێربوونیشیان زەحمەت بوو چونکە دەم‌و ئارداوێژی تایبەتییان گەرەك بوو. وتووێژی ناو گەمەکان بەهەر لەهجەیەك بوایە، بۆ زاری ڕاجی وەك بۆ زاری ئاخێوەری لەهجەکە وەها بوو بەتام‌و لەزەتێکی تازەوە. کۆییانە، بلْباسانە، مەنگوڕانە، جافانە، دۆمانە، جوولەکانە، خۆشناوانە.. ئیدی بڵێم چی، بەهەموو بارێك زمانی دەگێڕاو خەڵقی پێ دەخستە سەر گازەرای پشت.. ناو ناوە وەردەگەڕایە بەیتی شێوە بەردەشانی، یان لە میانەدا چەند بەیتێکی شایی‌و هەڵپەڕکێی بە دەم گەمەوە وەکوو شاباش هەڵدەدا بەسەر مەجلیسدا.. لەو تەرزە دانیشتنانەو بەزم‌و ئاهەنگی ئیجازەی مەلای موستەعیدا هەنبانەی فەندەکانی بەتاڵ نەدەبوو. بە ڕاستی خوێی چێشت‌و نەوتی چرا بوو. دەزانن لەیاری بەهارانەی سێ باز چی دەکرد؟ لەشی وەکوو ڕۆحی سووك بوو بەڵام هێندەی بەعزێکان قاچ داقڵیشاو نەبوو بۆ بازی درێژ مەودا ببڕێ. دوایین جار کە لێ دەکشایەوەو خۆی تێ دەکرد لەبازی سێیەمدا، دەهات بە حەواوە لەشی خۆی وەکوو بڕکەدار یان جلیت تووڕ هەڵدەداشت، کاتێك کە وەك دارەمەیت دەکەوتە سەر زەوی هەردوو پێی لە شوێن پێی خەڵقەکە تێپەڕی دەکرد، سەریشی مەترو نیوێك بەدواوە بوو. دەیگوت: سێ بازەو پێ دەیباتەوە نەك سەر..

ڕاجی مەلاو شاعیرو نوکتەبازو سوحبەتچی‌و فرە پیشە بوو: هەرچەند ئەهلی خوێندن لەکۆنەوە بە شۆرەتی شێخایەتی‌و مەلایەتی‌و شاعیری ناوی هەڵدەدرا، دوای مەرگیش ئەو چەند دێڕە نووسراوەی لێی بەجێ دەما بۆی دەبووە شەهادەی جنسییەو دەفتەری نفووس، بەڵام لە ژیانی واقیعیدا، مەلایەتی‌و شاعیری‌و شێخایەتی هەر لەدەمی

دەرس‌و دەور وەیا زیکرو فیکر وەیا شیعر خوێندنـەوەدا بـۆ خاوەنەکەی دەبـووە ناوهێنـەرو بیرخەرەوە: بەشی هەرە زۆری عـومر بـەهۆی لەگـەڵ خەڵقـدا گونجان‌و سازان‌و گوزەرانـدن دەبێتە تۆماری پەسـەندایەتی یـان ناپەسـەندایەتی مـرۆڤ چ شـاعیر بـێ چ مـەلا بـێ چ شـێخ. ئـەو بەشـەی کـە بـەر نووسـین‌و تۆمـارکردن ناکـەوێ‌و لـە سـەدی نـەوەدی عـومری مـرۆڤ دەگرێتـەوە، ئـەویان حەقیقـەتی کەسـایەتی‌و ئاکـاری تـاك دەنوێنـێ: ڕاجـی لـەم نۆبەشـەی عومردا، کە بەعادەت لەگەڵ بەسەرچوونی دەسڕێتەوە، مرۆڤایـەتی خـۆی بـەکاردەهێنا، هـەر سامانێکی مەعنەویـشی هـەبووبێ لەخزمـەتی ئـەو نۆبەشـە تۆمـار نـەکراوەی خـەرج دەکـرد. ناڵێم ڕاجی فریشتە بـوو، دەڵـێم بابایـەك بـوو: مـەلای ڕوح سـووك، شـاعیری دۆسـت پـەروەر، نوکتەبازی خزمەتگوزار، شایەری کۆڕی بـرادەران، سوحبەتـچی بـەوەفا.. کابرایـەك بـوو حـەز بە ڕەفاقەتی بکەیت‌و چاوت لە ڕێی بێ. بە بیرمدا نایەت ڕاجی دوعاخوازی کـردبێت‌و چـاوم لـە دووی نـەبووبێ.. جارێکیـان لـە مزگـەوتی حـەتك ڕووی پرسـیاری کـردە مـەلا محەمـەدی مەلا برایم (دلاوەر- بە ئەسڵ دڵ ئەخگەر بوو) و گوتی:

ئەرێ ئەگەر مەسەلەیەك وەهاو وەها بێ چۆنی هەڵدەبڕیتەوە؟

لە وەڵامدا گوتی: بە پێی شەرع حوکمی مەسەلەکە وەهاو وەهایە..

ڕاجی پێی گوتەوە: بە شەرع نا، نا ..

مەلا محەمەد گوتی: ئەدی بەچی؟

ڕاجـی گـوتی: بـە هـەق بـە هـەق.. ئەمـەی گـوت، خـۆی‌و خەڵقەکەش زۆر پێکەنین، ملیشی بۆ شەرعەکە ڕاکێشا.

لێرەدا دەبێ بڵێم، ڕاجی لەنزیکەوە دۆستی مەلا محەمـەدی مـەلا بـرایم بـوو، ناشـزانم لەلایـەن بۆچـوونی دینـی‌و مەزهەبییـەوە چۆناوچـۆنی بـوون. مـەلا محەمـەد لەمەسـەلەی ماڵێکی ڕیبای تێدابێ، بانکەنۆتی بەماڵی ڕیبـادار حیـساب نـەدەکردو قازانجەکـەی بـە حـەڵاڵ دەزانی. ئەمە دەڵێم بە یەقین چونکە لـە خـۆیم بیـستووە. هـەتا سـاڵی ١٩٥٨ بـەهێمان زێـدە خـۆش بـوو، لەهـەموو بابەتێکـەوە لەگەڵمـدا کـراوە بـوو. ڕاسـتییەکەی یـەکێکیش بـوو لـە قوتابییـە هـەرە زیرەکـەکانی بـاوکم. خـوا لێـی خۆشـبێ‌و سـەد جـاریش گـەردەنی ئـازاد بـێ لەهەر گلەییەکی کەوتبێتە بەینەوە.

ڕاجی، مامەڵەی لەگەڵ ژیان‌و کۆمەڵدا بەلای گونجانێکی ڕێـز لـە خۆگرتـوودا بـوو: تـا بیتوانیبایە، بە سینەفەراحی‌و لێ بووردن‌و دڵدانـەوەو فریاکـەوتن، لـە پێوەنـدی بەخەڵقـەوە گەشـایی ڕوخـسارو بـزەی لێـوانی دەپاراست. ڕۆژێـك لـە ڕۆژان‌و جارێـك لـەجاران نەمـدیت شتێك بڵێ کـە دەبـوو نـەیڵێ، وە یـا شـتێك بکـا کـە دەبـوو نـەیکات. هەرچـەند لـە جـەواب

دانـەدەماو نـازاش بـوو، هـەرگیز سـنووری ڕێـزی ئاخـاوتنی نەدەبەزانـد. دیتوومـە لـە دەمەتەقـەدا گـەرم بووە، بـەڵام چـەند جاری پێداویستی جەوابـە جـەنگی زۆری لـێ کردبـێ خـۆی سـاردکردۆتەوەو تیـژاوی وەڵامەکـەی لـە لۆکـەو ئاوریـشمی نوکتـە وەیـا تـەعبیری حورمەتکار وەرپێچاوە. بـەینێك لـەخانووی مـامم، شـێخ نـوری، کـە بانـەوبان دراوسـێی مـاڵی باوکمە، شوورەش لەنێوان بانەکاندا نەبوو، ڕاجیو خێزانی بەسەریان بـرد. ئەوسـا ڕاجـی بـێ منـداڵ بـوو: لـەو هـەموو دەمانـەدا کـە دراوسـێ بـووین ئەوەنـدە دەنگـی بـەرز نـەدەکردەوە بزانین لەماڵەوەیە یان جارێ نەهاتۆتەوە. ئاونـاوە کـە خامۆشـییان بـێ تەقـەو ڕەقـە درێـژەی دەکێشا، لەسەربانەوە سەرەتاتکەیەکم لێ دەکرد. جارێکیان لێی بەدەنگ هاتم گوتم:

ئەرێ ئێوە ماون یان خوانەخواستە چوونەتە بەهەشت؟

گوتی: خوانەخواستەم بۆ جەهەننەم لێ بکێشە..

بـەعادەت شـاعیر فەرهـەنگی وشـانی تێـرو تەسـەلە. هەرچـی ڕاجـی بـوو بـەهۆی شایەریـشەوە لـە وشـە دەوڵەمەنـد بـوو، سـەرەڕای وشـە جۆرەهـا تـەعبیری کوردی لەگەشـتی فەقێیەتی هەڵگرتبۆوە کە شاعیری شارنشین ڕێی پێ نابا. سەیری قافیـەی هێنـدێ لـە پارچـە هەڵبەستەکانی بکەیتو پاشخانەکەی تێدا بخوێنیتـەوە بـەلای کەمـەوە دوو شادەماری تێدا دیاری دەکەیت: یـەکیان، گەشتو گـەڕانی هـەراوو بـەردەوام. ئـەوی دیکەیان تەنگژەی بـاری ژیـان کـە بـەدوا قافیـەی سـەختو دەگمەنیـدا گێـڕاوە. کورد دەڵێ: شـەڕو نیـوە شـەڕ هـەر یەکێکـە، ڕاجیش هێناویـەتی نیـوە شـەڕی قافیـەی کـەم بیـستراوی خـستۆتە سـەر شـەڕی گوزەران، بە زۆریش تێیدا سەرکەوتووە.. لەم تەرزە هەڵوەستەدا، ئەگەر ڕاست بـێ بگوترێ: گەڕان بەدوا وشەدا دوور کەوتنەوەیە لە سۆزو نـاوەڕۆك، دەبـێ قبوڵیش بکەین کەوا گەڕان بەدوا قافیەی سەختو دەگمـەن لـە ژیـانێکی سـەختو ئاستەنگدا وەك سۆراغ کردنـی پـەناو نوایە لە گەرمەی شەڕدا: هەمووی هەر لە چارچێوەی یەك نەخشە دایە.

نامەوێ ئەو تەرزە تێبینییە بەدرێژەوە بۆ لای ئرخاندنی دیوانەکەی، چونکە لێرەدا ئرخاندن مەبەست نییە: دەمەوێ دەربوونەیەك دەربکەم بـۆ نـاو دەروونو کەسایەتی ڕاجی (مرۆڤ - شاعیر) لەگەڵ ئەوەندە تیشکەی پێویست بـێ بـۆ ڕوون کردنـەوەی شـوێن هـەنگاوی کەسێکی تازە بەتازە دەبێتە مشەختی جیهانی (ڕاجی نامە).

لەم کورتە پێشکەش کردنەدا بە تەما نەبووەو نیم شیعری ڕاجی بەخوێنـەری کـورد بناسـێنم، هـەر نـەبێ لەبـەر ئـەوەی کـە خوێنـەریش وەکـوو مـن شیعرەکان دەخوێنێتـەوەو تێیان دەگات، ئاسانیو ڕەوانیشیان لەوەیان بەدەردەبا پێویـستیان بـە شـیکردنەوەی وردو واتا لێکدانەوەی بین درێژ هەبێ، ئەو بەشە عەرەبییەی نـەبێ کـەوا ڕەنگـە هـەموو کوردێـك تێی

نەگات، بەڵام ڕاستییەکەی، هەڵبەستە عەرەبییەکان لەسەر ئەدەبو شاعیریەتی ڕاجی حیساب ناکەم: شاعیری کورد ئەگەر لەڕێی خوێندنو خوێندنەوەوە لەگەڵ شیعری عەرەبیدا ناسیاوی پەیدا کردبێ، بێ ئەوەی لەگەڵ عەرەبدا ژیابێ، ناتوانێ بە عەرەبی بهۆنێتەوە چونکە خەیاڵو شێوازو بۆچوونو دارشتنو ئارایشت و هەرچی لایەنی هونەریو ناوەرۆکیش هەیە لە عەرەبیدا تایبەتن بە زمانو توراسی عەرەب، تەنانەت شیعری بەشێك لە شاعیرانی عەرەبی دوای سەردەمی ئەمەویەکانیش کە تێکەڵاوییان لەگەڵ سەقافەتی غەیری عەرەبدا ڕەنگی دایەوە ویژدانیان بەوەدا عەیبدار بوو کە لە دەرەوەی هەستو پێزانینی عەرەبییەوە وێنەو خوولیاو دارشتنی خواستۆتەوە. بە جگە لە (مەلا عەبدوڵڵای بێتووشی)و (جەمیل صدقی زەهاوی) ئەمبیست شاعیرێکی کورد زمان لەهەڵبەستی عەرەبیدا شان بەشانی شوعەرای عەرەب ڕۆیشتبێ، دیارە ئەو دوو شاعیرەش بەهۆی ژیانیان لە وڵاتی عەرەبدا هەستی شاعیرییان بە چەژی عەرەبی زاخاو دراوە. دەڵێن ئاغایەکی میراودەلی لەدیوەخانەکەیەوە دیتی کابرایەك بەڕێگادا دەڕوا، گوتی: دابزانن ئەو پیادەیە چ کارەیە؟. نۆکەرێك بانگی ڕاهێشتێ، پیادەکەش لەوەڵامدا گوتی: بەرێ!! ئاغاکە ڕووی لە ڕێگە وەرسووڕاندو گوتی: لێی گەرێن کۆیی یە. شاعیری کوردیش کە ڕادەسێتە شیعری عەرەبی بەتایبەتی کە خوێندنی مزگەوتی تەواو کردبێ، بەحاڵ لە ڕایەڵی دەستووراتی قەواعیدی عەرەبی شرە دەفرێکی بۆ ساز دەدرێو بە شرو شیتاڵی کوردی دەیئاخنێ. با دوور نەڕۆین: وەها دەبێ شاعیرێکی کوردی دەرەوەی ناوچەی سلێمانی زۆر لە خۆی دەکاتو سلێمانیانە دادەبڕێ، زۆر ئابات دەکەوێتە کۆسپو ناستەنگانو لاسایی کردنەوەی پێوە دیار دەبێ. تا ڕادەیەك، جاران، شاعیری کوردی عیراق دەیتوانی بە فارسی بهۆنێتەوە هەم لەبەر خزمایەتی نێوان هەردوو زمانو هەم لەبەر زێدە خەریك بوونی ڕۆشنبیری ئەوسای کورد بە زمانو ئەدەبی فارسییەوە. خولاسە من شیعری عەرەبی شاعیری کورد دیوان بەدەر دەکەم.

بێ ئەوەی دەست بەرم بۆ دیوانی ڕاجی، هەر لەشێوەی تێبینی گشتییەوە دەتوانم ڕێ بەخۆم بدەمو بڵێمو لە شیعرەکانرا دیارە دوو شادەماری ئەستوور پێوەندی ڕاجی بە جیهانی خوولیاوە، بەڵکو بە جیهانەوە قووڵ دادەگرن: یەکیان خواپەرستییە، ئەوی دیکەش کوردایەتییە.

لەلایەن خواپەرستییەوە، وەك من لە ڕاجی گەیشتبێتم، بە درێژایی ئەو ڕۆژگارانەی لێیەوە نزیك بووم خرتەو ورتەی گومان لە بنی دڵیەوە مێرووڵەی دەکرد، بەڵام هەر جارە زوو بە زوو سەرقاپێکی خەفەکەری باوەڕو متمانەی بەسەر جۆشو بڵقی دەروونیدا

دەهێناو نەفەس بڕی دەکرد. بەشی هەرە زۆری شیعرە ئاینیەکانی، بەپێی باوەڕی من، شەڕی نێوان گومانو یەقین پێی هەڵدەبەستن هەر هەتا یەقین بەسەر گوماندا زاڵ بکات. ڕاجی مرۆڤێکی دڵ تەڕی، جیهان پەسەندی، ژیان دۆستی، لەزەت بردووی، سوحبەتچی، یارانەی مەشرەب بەهاری بوو لەوەشدا بە پێچەوانەی داخوازی باری دەست کورتیو قیافەتی مزگەوتی هەمیشەکات خەریکی ڕاست ڕاگرتنی موعادەلەیەك بوو کە ئەمسەرەو سەری تێکیان نەدەکردەوەو یەکتییان نەدەخوێندەوە کوتومت وەك (خەییام) دەڵێ :

مایيم در اين گنبده شعبده فام

نه كافر مطلق، نه مسلمان تمام

ڕاجیش لەلایێکەوە بە کەللەی پڕ هەستو خوستی (تەفسیرو حەدیسو کەلامو اصولو صرف و نحو...)وە، لە لایەکی دیکەشەوە بە دڵو دەروونی تەلەزگە بەستووی سەر بەستەڵەکی فەلسەفەو مەلەکردووی گۆمی لەزەتو حەزی سروشت، بە داروەگازی شیعرە ئاینیەکانی کوتەکوتی بەرەو لایەنی کردگاری پەروەردگارەوە دەکرد. هەرچەندە لە ساڵانی دوایی ژیانیدا ئەوەندەم نەدیت بزانم کەشتی گەشتەوەرانەی نێو دەریای گومانو یەقین بە کام بەندەرەوەی قەدەم کرد، بەڵام بە پێی دیوانەکەی وەها دەردەکەوێ تادوایین هەناسەی جنگی لە خواپەرستی قەییم کردووەو نەیهێشتووە گومان لێی بە مەبەست بگات. ئەگەر زەللەی گەورەی فیکریم نەکردبێ، ڕاجی، لە دەمی گیانەلاوەدا باوەشی بە تارمایی فریشتە قەتیس وەستاوەکانی سەر پەردەی تەصەوراتی دا کردووە.

ئەم شەڕەی نێوان گومانو یەقین بۆ کەسێك لە ڕاجی شارەزا بێ، لە سەرانسەری دیوانەکەی بە شێوەی هێزەکی، (وجود بالقوة، ***Potential***) جلوە دەبەستێ. بەڵام لە پێنج خشتەکییەکەی: (ئەی خوا لەم ماوە داماوم بە پاوە یا نەجات)دا زریکە لە گیانی ڕاجی هەڵدەستێو یەك تاقگە لە خڵتەی چەندین ساڵەی نائارامیو ناڕەزامەندیو بێ ئۆقرەییو دڵەکوتکەو لێوەلەرزە، بوو بە گلەییو گازاندەو پاڕانەوە لە بارەگای دادی خوداوەندی. ڕاجی لەو پێنج خشتەکییەدا ڕازی پێیەکی لە باریکە ڕێی خەییامو پێیەکیشی لە دەربوونەی مزگەوتەکانە. ئەم ڕەوتەی ڕاجی لە تەنگەبەرەی نێوان دوو بەرداشی گومانو یەقیندا نموونەیەکی بچووکی تەجرەبە زلەکانی کۆنینەی بەر لە هەزار ساڵە کە بلیمەتی وەکوو (ئیبن سینا و ئیمام غەزالی) پێوە مەشوور بوون، تا ئەوەی (ئیبن سینا) بەر توهمەی ئەوتۆ کەوت ناچار بێ لەسەر ئیمانی خۆی بکاتەوەو بڵێ:

کفر چو منی گزافو آســان نبود
محکمتــر از ایــمان من ایـمان نبود
در دهر چو من یـکیو آن هم کافر
پس در همه دهر یك مسـلمان نبود

(غەزالی)یش چەندین کتێبی مەحکەمی ئەوتۆ لە جەنگی نەفسو شەیتانو گومان دابنێ بابی بردنەوەی گرەو لە فەلسەفەو لە ئیلحادی تێ ببێ. ڕاجی لە ڕێی وەدەرنانی هەستی دەروون بۆ بەر گوێو چاوی شیعرخوێنان کارێکی ڕاستگۆیانەی کردووە بۆی بە چاکەو پیاوەتی لەقەڵەم دەدرێ.

کوردایەتییەکەی ڕاجی، هەم لەبەر ئەوەی کە هەستی نەتەوایەتی وەك غەیب پەرستی نییە بە دوودڵیو گوماندا تێپەڕێت، هەم لەبەر ئەوەی ڕسکانی گیانی کوردایەتی لە ویژدانی ڕاجیدا لەو کاتانەدا بوو کەوا جارێ ڕاڕەوی نیشتمانپەروەری لە کوردەواریدا چ ڕێچکۆڵەی سەر بە فەلسەفەی چینایەتیو لکە زۆرو ئەژمارەکانی سەر بە کۆمەڵایەتیو مافە جوداکانی تیرێژە هەمەچەشنەکانی کۆمەڵ تێیان نەدەکردەوە، کوردایەتییەکی سافو سادەیە. شاعیری دیکە هەبوون هاوتەمەنی ڕاجی بوونو وەك ئەو بە کوردایەتی بێ گرێو قۆرت دەستیان دایە شیعری نیشتمانپەروەرانە، دواتر دەمودوویان گۆڕا، بەڵام لەبەر هەر هۆیەك بێ (کە ئێرە جێی دەست نیشان کردنی تێدا نابێتەوە) تینو تاوی هیچ فەلسەفەیەکی تازەو بەرەو ستانەوو لە کوردستاندا نەیتوانیوە شاڵاو بۆ دەروونە داڕێژراوە کوردپەروەرانە خواپەرستانەکەی ڕاجی بهێنێو ڕێ گۆڕکێی پێ بکات، بۆیە دەبینین ڕاجی نە لە ڕاستە شەقامی کوردایەتییە میراتییەکەی لاداوە، نەشێوزای عەرووزی کۆنینەشی بەلاوە ناوە: ئەبزی هەڵبەستەکانی ڕاجی درێژەی ئەو فرکەیە کە لە دەماری کوردایەتی بیستەکانەوە دەستی کرد بە هەڵاویشتنو ڕیشەشی دەچۆوە بۆ فەرمایشتەکانی حاجی قادر. ئەم خۆ لکاندنەی ڕاجی بە فیکرەی کوردایەتی بێ تەئویل بەوەدا پتر ڕوون دەبێتەوە کەوا لە نێوان ئەو باسو خواسانەی لەسەردەمی ڕاجیدا تازە بەتازە دەکەوتنە بەر گوێی کوردەواری تەنها بابەتی ڕووەو کوردایەتی ڕەنگی داوەتەوە لە شیعری ڕاجی. گەشترین نموونە لەو پارچە هەڵبەستە دڵدارییەدا دەردەکەوێ کە سەرەتاکەی بە:

(گوڵ پێ ئەکەنن، لالە ئەپشکوون لە چەمەندا) دەست پێ دەکاتو دواتر ئەم دوو بەیتەی تێدا دەدیترێن:

ئەو دارو گیای بەهرەوەری‌و بەرهەمی ڕاستی
زەردەشــتە کە چاندوویە لەناو خاك‌و وەتەندا
با هەڵ بێ لە ئاســـۆی هەوەســا ڕۆژی ڕوانت
ئاوابێ شــــەوی بەد، لە سەمای ئاری یو زەندا

لەسەردەمی (حاجی قادر)دا ناوی زەردەشت‌و زەندو ئاری ئەدەبیستران، کە پەیداش بوون نە لەشیعری سەر بە ئایین‌و نـە لـە شیعری سەر بە چین دەرنەکەوتن‌و نەشدەبوو دەربکەون، چونکە هەریەك لەوان کابەی خۆی هەیە رووی تێ دەنێ‌و دەستەو دوعا بۆی رادەوەستێ. هەرچی راجی یە چونکە خۆ تەرخان کردووی شیعری ئایینی نەبوو، بەرهەڵستیشی نەدیت لەمپەڕ بێ لە پێش کۆکردنەوەی ئایین‌و نیشتمان لەیەك دەفەردا، توانی لە هەردوو مەیداندا زمان بگێری تا ئەوەی لە پارچە هەڵبەستی (مێژووی پێغەمبەرایەتی‌و کورد)دا دێت کوردایەتی بە قاچاغ بۆ ناو عەقیدە دەباتو دەڵێت:

نووح، بەهۆی کەشتی لە جوودی ئێمە گرتی لەنگەری
دابـەزی هۆزی هونەرپەروەر، لە کوردســـــتان خزا

لەم بەیتەدا راجی بە ڕێبازێکدا دەڕوات کە پێشتر (حاجی قادر) لەم پارچە هەڵبەستەدا شەقڵی شکاند بوو:

ئەو ڕۆژە بە ئەمری حەیی ی مەننان
ئەم عالەمـــە پاکی بوو بە طوفان

بانگەوازەکانی راجی لەبەر سادەیی‌و سافییان ڕوویان لە هەموو کوردە نەك لە چینێکی وەیا تیرێژێکی وەیا دەستەو تاقمێکی.

لەئایین‌و نیشتمان بەولاوە هەڵبەستەکانی هەمەچەشنەی بابەتن. بەشێکی ئەو هەڵبەستانە کە هی موناسەبەن لە دەمێکدا گوتراون کە وا جارێ موناسەبەکە لەبەر چاوی خەڵق نەدزا بوون.

بە هەمەحاڵ شاعیرێکی بێ لایەنی وەکوو راجی لێی ناگیرێ بەپێی داخوازی هەڵکەوت‌و حاڵ‌و بار، لە سنووری بەرژەوەندی گشتیدا، شتێك بڵێ کە ڕەنگە شاعیرێکی سەر بە لایەن لێی بگیرێ.

ڕاجی سنووری بەرژەوەندی گشتی نەبەزاند.
درووود لە گیانی.

# مێژووی ژیانی ڕاجی

به پێنووسی:

مەلا عەبدوڕڕەحمانی ڕاجی

١٩٥٩/١١/٢٢

ڕاجی، ناوی تەواوی (مەلا عەبدوڕڕەحمانی کوڕی مەلا ئیبراهیم)ە لە تیرەی مکایەڵی هۆزی جافی شارەزووریيە، باپیری ناوی مەلا مەحمودی کوڕی بارامە کە ناسراوبوون، لە ساڵی (١٩١٣) لە شاری (کۆیە) لەدایك بووە، دایکی ناوی (هەمین)ە کچی حاجی قادری کۆیە، بەڵام نەك حاجی قادری شاعیر.

لەساڵی ١٩٢٠ و لە تەمەنی (٨) ساڵیدا لەلای باوکی دەستی بە خوێندن کردووە لە دێی (گەڵنێری)ی سەر بە ناحیەی (چناران)ی قەزای ڕانیە. دوای ئەوەی هێزێکی لە خوێندن وەرگرتووە، چۆتە کۆیە لە قوتابخانە ناوەندییەکان خوێندوویەتی، لە ساڵی (١٩٢٦) دا بۆ هەوڵی خوێندن لە ناوچەکانی (مەرگەو سولەیمانیو خۆشناوەتی) دا گەڕاوە. لە ساڵی (١٩٢٩)دا هاتۆتەوە بۆ قوتابخانە گەورەکانی کۆیە، بەڕاستی بە هەموو زانستەکانەوە خەریك ماوەو موتاڵای کتێبەکانی قوتابخانە ڕەسمیەکانیشی کردووە وەکو (حیسابو هەندەسەو جەبرو جوگرافیاو ... هیتر). زۆر تێکۆشاوە کە گیروگرفتو موناقەسەی نێوان قوتابی دینیو قوتابی ڕەسمی لابەرێو برایەتی زانیاری پەیدا ببێ تا بەچاوی خۆی دیتی.

ڕاجی، لە زانستی (نحو، صرف، منطق، بەلاغە، بەیان، عەقائید، اصولو فروع) شارەزایی پەیدا کردووە، لە ساڵی (١٩٣٧) بڕوانامەی دوایی مەجلیسی عیلمی وەرگرتووە لەلای خوالێخۆشبوو جەنابی (مەلا بەهائەدین کوڕی مەلا شێخ تەیب - ئیمامو خەتیبی مزگەوتی بایزاغای کۆیە)و لای ئەندامانی مەجلیس کە بریتی بوون لە (مەلا صادقی دایە خەجێ)و (مەلا عەلی باداوەیی)و (حاجی مەلا ئیبراهیمی زینۆیی)و (وەکیلی قازی شەرعی)و (کاتبی عەدل)، بڕوانامەکەی لەلایەن ئەو بەڕێزانەوە بە ژمارەی ( ٥٦) لە تەئریخی (١٣٥٦/٢/١٨ کۆچی) بەرامبەر بە (١٩٣٧/٤/٢٩ زایینی) بەم دەرەجانەی خوارەوە، تەصدیقو ئیمزا کراوە.

| ت | المادة | الدرجة | النتيجة |
|---|---|---|---|
| ١ | قواعد اللغة العربية | ١٠٠ | ناجح ثان |
| ٢ | الكلام والاعتقاديات | ٨٥ | |
| ٣ | أصول الفقه | ٧٠ | |
| ٤ | الفقه و التفسير | ٧٠ | |
| ٥ | القرآن الكريم و التجويد | ٩٠ | |
| ٦ | البلاغة و البيان | ١٠٠ | |
| ٧ | الوضع | ٩٠ | |
| ٨ | المنطق و الحكمة | ٩٥ | |
| ٩ | الحساب | ٨٥ | |
| ١٠ | الجبر | ٦٠ | |
| ١١ | الهندسة | ٦٥ | |
| ١٢ | الإنشاء | ٧٦ | |
| ١٣ | الخط | ١٠٠ | |
| مجموع الدرجات | | ١٠٨٦ | |

راجی له (١٩٣٩/٩/٢٢) ژنی هێناوه كه ناوی (مامزی كچی عەبد) بووه له شاری كۆیه. لەساڵی (١٩٤٠) له كۆیه دەرچووەو بۆته مەلای ئەهلی له دێی (قولقوڵه)، لەساڵی (١٩٤١) چۆته دێی (خەرابه)و بۆته مەلای ئەهلی لەلای (عەزیز ئاغای صاڵح ئاغای غەفووری). لەساڵی (١٩٥٤) له (خەرابه) باری كردووەو به مەلایەتی چۆته دێی (گەڵنێری)، له ڕۆژی (١٩٥٨/١٠/٢٦) بەهۆی ژێر ئاو كەوتنی گوندەكه بەزۆر ناوی حەوزی دوكانەوە، لەگەڵ بەشێك له خەڵكی ئەو گونده به فەرمانی میری گواستراوەتەوه بۆ دێی (سابوراوای تازه) لەناحیەی سورداش‌و له خانووی ژماره (٧) نیشتەجێ كراوه.

لەبەرئەوەی له ژنی یەكەم خوا هیچ منداڵی پێ ڕەوا نەدیت‌و، زۆر ساردو گەرمی له تەمەنی خۆیدا چێشت‌و دەرەختی ژیانیشی بەرەو پیری دەڕۆیشت، بۆیه له ڕۆژی (١٩٥٢/٣/٢٨) ژنێكی دیكەی هێنا بەناوی (زبێده مستەفا حەمەد). (ڕاجی، لەم ژنەی دووەمی چوار كچ‌و پێنج كوڕی بووه بەناوەكانی: بەیان، زوهره، شۆڕش، شیرین، ئیسماعیل، ئازاد، كاوه، سەلاح و سەباح) - ئامادەكاران.

**ڕاجیو کتێب دانانی:**

* لەساڵی (١٩٣٤) کتێبی (لقطة العجلان)ی زەرکەشی کە لە (اصولو حیکمەت و منطق) ە کردوویەتی بە (منظومة) بەزمانی عەرەبی، بە هەموو حەیفێکەوە بەیەك نوسخەیی لێی دزراوەو ون بووە.
* لەساڵی (١٩٣٦) چامە بەندێکی دڵداریو نەتەوەیی بەناوی (ناونیشانی کوردان) بە هەڵبەست داناوە.
* لەبەر ئەوەی زۆر حەزی لە زانستی منطقو فەلسەفە بووە، لە ساڵی (١٩٣٩) کتێبێکی تەئلیف کردووە بەزمانی عەرەبیو ناوی ناوە (زبدة المنطق).
* لەساڵی (١٩٤٤) لەسەر تکای (کاکە زیادی کوڕی حەمە ئاغای کۆیە)و (حاکم عەلائەدین ئەحمەد نوری - حاکمی کۆیە) دەمەتەقەی نێوان (فەقیرو دەوڵەمەند) ی بە هەڵبەست داناوە.
* لەساڵی (١٩٤٨) کتێبی (فرائض شرح المنهج) لە فیقهی شافیعی کە تایبەتە بە بەشکردنی میرات، بەناوی ( بەشە میراتان) بە وردەکاریو بەجۆرێکی زۆر گرنگ وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.
* لەساڵی (١٩٥١) قەسیدەی (بوردیە)ی شێخی بوصەیری وەرگێڕاوەتە سەر نەزمی کوردیو دواییش کردوویەتی بە پێنج خشتەکی.
* لەساڵی(١٩٥٢) وەڵامی موفەتیشی مەعاریفی کەرکوکی داوەتەوە، کە پرسیاری لێکردووە: (ئایا خوا دەتوانێ یەکێکی وەك خۆی دروست بکات، یان نا؟). بە زمانی عەرەبی سەلماندوویەتی کە نابێت.
* لەساڵی (١٩٥٥) لە باسی (سێ تەڵاقەی شەرعی) نامیلکەیەکی بەزمانی عەرەبی داناوەو بەراوردی تیا دەربڕیوە کە تەڵاقی شەرعیی ڕاست هەر یەکێکە بەجار جار دەبێ بە سێو ئەمەشی لەو نامیلکەدا سەلماندووە.

**کۆچی دوایی ڕاجی:-**

(ڕاجی لە گوندەکانی قوڵقوڵەو خەرابەو گەڵنێریو سابوراواو گرژەو بەکرەجۆ، بەمەلایەتیو کاری جوتیارییەوە ژیانی گوزەراندووە. تاکو لە کاتژمێر پانزەو بیستو پێنج خولەکی ڕۆژی شەممە ڕێکەوتی ١٩٦٩/١٢/٦ بە هۆی نەخۆشییەوە لە بەکرەجۆ کۆچی دواییکردووەو لە گۆڕستانی بەکرەجۆ بە خاك سپێردراوە). - ئامادەکاران.

## نموونەیەک لەدەسخەتی فارسی

چاوە نورن بادە بیکم مەبەغم کو تۆم تو نە — برامید جام لعلت دردی آشامم هنوز

واحوالە دنیومالم روبوە بودبید نت — تا چە خواهد شد درین سودا سرانجامم هنوز

چاوی صیادت بە حلقەی کاکلوا بوی کوان — میزند هر لحظە تیر مو بر اندامم هنوز

چونکە جاری ناوی ایری لیوی یارم فرموە — اهل دل را بوی جان میآید از نامم هنوز

ذرەی نوری رخت درکوتە پردە و روژنا روون — میدود چون سایە هردم بر لب بامم هنوز

نیکبوم دڵی بەلبخ و لاری شیرین ساقیا — جرعەی جامی کە من سرگرم آن جامم هنوز

چندە بریانم بە آگر بادە زنگی آگر بدە — کاز جهان پختەکان عشق او خامم هنوز

بیم دلی تو بروا جا بگرە آرامو قرار بە — جان بغمهایش سپردم نیست آرامم هنوز

مثلی حافظ راجیا کچی لبی دلبر دەکەم

آب حیوان میرود هردم ز اقلامم هنوز

آن غالیە زلف سیم بدن انداز — وان لعل دل افزای بچین شکن انداز

دست من بیچارە کە کوتە ز لب تست — بهر قدح سینە تو ... سمن انداز

بنگر کە لبم خشک بیارست ز هجران — از بهر خدا بر لب شکر شکن انداز

خاطر صدفم کرد زمان در همە آفاق — در ظرف ظفر لعل عقیق یمن انداز

تا سیر تماشیست در این گلشن بستان — بشکن تو گل سرو قدی خوش چمن انداز

در طرف چمن مرغ دلم را بجلادت — آلودە بتشریف گل یاسمن انداز

سیراب کن از بادە چشمت من مسکین — در میکدەها ظرف بوجە چمن انداز



وێنەی ڕاجی لە تافی لاوێتیدا

- ١ -

(١)

خاك و هەوایەكەی وەتەن، هەروەكو سەر چوو بە هەبا
كەوتەوە باوەشی ڕەقیب، هەروەكو قاوت و ڕەشەبا
ئەزانی چۆنە حاڵی دڵ، لەگەڵ گوڵی دەمی وەتەن؟
ڕاستە ئەپشكوون بە خودا، ئەم بە سەبۆ، ئەو بە سەبا
هۆزی بە سۆزی كوردی من، دەمێكە سەر بە زامەوەن
بۆ دەس و باوەشی وەتەن، بێجگە تەما، چ شك دەبا؟!
وەختە بخنكێ بێ هەوا، هەناوی بێ شەهیقە وا
خوێناوی پیس و پاكژی، دانەی سپیشی لا ئەبا
سپڵ و زگت چ هاتووە، لە خانە هێندە دانیشی؟!
كەڕیدە چەندە چاپوكن!! تێتوە ئەیێچن لە عەبا
تۆی وەكو پووش و كا لە شەو، كوردی پەرێشانی وەتەن
دوژمنە كێشای تەمەنت، چاوی خشاندە كارەبا
ئێستە خەریكی چی بڵێی، لەم هەموو ئاوو ئاگرە؟!
وا پرە چاوت لە نەو، هاتووە لووتت بە لەبا
بێكەسی وەك ئێمە وەتەن، خۆشی لە تەبیاتی كەسێ
بێتو بكوڵێ جگەرت، هەروەكو میكرۆب لە تەبا
بۆ دڵی ڕووناكی چەمەن، نەغمەمە (ڕاجی)، هاتە جۆش
لە مێشكی خۆ دەئاخنن بیری بەهێزم، ئودەبا!!.

(٢)

مەشقی چیە پەروانە، لەگەڵ شەوقی چرادا؟
ئەشقی چ ڕووە دێتو دەچێ، گیان بە فەنادا؟!

دوو زوڵفـی ڕەشـی، شـوعلە فرۆشـن وەكـو كوڵمـەی
ڕۆژی ڕەشـــی بەدبەختییـــە، داخـــی بـــە ســـەمادا
هـاواری مـوژەی، هـۆش و دڵ و دیـن کـە ئەکێـشێ
کۆشـەی هونـەری چـاوە، هـەزار ئێـشی پـەنادا
کـاتێکی نـەبوو وەرنـەگرێ چـاوی، دڵـی خـەڵك
غـەمزێکی کـە بـادا، جگـەرو مێـشکی بـە بـادا
ناموسـی هـەموو عالـەمی کێـشاوەتە چـاوی
هەڵنایـە، گرانبـارە، لـە شـەرم و لـە حـەیادا
باری دڵ و، سەرباری جگـەرمی، خـەم و خـوێن کـرد
قـازانجی چ بـوو، زوڵفـی کـە دوو باری بـە تـادا؟!
خـاڵی مەحـەکی سـۆزە، کـەوا لـەو ڕووە چەسـپا
هـەر زێـڕی ئەکێـشاوو، کـشاوە بـە دووادا
بروانـە گلێنـەی، کـە ئەوەسـتێ بـە هـەموو ڕوو
زانـاوو نـەزانی، وەکـو یـەك دڵ بـە خـوادا
باقێکی وەنەوشە و گوڵ و سونبول، بە سەما خست
سـەبرو هونـەرو هۆشـی، بـە سـەودایی لیقـادا
ڕزگـاری چ بـن، مەسـت و بـەخۆ ژیـوو گرفتـار؟
كاتێ، کـە خەڵـەی خـاڵ و خـەتی بـەر ڕەشـەبادا
(ژیکـۆ)[1]، چ هەراییکـە لـە شـوێن ئـاگری دیـدار!!
یـا مەحکەمـەیی ڕۆژی دوات هـات بـە دووادا؟!!

(٣)

سـاقی لـە پـەردە وەسـتا، دەسـتی بـە بـادە دادا
موتریب بە چـەنگ و بەرپـەت، بـەزمی بـە ڕووی سـەمادا

١ ڕاجی، بە هەردوو ناسناوی ( ژیکۆ) و (پشکۆ) یش شیعری نووسیوە.

بەینێکە بۆ ڕەقیبان، لەم دەشتەدا کەلاکم
سەد مەرحەبا لە یارم، هات و ڕەقیبی لادا
دیسان بەغەمزە وەستا، بۆ قەتڵ و عامی عالەم
دەستی بە گوڵ وەنەوشەی، بۆ شین بەبەر سەبا دا
وەك تازە سەروی سەرکەش، زوڵفی بە نازی لەرزی
بەم نازکانە لەرزە، سەد عاشقی فەنا دا
ئیمرۆ بە ئاهی سەردم، پرسیومە حاڵی چاوان
فرمێسکە دای وەڵامم، ئەم بەحرە چاری نادا
دڵبەر بە زوڵف و کاکۆڵ، دنیا دەخاتە وەی وەی
بەم بەم چلۆن لە ڕێما، ڕووی خۆی بەلای منا دا!!
(ڕاجی) لە تۆ موبارەك، ئەم عیشقە تازە پەیدا
یارەب هەوایی یاری، وەسڵت بە ئاشنادا.

(٤)

ئەوا بەحری پەرۆشی من، شەپۆلی دا بە دنیادا
کە شۆری کورد و کوردستان، لە ئێخەم دەستی بەر نادا
لە مێژە شوێنەواری ژین، بە ماتەم بەرگی پۆشیوە
دەڵێی زەردەشتی لێ مردووە، لە جۆشی ئێش و هیوادا
ژیان و نیشتمانم ڕۆ، کە دوژمن ئاوەدانی کا
ئەبێ چۆن حاسیلاتی هەڵگرێ و، خەرمانی بەر بادا؟
لە پێناوی کوڕانی گەل، لەشی خوێناویە خاکم
مەگەر فرمێسکی زامانە، لە ڕەنگاوڕەنگی سیمادا
ئەڵێی داکی جگەرسووتاوی بێتاوانە، بێهۆشە
بە گریان دەنگی نووساوە، لە داگیرسانی فەریادا

سەبا، پەرت و بڵاوم کۆکەوە تا تێمکەیێنێ شەو
لە کام شوێن و کەلێنی گەل، کە بڕیاری تەقەللادا؟!
دزو حیزو درۆزن ئاسەواری گەر بڕا، کاکە
بڵێ جەژنی دڵە، با دەس بخاتە دەستی هیوادا
خەتای شەیتانی خۆمانە، کەلوپەلمان کە ئەفرۆشن
بەخۆرایی، کە خۆرایی دەریهێناین لە بونیادا
کە مادده ئیش بکا تەنیا، بە تەبیات ڕیزە ناگیرێ
کە تەبیات لێکجیاوازن، لەسەر مەیدانی ئیجادا
وجود گشتی لە نێرو مێوە تێکەڵکێشە، بیزانە
کە ئاینیش دروست ئەکرێ، لە مێ‌وو نێری مانادا
هەتا تەرکی نەکا کاری خەرابی، چاکی لێنایا
بە نیسبەت دەرئەبێ نیسبەت، لە تەئریخی هەیولادا
بە هەق بیناسە ئەو زاتەی، کە ناگونجێ تۆ ببینی
کە شەپرێوە بەرامبەر ئەو، هەموو بیرێ لە سەودادا
مەترسە هەق بڵێ (ژیکۆ)، هەتا ماوی بە سەربەستی
ئەگەر بتکەن بە دارا، یا سەرت ببڕن لە بێ دادا!!!.

١٩٥١

(٥)

بولبولی خەستە دڵم، هاتەوە دیسان بە سەدا
لە ڕەزو باخی ڕوخی، ماری ڕەشی پێچەوەدا
نرخی لەعلی لەبەکەو، دەنکە هەناری خاڵی
نابێ بەرلین و عەجەم، لەندەن و پارس و کەنەدا
کوشتەیی نازی دەمت، زیندووە تا ڕۆژی بەقا
مەستیی چاوت بەخەبەر نایە عەزیزم، ئەبەدا

**دیــدە هەڵمــەبڕە بــە ئــەو نــاوە لــە ڕێکــەت لادەم**
**هــەی دڵ و گیــان و ســەرو مــەردومی ئێمــەت بــە فیـدا**
**دڵەکــەم تیــرو پــڕە، هێنــد لــە خــەیاڵی ســینەت**
**مــەیلی حــوورو پــەریی و باخــچە ناکــا، بــە خــودا**
**ســەر چــیە؟ نەیخەمــە ژێــر پێــت و نەچــێژێ ئــاوات**
**گــاوری موتڵەقــە لــەم ڕێــە، کەســێ ســەر کــە نــەدا**
**(ڕاجیــا ) عیــشق چــیە؟ سۆزشــی گیــان و بەدەنــە**
**خــوویی پەروانــە بــڕۆ بگــرە، چ شــاهی، چ گــەدا.**

**(٦)**

**نیگــاری گوڵعــوزاری مــن، هــەوا بــە بــاڵ و پــەڕ ئــەدا**
**بولبــولی خاکەســاری دڵ، لــە ڕێــی وەڵامــی ســەر ئــەدا**
**دەمێکــە مــەیلی شــەڕ ئــەکا، بــەنازە چــاوە مەســتەکەی**
**کــەوا بــە شــیرو تیرەکــەی بــرۆو مــوژان، نــەزەر ئــەدا**
**نێــچیرموانە دڵبــەرم، هــەردەم لــە ڕێــەك دادەنــێ**
**داوێك لــە زوڵــف و کــاکوڵی و، بــە لەشــکرێکی ســەر ئــەدا**
**تکــای مــەمانی نەوڕەســی، لــە موتــەکایی ســینەدا**
**هــەنارو ســێوو بــێ لــەناو دەســی بــڕاوم بــەر ئــەدا**
**درشــتە بــیری وردی مــن، دەرهــەقی خــاڵی ڕوومــەتی**
**کــە کارەبــایی وردو ڕەش، لــە ڕۆژی ڕووی قەمــەر ئــەدا**
**خومــارە چــاوە شــۆخەکەی، بــەهاری دڵ بــەدەر ئــەخا**
**هەڵاڵــەو هــەنگی خاڵەکــەی، هــەنگوینی لێــوی دەر ئــەدا**
**پشکووت بەخەندە خونچەکەم، چ شێتە (ڕاجی) لەم دەرە!**
**بێباکــە شــۆخی نــاو ڕەزان، تانــە لــە ڕێکــوزەر ئــەدا.**

(٧)

دەستی بە هەوەس ناوەتە ناو دەستی ئەگەردا
بۆ ڕۆحی منی خەستە، ئیشارەی بە سەقەردا
بەم نێرگسە چەند ناسکە دڵبەر لە تەماشا
پۆشینی لەلای پشتەوە پۆشیوە بەسەردا
من ترسمە ئەو خونچە بە توندی بملێسم
ئەو بۆ سەری من، دەستی بە ڕق داوە لە بەردا
تا گەنجی قەدی ون بێ، لەبەر دەستی دزی چاو
زیوی بەدەنی ناوە، لەناو قوفڵی کەمەردا
دەسماڵی مل و گەردنی، ماڵی مەم و سینەی
وەك دوژمنی بێعارە، لەسەر گەنجی گوهەردا
دەسرۆکەوو سرکەی سەری، سورمەی دڵی عالەم
ڕەنگینە بەهەرلا، لە درەوشانی نەزەردا
ڕەنگینە بە خوێنی دڵی (ڕاجی)، سەری پەنجەی
زۆر حەیفە کە ئەو نوورە لە وەسمەو خەنەوەردا !!.

(٨)

من چیمە لە خووی ئاسەف و ئەسکەندەر و دارا
پێویستمە بەس ڕوویی نیگارم لە بەهارا
تێکەڵ بووە هەر جۆرە گژوگیا، بە گوڵووکا
وەك زوڵف و خەت و خاڵ و، ڕوخی خونچەوو زارا
جارێ، کە لە گۆشەی چەمەن و ڕێگە بگەم پێی
چیمە لە شەهی و لەشکر و قانوون و مودارا
بادەم کە لە دوو چاوی هەبێ، بۆچمە باخات؟
خەیمەم کە لە دوو زوڵفی هەبێ، بۆچمە خارا؟!
خنجیلەیە، سەر سووکە، عەمرەقکێڕە، گوڵەندام
شەنگۆڵەیە، دڵنەرمە، وەفادارە، گەوارا

ئـــەم تـــەرزە جـــەوان دڵبەرەیـــە، وا دڵـــی بـــردووم
سـەر، وەك سـەری مەنـــسوورە كـــە كردوویـــە بـــە دارا
هـــەر ســـۆزە، دڵـــی مـــەردمی بێكـــەس وەكەشـــێنێ
(ڕاجـــی)، بەســـە تـــۆ بـــەو ئـــەدەب و كۆشـــەیی ســـارا !!.

(٩)

ســـــاقی وەرە بنوێنـــــە لەســـــەر شـــــەوقی خومـــــارا
ئـــــەو قامەتـــــە ڕەنگینـــــە، لـــــەناو بـــــۆس و كـــــەنارا
تـــــا كـــــورد لەســـــەر ئـــــاگری پەڕســـــۆزی نیفـــــاقن!
بـــۆم تێكـــە مـــەی و، لێـــدە لـــە ئاهـــەنگی بـــەهارا
ئـــەم كۆمەڵـــە، بەنـــدی دڵـــی دوژمـــن ئەپـــسێنن
نـــاوێكی هـــەبێ كۆمـــەكی یـــاری لـــە دیـــارا
چـــەند خۆشـــە لـــە لایێكـــەوە، گوڵـــشەن لـــە تەماشـــا
بولبـــول بـــە كـــزەی ئاهـــەوە، قـــومری لـــە چـــنارا
نـــەیزانی، هـــەتا پـــشتی نـــەنا كـــوردی قەڵەنـــدەر
خـــشتێكی كـــە دای دوژمنـــی ڕۆحـــی، بـــە هـــەوارا
وا تێمەگـــە بـــێ مەیلـــە، لەگـــەڵما دڵـــی دڵـــدار
بـــاس و خەبـــەری فەننییـــە، ئەیكـــەم لـــە هـــەزارا
پـــشت و قـــەوەتی هۆشمـــە، ڕووی لـــوتفی نیگـــارم
تـــاب و تـــەرەب و جۆشمـــە، ئـــەو یـــارە لـــە شـــارا
كـــوردێ، كـــە وەكـــو خەرمـــەنی پووشـــن لـــە نـــەزەر خـــەڵك
بـــا ئـــاگری تێبـــەردەن و، بـــڕوا بـــە نـــزارا
(ڕاجـــی)، غـــەزەلی عیـــشقی تـــۆ هـــەر كوردیـــە ئیمـــڕۆ
ئـــەم تۆیـــە تـــەرازووی وەتەنـــە، ســـا كەســـوكارا [1] !!.

١٩٣٣

١- ئەم نیوەدێڕە بە پێی هەژمارکردنی پیتەکانی ئەبجەد دەکاتە (١٩٣٣).

(١٠)

عـودو گوڵــووك و شـەنگەبی، ئـاوی بـەدەم هـەوار دا
قـۆخ و هـەڵوژەو سـەوزە چـڵ، بەهەشـتیان قـەرار دا
مـن ڕووبـەڕووی مەیدانـەوە، کەوتوومـە نـاو سـەیرانەوە
حـەیا بـە گـوڵ و شـانەوە، هـەمووم بـە چـاوی یـار دا
چاوت بەخەو، لەنجەت کەوی، خێرا ئەڕۆی، خۆش ئەسرەوی
وەك مەکتـەبێکی سـانەوی، لەقـەت لـە سـەد هـەزار دا
لـەم شـارە پـایز بـار ئـەکا، زسـتان و هـاوین جـار ئـەکا
سـەرماوو گـەرما تـار ئـەکا، تـا ڕەونـەقی بـەهار دا
جـارێ بـە سـینەو دوگمـەوە، جـارێ بـە گـرژی کوڵمـەوە
جـارێ بـە چـاوی سورمەوە، قەنـدی بـە ڕۆحـی زار دا
مەیلێ بە حاڵمکـە دەمـێ، گـوێ بگـرە گوفتـارم کـەمێ
لـە تـاوی تـۆ کـە عالـەمێ، شیـشەی لـە جـەرگی یـار دا
(ڕاجـی) غولامـە لـەم دەرە، ئەگەرچـی هـەر سەوداسـەرە
قـسەی خراپـی گەوهـەرە، کەسـێ بـۆ نوکتـە غـار دا !!.

(١١)

گـــوڵ پێئەکـــەنن، لالـــە ئەپـــشکوێن، لـــە چـــەمەندا
بـــالا ئەهـــەژێن، بـــەر ئـــەوەرن، چـــەندە لـــە چـــەندا
ســـوورن دەم و لێـــو، زەردو ســـپی لامـــل و گـــەردن
خـاڵ و خـەتی ڕەش، چـاوی بەڵـەك، سـەوزە لـە تەنـدا
ئـەو دارو گیـای بـەهرەوەری و، بەرهـەمی ڕاسـتی
(زەردەشـت)ە کـە چـاندوویە لـەناو خـاك و وەتەنـدا
یـاری وەکـو تـۆی دیـوە، بـە چـاوی هونـەرو تیـژ
چـی جانـەوەرو جنـدە، هـەمووی خـستنە بەنـدا
ئـــەو پەرچـــەم و ئەگریجـــە، قـــژی دێـــوو درنجـــە
شـــەیتان و درۆ، گـــشتی، لـــەناو داوو کەمەنـــدا

ئەو مەرجە، کە بەستوومە لەگەڵ خەندەیی لێوان
دۆڕاوم ئەگەر بیخەمە هەنگوینی لە قەندا
دارو دەوەنم شانەوو هێلانەیە بۆ ژین
ڕازانەوەیی هۆشە، لەناو شاخ و چەقەندا
وەرگێڕی کە تۆ ڕوو، لە دڵی شێخە دوژمن
ئاشی لەگەڕاندایەوو خەرمانی لە شەندا
با هەڵبێ لە ئاسۆی هەوەسا، ڕۆژی ڕووانت
ئاوابێ شەوی بەد، لە سەمای ئاری یو زەندا
مازووچنی پاشۆل کونە، (ژیکۆ)کەچەڵی گەل
پەندی کە هەمووی ئاوە، ئەپێوێ لە سەرەندا !!.

(١٢)

کورد گەر هەبن شاهن هەموو، بۆ عەقڵ و نوتق و ئیهتیدا
ڕێکاوو ڕەوشت ساز ئەکەن، هەوەڵ هەتاکو ئینتیها
کاکە لەسەر دەوری زەمان، نەبووە زیاتر کەسێ لەوان
هەموو ژیان و پاڵەوان، شیرین زمان و خۆش نەوا
میللەت ئەکەن پەروەردە بۆ، وەختێ بە فریابێ بە خۆ
خاوەن هونەر، ڕفێنی گۆ، هەم بەهرەوەر، هەم موقتەدا
مایەی وەفاوو سەڵتەنەت، قازانجی هۆزو مەرحەمەت
تەبیاتی چاک و مەعریفەت، بۆ وانە هەم بەخش و عەتا
مەست و غرووری وەختی شەڕ، هەروەك بەلا کە دێنەدەر
ساف و لەسەرخۆ بۆ هونەر، وەختێ کەخەڵکیان بێتەلا
ئەو پشتیوانی قایمن، بۆ عەهدی خۆیان دایمن
بۆ ئیشی چاکە حاکمن، چاکیش ئەکەن دەفعی خەتا
(ڕاجی) لە قەومی کوردیا، ئاوێنەدارە بێ ڕیا
زۆر ڕازیە لێیان کەوا، ئەکرن جەماوەر ئیبتیدا.

(١٣)

تـــا وا بگـــەڕێن دوژمنـــــی بـــڕوا، لـــە عێراقـــا
وەختـــە بتـــەقم، دەربـــچێ گیـــانم لـــە مـــەراقا
وازی نیـــــە دەروێـــــشی درۆزن، لـــــە درۆو ســـــوێند
وەك دز لـــە دزیو، مـــەردمی بـــێ ژن لـــە تـــەڵاقا
یەك دێ بە (بیا)، یەك بـە (تـەعال)، ئێکـێ بـە(کـەمیێر)
یـەك (گێـل)ە لـە گێلخانـەیی سـاووخ و سـوجاقا[1]
گـەر پیرە، ئەگـەر گەنجـە، ئەگـەر شێخە، ئەگـەر بـێک
نەمـدیوە، بـڕا!! یـەك سـەری ڕاسـتی لـە شـتاقا
کـێ بێتـو بڵـێ؟ کاکـە وەرەو، کاکـە بنۆشـە
یـەك دەورە لـەبی بـادەیی شـیرین، لـە مـەزاقا
کـون کـون بـوو هـەناوو، جگـەرە لەتلـەتی خـاکم
کێشاوەمە سەری ڕێگـە بەسـەر، نـەك لـە دوو لاقـا
هـەر کـوردە لـەناو کـاوو چـیا، پـووش و گیـاخۆر
هـەر خەڵکـە لەسـەر سـفرە، لـەناو کۆشـك و تاقـا
ئـەی دڵبـەری ناسـك بـەدەنی کـوردی قەڵەنـدەر
گریـانی بـە کـوڵ بـۆ مـن و، تـۆش، خەنـدە بـە قاقـا
(ڕاجـی)، ئەتـەوێ حـاڵی وەتـەن ئێسـتە بزانـی!!
پووشـێکە بـە ڕووی بـاڕەش و، تەیرێکـە لـە قاقـا[2].

١٩٤٧

١ بیا: (فارسی)، وەرە. تەعال: (عەرەبی)، وەرە. *Come here*، وەرە. گێل: ( تورکی)، وەرە. ساووخ: (تورکی): سارد. سوجاق، (تورکی): گەرم.

٢ أ ئەم نیوەدێڕە بە پێی هەژمارکردنی پیتەکانی ئەبجەد دەکاتە (١٩٤٧).

ب لەشوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (پووشێکە بەدەم باوە، وەکو تەیرە لە قاقا).

(١٤)

کەسێک بۆ نیشتمان، دڵ موبتەلا کا
دەبێ خۆی تووشی سۆزی کارەبا کا
خەریکی مەرگ و ژین بێ، تا هەناسەی
تەڕو وشکی، لە گیانی مەرحەبا کا
تەرازوو بێ هەموو کارو مرازی
ترازاوی، هەموو چەسپ و تەبا کا
تەبایی کا لەگەڵ هۆزو عەشیرەت
برینی یێکەسی و شۆخی دەوا کا
فرو فێڵی حەسوودانی لەناوبا
گرینگی خاک و هۆزی پڕ بەها کا
لە کۆمەڵ، چەوت و چوێری هیچ نەهێڵێ
دڵ و چاو یەکدگیرو بێ خەتا کا
لە ناو هەر کۆمەڵێک بژیا بە ژیری
هەموو قەومێ لە ڕووی حەمدو سەنا کا
بە هیوا، باخی سەربەرزی بنێژێ
بە شادی، هەڵگرێ پێچوو بە داکا
لە ڕووی خۆراک و بۆنخۆشی و گەمانی
گوڵ و سێوو سەروی نەشئو نما کا
لە گۆشەی پاسەوانیدا بسووڕێ
لەسەر تەختی شەهی، گیانی ڕەها کا
لە دەریای کۆششیدا تا نەخنکێ
چلۆن یاقوت و گەوهەر ئاشکرا کا؟!

ئەگەر بێهێزە خۆرکەی سەردو گەرمی
لە قاوەی هێل و، دارچینی لە چا کا
ئەگەر گیراوە چاوگەی ناو هەناوی
دەمێ سەیرانی ساراوو هەوا کا
ئەگەر پەرپووتە نووسراوی دەماغی
بە شیرازو جزووبەندی ڕەوا کا
قوڕو قەوزەی ئەگەر تێدایە ناوی
دەریدا، تا ژیان بڕژێ لە پاکا
ئەگەر ڕێگای چڕو پڕ چقڵ و چاڵە
بە داس و خاکەناسی ماڵەوا کا
ئەگەر بێ ئاقڵەو، منداڵ و نافام
ملی بگرێ مەلای چاک و، ئەها کا
لەسەر زێ، گەر مەلەی هاتو نەزانی
جەڕاییکی بە گورجی پڕ لە با کا
بە (تیرو پشکە) ڕازی بێ لە بەش دا
بڵێ با خۆی و بەختی ئاشنا کا
ئەگەر پێویستە بژیا هەر لە خۆشی
بڵێ کۆمەڵ بکاو، پشتی لە شا کا
ئەروخێ گشتی بونیادو نیهادی
ئەگەر ساتێ لە یاران خۆی جیا کا
ئەگەر بیستی، قسەی بیستی وەکو من
ئەبێ (ڕاجی) بژی و، سەیری خوا کا!!.

(١٥)

بـۆ پێکـەنینی مـردمو، چـەندم بـە تـەما کـا
ئـەم بێـچووە ناکامـەوو، دەرنایـە لـە داکـا
ڕۆژی هەموو کـەس کەوتـە سـەماو، تـافی بڵند بـوو
ئەسـتێرەیی بـەختی منـە، هەڵنایـە لـە ماکـا
چـاوم، کـە بـەخوێن گوڵگـوڵی ئەسـرین ئەپـژێنێ
پـڕ خەنـدە، دوو چـاوە ڕەشـەکەت بـا تەمەشـا کـا
وا دووکـەڵی ئـاهم، سـەرو ڕووو گـەردەنی پۆشـی
لێـوت چ دەبـێ ڕەحمـە تنـۆکێکی ڕەوا کـا؟
دڵ، سەیری، وەکـو مەنجـەڵی سـەر ئـاگرە دەکوڵـێ
خوێن بوو بە هەوا، وەختە دڵیش سـەر لـە هـەوا کـا
دەسـتم نەشـکێ، بیگرمـە ئێخـەت بـەری نـادا
مێشکم نەتەقێ، هـەر دەبـێ میشکی تۆ بـە بـا کـا
ئاخـاوتن و دەرکردنـی تـۆ، هـەر یەکـە بـۆ مـن
یەکـدڵ ئەوەیـە، بـۆ سـەروکاری تەقـەلا کـا
گیانە وەرە لام، چـونکە ئـەتۆش کـوردی وەکـو مـن
ئاسـان نیـە دڵبـەر دڵـی دڵبـەر بـەرەڵا کـا
گوزاڵکەیـە دووریـتو، لەهـەر لاوە مژیومـە
لێـوت چ دەبـێ، دەردی دزی (ڕاجـی) دەوا کـا؟!.

(١٦)

بـۆ جیـازی کوڵمـە ڕۆح و دڵ لـە مـن داوا ئـەکا
ژین و عەیشی من بە یەك دەم، سەربەسەر یەغما ئەکا

دڵبەرەی خەنجەر وەشێنەی، پیرِ شەڕەی، عاشقکوژە
خۆی لەناکاو دەرئەخات و، بێ کەسان ڕیسوا ئەکا
من گوڵی نازو نەعیمی پێئەدەم، بۆ ڕەم ئەکا؟
چونکە یا خۆشمدەوێ، ئەو، بۆیە لێم حاشا ئەکا
نامەوێ باخی بەرینی جەنەت و، موڵکی ئەبەد
گەر سەری یەك موو لەگەڵما، یاری ڕەنگین چا ئەکا
من ئەزمەرگەم خۆی ئەپۆشێ، من بگریەم خۆش ئەبێ
من بڕۆم ئەو ڕادەوەستێ، من بوەستم، ڕا ئەکا
ئەی بە قوربانی سەرو ڕووی زەمزەمەی جانانە بم
وا بە تاریکی و بە ڕووناکی، دڵان شەیدا ئەکا
بگرە دامێنی بە کوللی، بەرمەدە تۆ (ڕاجیا)
یا بەجارێ ئەتکوژێ، سا یا بە خۆت هەمتا ئەکا!!.

(١٧)

کاکە! گەر بیزانی کوردستان لەسەر کێو باز ئەکا
بووکی تازەو تەڕ لە خاکی خەڵکەوە داخواز ئەکا
پیرەمێردێکی وەجاخ کوێرە، لە چاخی نووحەوە
قەت لە جێ نەبزووت و داوای هەر قزو پاپاز ئەکا
هەر منالێکی دەریکردو لە خاکی ڕۆیە دەر
ئاقڵی غوربەت بڵندی کردو ئێستا ناز ئەکا
کەی لە جێوە، ئێسك و ماسولکەی بەهێزی پێوەیە؟
بۆچی داوای پاڵەوانی و، پێشەوەو، حەمباز ئەکا؟
لاوی کوردی! گەر دەزانی خاکی پاکت چەند بەشە
چاو تەماشای عارەب و، تورك و، خەتی شیراز ئەکا

تــازه، ئــه‌م زاوایــه لــه‌و بووكــه نــه‌زادی پێــه‌كا؟!
بۆچ به‌شموكاری، له‌ناو دوو لینگـه خـۆی لاواز ئـه‌كا؟
هـۆزو تـیره‌ی ئه‌جنـه‌بی، په‌روانـه ئاسـا هـه‌ڵگزان
تازه وه‌ك ئـاواره بولبـول، كـوردی مـن ئـاواز ئـه‌كا!
خه‌ڵكه، هه‌روه‌ك فرفرۆكـه هاتـه خـوارو كه‌وتـه سـه‌ر
كوردی تادارو ته‌مه‌ڵ، خۆی گـیره‌وه‌ی هـه‌وراز ئـه‌كا
من كه‌وا دڵسۆزی ئـه‌م خاكـه‌ی وه‌تـه‌نم‌و، خاكه‌سـار
هه‌روه‌كو(ڕاجی)م، به‌كۆڵێ تانه خۆی سه‌رباز ئه‌كا!!.
١٩٤٢

(١٨)

دڵبـــه‌ره‌ی بـــالاّ بڵنـــدم، مـــه‌یلی دڵـــداران ئـــه‌كا
خونچه ده‌م، سروه‌ی نه‌سیمی خۆی له كوردستان ئـه‌كا
ڕموت‌و، له‌رزانـــه‌و، نیـــازو، خه‌نـــده‌وو گرژینـــه‌وه‌ی
دائیمـا خـاپوور ئـه‌كا، ئیمـان‌و دڵ وێـران ئـه‌كا
تـا لـه خـۆی پۆشـی هـه‌وایی نـازكی ڕوحولحـه‌یات
ڕووی به‌دیعی، كه‌ی له دڕكی سه‌رك‌و گوڵبانمان ئـه‌كا؟
هه‌ر له یه‌ك پێ، سه‌د هه‌زاران جان فیدای ناوی ئه‌كـه‌م
تا به لوتفی خۆی له سینه‌ی، سێوو بـێ به‌خشان ئـه‌كا
دڵ لــه زاریـــدا بـــه زار هـــاتو، نـــه‌هاتی چـــاوه‌كه‌م
چاو له ڕێتـا، خـۆی غـه‌ریقی شه‌وچـراو مـه‌رجان ئـه‌كا
گـه‌ر دوعـای تـه‌خت‌و مـرادو عیزه‌تـی كـا، دڵبـه‌رم
من ئه‌ڵێم ئامین‌و، ویش، وه‌ختـی دوعـام ئامـان ئـه‌كا
قـه‌ت لـه دنیـادا عـیلاج‌و چـاره‌یی (ڕاجـی) نیـیه
به‌ختی به‌د، هه‌رده‌م جه‌فاو مه‌رگی له‌سه‌ر ئیعلان ئه‌كا!.

(١٩)

بولبولی تەبعم کە یادی باخ و بوستانان ئەکا
نەغمەوو ئاوازی وازی، پەرتی سەد داستان ئەکا
دامەپۆشە لالەزاری گوڵعوزارت، ئەی نیگار
بێتو گەر دڵ بێتە سەیری، دوژمنان تاڵان ئەکا
خۆش نەسیمی باغ و ڕاغی ڕوومەتت، گەر دەرکەوێ
خاکی کوردستان و عارەب، گشتی موشکەفشان ئەکا
دەست و بازووی نازکت، قەندی مناڵی عاشقە
پێکەنینت، ئاوی کەوسەر دائیما باران ئەکا
مۆری ئەنگوستیلەکەی ئەنگوستی هەمتای شەککەرت
خاتەمی ئاسەف بە ڕەسمی هەندەسی حەیران ئەکا
قامەتی شۆخت لە باریکی، عەجەب بێ غایەتە!
گەرچی تەفسیری، پڕی سەحراوو شارستان ئەکا
خۆزیا جارێ بە بالآتا، سەری مەستیم ئەبەست
تا بە یەکجاریم ئەزانی، چۆن دڵم وێران ئەکا!
پەرچەمی پڕ چینی یارم، ڕووی لە مەشریق نابڕێ
خاڵی جێی شەرقە، کەچی ڕووی خۆی لە هیندستان ئەکا
ئەووەڵی کارم نەزانی دیدەم دەستاکەوێ
هەروەکو (ڕاجی) کە کاری بێ سەرو سامان ئەکا!!.

(٢٠)

ئاسمان پیرۆزە ڕەنگەو، مەیلی دیدەی تۆ ئەکا
ڕەعدی دڵ پڕ ئاگرو بەرقەو، تەم و ڕۆڕۆ ئەکا
هەڵقەیی زوڵفت لە مل دانایەوە، بۆ ڕاوی دڵ
(یوسف)ی میسریی لە سیجنی سۆز دەست ئەستۆ ئەکا

تـا زولـەیخایی خـەیاڵم، جـەرگی سـووتابێ بـە تـاو
ئـەو لـە ڕۆژئـاوای ژیـانی ڕۆژهـەڵاتا بـۆ ئـەکا
بولبولی پـڕ خـەم لـە دامـەن مێرگـوزاری ڕوومـەتت
وەك دەفـەی شـێخان، چ ئاوازێـك و جوسـتوجۆ ئـەکا!
شـاهی چـاوت، عالـەمێ دەسـگیری موژگـانی درێـژ
هـەروەکو دڵ، لەتلـەتی شمـشێری دوو ئـەبرۆ ئـەکا
سـەر، هـەوای ڕەنگـی بـەهاری پـڕ گـوڵی ڕاگرتـووە
دەم، بەخەندە کەوسەرو هەنگوین لـە مێرگـان ڕۆ ئـەکا
گیانی (ژیکۆ)ی ڕاگووشی، ئەو موگنەتیسەی چـاوەکەت
بۆ مەزەی ویسکی و عـەرەق، داوای دڵـی بۆنسۆ ئـەکا.

(٢١)

یـاری عـەزیزم هـەر قـەدەر، سـستی یـو بێـزاری ئـەکا
دڵ بۆیـە دایـم پـڕ ئەسـەر، شـین و هـەراو زاری ئـەکا
ئەی قەد بە لەنجەی چاو بەکل، چیدیکە من مەگرە لە گـڵ
لەم باخـەدا ئوسـتادی دڵ، خـۆی فێـری مووکـاری ئـەکا
تۆ حووری یا جین یـا مەلـەك، یاقوتـە لێـوت یـا مەحـەك
مـن زێـڕم و تـۆ بمخـە تـەك، لێـوت کـە ئینکـاری ئـەکا
شاهی، وەزیری، موتریبی، تورکی، گەدای، هەرچی هـەبێ
مەقبوولی خەڵك و من دەبێ، چـاوت کـە سـەرداری ئـەکا
لـەم هاتوچـۆیە دڵ بڵـێ، ئەلحـەق لـە عەشـقی تـۆ بـەڵێ
بـۆ کۆمەڵـەی وەسـڵە وەلـێ، داوایـی سـەر داری ئـەکا
پـشتم شـکاوە چـاوەکەم، فـەوتاوە عـومرو ناوەکـەم
بێچارە بەستەی داوەکەم، دڵ خـوێنی گـەش جـاری ئـەکا
دەسـتی بـە مـستی خەنجـەرە، خـوێنم لەبـەریا مەحـەرە
کەس بـا نـەڵێ موقـەددەرە، ئـەو ئیشی یـەکجاری ئـەکا

نەقــدی حــەیاتم لێــبڕا، مــۆری وەفــاتم پــێ بــڕا
ئـاگر لـە جـەرگم هـەڵگرا، زوڵفـت کـە تـەڕڕاری ئـەکا
سینەم سەراپەردەی حەزمن، دەنـوێ لـەوێ یـاری عـەدەن
دڵ ئێشکەچی پـۆڵا بـەدەن، لـەم قەسـرە هوشـیاری ئـەکا
ئاگــای لــە ئــەحواڵم نییــە، ڕوح و ســەرو مــاڵم نییــە
بـێ ئـەو چ ئامـاڵم نیـە، ویـش پڕ سـەفا یـاری ئـەکا
(ڕاجی) لە وەسڵت خۆش مەبە، نۆشت نەبێ، بێهـۆش مەبـە
هەرچـی لـەلای تـۆ مەتڵەبـە، بیکـا بـە بێکـاری ئـەکا!!.

(٢٢)

ڕووی، بەهارێکــە بەهەشــتی ژیــن پــڕی ســینەی ئــەکا
ســـاف و ڕازاوە، بەهـــەنگوین و پــەنیر و مــەی ئــەکا
دڵ لە میحرابی برۆی ئەودا، کە سـەجدەی بـرد بـە قـەد
بۆ تـەمای ئاهـەنگی ئـەو فیردەوسە سـەد تۆبـەی ئـەکا
قامــەتم چــرچ و نەخۆشــە، خــوارو خێــچە بــۆ ڕکــوع
فاتیحەی عیشقی، لە نەغمەی چەند هـەزار نۆتـەی ئـەکا
تـا کـەوان و تـاری مـن، هـەر باسـی نـازو لەنجـە کـا
سەر بە قانوونی تـەرەب، چەشـنی سـوراحی قـەی ئـەکا
ئـەهلی ویـژدان و ڕیـسالەت، گـەر ئـەڵێ جەنـەت هەیـە
دیـارە بـاوەڕ بـەو لـەب و سینەو مەمـەو کوڵمـەی ئـەکا!!
هەرچـی بـێ بروایـە نەگبـەت ئـەیگرێ و، مورتـەد ئـەبێ
زاهیـدی بـازاڕە وەهمـی چـاوە چـرکەی کـەی ئـەکا؟
جەنــەت و دۆزەخ، لــە ئــەووەڵ ڕۆژەوە هاتوونــە دی
هـەر یەکـەی ڕێگـا بـە عـەردی ئـادەمی شۆسـەی ئـەکا
خێر و شەڕ، قـازانج و دۆڕانـدن، چـیە نـیسبەت بـە هـەق؟
هەر کەسێ خێـری بـوێ، خـۆی ئـۆگری جیلـوەی ئـەکا

دامەنی بادەو، بە بادەی وەسڵی بەر بادە خەمت
هەر کەسێ خەزنەی سەفا داکا، بە ئەم ئێشەی ئەکا
مانگ‌و ڕۆژم لێ ئەچێ، تا ساڵ بەساڵ‌و مانگ‌و ڕۆژ !!
چاویان پێ کز ئەبێت‌و، جەرگیان خرپەی ئەکا
ئاخیری کارانە (ژیکۆ)، هەستە یارت هاتە ڕوو
کەس نیە بێجگە لە خۆی، سا کێ لە کێ ئۆخەی ئەکا!!.

(٢٣)

ئەگەر زوڵفت نەکا جەزبم، هەواداریم لەگەڵ ناکا
ئەگەر بادەش ببێ قوربان، گەرەمکاریم لەگەڵ ناکا
خەریکی شیوەن‌و شینم، لە شێوەی زەمهەریر ئاسا
بە ئەلتافی مەلەك، یارم، گوهەرباریم لەگەڵ ناکا
لە مەیخانەی نەوادا بووم، وتم: موتریب هەوایەك بێ
ئەگەرچی ئێستە بێزارە، بە یەکجاریم لەگەڵ ناکا
فیدای سەروی ڕەوانت بم، چ خۆشە ماچی لێوانت
کە خونچەش بێتو عاجز بێ، بە خونخواریم لەگەڵ ناکا
ئەسیری قەیدی تابوورم، بە خاڵی موشك بوو هاتم
کە قەتڵیشم بکا یارم، بە ناچاریم لەگەڵ ناکا
هیوادارم، غەزەلخوانم، وەکو بولبول لە گریانم
نیگارو نازەنینی خۆم، وەفاداریم لەگەڵ ناکا
زەلیلی دەستی شاهینە، کەوی دڵ مات‌و غەمگینە
هەزارجاریش ببم (ڕاجی)، ڕجاداریم لەگەڵ ناکا!!.

(٢٤)

لەخۆشی چاوەکەت، دڵ کاری ناقۆڵا نەکا چبکا؟
بە ناوی نارەومن بالآت بە دەم سەودا نەکا چبکا؟

لە پێ ئاهەنگی کوردانا، لە مەیدانی هونەرمەندی
بە نووکی تیژەوە دڵ هەمسەری ئاڵا نەکا چبکا؟
سەحەر پەردەی کە لادا، تووشی هەر کۆمەڵ ئەبێ، هەرلا
لە ڕازی ڕۆژمەوە سۆزی دڵان پەیدا نەکا چبکا؟
سەری سەودازەدەم، سەر تەختەیی جامی خەراباتە
کە دامێنی بە مەستی، ماڵەیی سەهبا نەکا چبکا؟
بە بەزمی بادەوە ساقی، کەوای پیرانی گوڵگوون کرد
کە گۆیندە چریکەی ڕوو لە عەرشی خوا نەکا چبکا؟
لە تاریکی خەیاڵاتا ئەفەوتاوم، دڵی سافم
بە نووری عیشقەوە، ئەم چاوە گەر بینا نەکا چبکا؟
لە عالەمدا هومێدی دڵ نەما، بێچارە وا ماوە
لە ناو پەردەی تەوەککول، خۆی ئەگەر تەنیا نەکا چبکا؟
بە شیرینی ستاندی لێوی گوڵڕوویان، دڵی ئێمە
کە تاڵاوی هەموو جێگای بە جەرگیدا نەکا چبکا؟
دڵی پڕ حەسرەتی (ڕاجی)، لە کونجی سینە ناگونجێ
لە ڕێی سەرکەوتنی کوردی، کە واوەیلا نەکا چبکا؟.

(٢٥)

دڵبەر بە جامی دیدە، ئەگەر بێ وەفا نەکا
مەیلی لە گوشتو بەستنی خەڵکە، سا خوا نەکا
دامێنی وەفای بگرە، ئەگەر مەردی کاری تۆ
تا خۆی لە دەستو داوی هونەرتا جیا نەکا
خاکێ لە دەم سەباوە، کە بێنێ نەسیمەکەت
نابێ کەچاوی عیشق نەڕێژێو دەوا نەکا
سورمەی لە پێ کشاوە، موژگانی بە ڕۆژو شەو
چۆن چاوی کارەبایی، سەما پڕ چیا نەکا!!

هەرچی لە عیشق تۆراوە، ئاخرشەڕیی لە خۆی
دەستی سبەینێکە با لە باخەڵ جەفا نەکا
ڕیسواوو سەرگوزەشتەی پیرو جوانە، ئەو کەسەی
بینایی مەی پەرستیی‌و، باخاتی سەفا نەکا
خوێنێکە ڕژاوە، سا نایەڵێ ئەم خوێنە بدا
چاوی، هەتاکو قاتیلەکەش بەر بەلاَ نەکا
کەوتوومە چۆڵ‌و بیابانی پڕ عەزابەوە
دەرناچێ لە چقڵ‌و چاڵ، دڵم گەر هەر ڕا نەکا
(ڕاجی) لە پێ کەوتووە، ئاگاتە ئامانجی کورد
تا خوێنی ئاڵ‌و گەشی، بۆ خاکی فیدا نەکا!!.

(٢٦)

یاری عالەمسۆزی من، وا چاکە ماچی سەر نەکا
گەر شەهەنشایە، لە قاپیی کەوتووم من دەر نەکا
من کە بادەنۆشی قەترەی خوێنی جەرگم، لەم دەرە
با مەزەی لێوانی بۆ میوانی ڕووی بێبەر نەکا
چەرخی پێشچوون، شۆرەتی خستوومە شاری عیشقەوە
زاهیدی خۆبین ئەگەر چی وت، بڵێن خۆی کەر نەکا
یاری بیدعەت پەروەرم، ئێمڕۆکە گەر وێنەی نییە
پێی بڵێم چی؟ گەر حوکمڕانی بە ئەسکەندەر نەکا
مەجمەرێکی سینە بوو، بردوومە بۆ ئەو دڵبەرە
چۆن ئەبێ میسک‌و عەبیرو غالیەی پێ وەر نەکا؟
دڵ لە جۆشی پەرچەما، سەرمەستی ئاپۆرە لە جەنگ
ناڕوا، تا خۆی زەدەی سەد خەنجەرو نەشتەر نەکا

زۆر دەترسم ئاخیری، (ڕاجی)، ڕجای نەگرێ گوڵی
پێی بڵێن لایەن لە ئەم دەرگانە، با سێبەر نەکا.

(٢٧)

چیکە کوێستانم لەبەر هەتاوا، سەر سپی نەکا
چیکە گەرمێنم لە ناو درك‌و داڵ، پێ پەتی نەکا
تا لە کوردستان، ناوی تەواوی وڵاتان نەکا
سۆزو بڵێسەی ئەستێرەی چاوی، یارمەتی نەکا
بە پێ هەڵپەڕین، شایی‌و دەسگوشین، پیرو منالان
نابێ جەرگی خەم، سەودای تێکۆشین لەتلەتی نەکا
دەم زێ‌وو ڕووبار، دەشت‌و بیابان، دێهات‌و ناو شار
کاوو کێوسار، نازی جوانان چۆن خەتی نەکا!!
هەر باخ‌و ڕاخی نایاب‌و ڕەنگین، ناوو قەراخی
نابێ وەجاخی کوردی نازەنین، خزمەتی نەکا
ئەی هۆزی دڵسۆز، جگەر بە بۆنسۆ، سەودایی نەورۆز
دەریکەن لە کۆز، هەرچی سەربەخۆ تایبەتی نەکا
(ڕاجی) بە کوردی ئەڵێ بە هیوای ناو دارو بەردی
ئەوی لە دەردی خۆشبێ لە هانای قیمەتی نەکا[1]!.

١٩٤١

(٢٨)

وام لەسەر خاکی وەتەن هەرچی حەیاو شەرمە تکا!
ئێستە ماچێکی دەمی لێ ئەخوازم بە تکا
گەرم‌و گوڕ، بەزم‌و هەوا، شوورو نەوا سووڕیدا
دڵبەرم کەوتە سەما، بادە ڕژا، شووشە شکا
خۆشەویستێکە وەتەن، تەن بە فیدای ناوی بێ
من‌و تۆی کردەوە دڵدارو نەماوین لە شکا

---

١ ئەم نیوەدێرە بە پێی هەژمارکردنی پیتەکانی ئەبجەد دەکاتە (١٩٤١).

ڕاستە سەرچاوموو(سپرینگ[1])ی تەمەنخوازو تەمای
وەختە جان و دڵی پڕ شۆر کە بخاتە شەتکا
ئاورم لێدەوە ئەمجارە، ئیتر یاری وەتەن
گەردەنی دوژمنەکانت، بخە بەندو پەتکا
نووری کوڵمەت بگەڕێ، تا لە دوو چاوم ساتێ
بۆیە دایم مەزموو بادە لە لێوم ئەچکا
دڵ بوو عەمباری هەموو زادو زەخیرەو، پڕ بوو
خەرمەنی دەردو خەمی دڵبەری، (ڕاجی)، لە چکا!!!

(٢٩)

چاوی پڕ سورمەی بەخوێنی ئێمە هێشتا ڕەش دەکا
یەك بڕۆی لێکدا، بەسەر دوو زوڵفی گیانم بەش دەکا
هەر کەکۆی کردن خەت و خاڵ و، لەب و دانەی هەنار
بۆ فڕێ، دایم لە کونجی بێکەسی بادەش دەکا
دایشکاند ئەم قامەتە شیرینە، جەبریشی نەکرد
ئێك و شەش، خشتەی بەرانبەر ئێمە ئێك و دەش دەکا
گەر حیسابی بادە کا، چاوی لە نادی نازەوە
ئیددیعایی تورك و فورس و عارەب و ئێمەش دەکا
گەر بە ئاوی گریە ڕۆژو شەو جەماڵی ئاو بدەم
ئەودەمە چاوی دوو نێرگز، کوڵمی دوو گوڵ گەش دەکا
غەمزە پڕ پێچ و پەنایەو، عیشوە پڕ نازو فریو
وەك تەرازووی زوڵفی لەو خاڵ و خەتانەی غەش دەکا
من، بە هیوای نیوە ماچێکی سەرم خستۆتە ڕێی
ئەو، ئەوا باوێشك ئەدا، یادی دەس و باوەش دەکا

٢ (Spring): کاتی بەهار.

چـۆن لـە خۆشـیدا نەسـووتێم و، لـە ناخۆشـی نـەژیم
خاڵی ڕووی ڕەش داگەڕاوەو، خزمەتی کـوورەش دەکـا
چونکە دڵبەر ڕووی لە (ڕاجـی) بێکەسـە، ئیمـڕۆ ڕەقیـب
دەم ئەقووچێنێ و ئەقۆخێ، چاوی پشتی بـەش دەکـا!.

(٣٠)

دڵ بـەدەردو داخـەوە، هـاواری بـێ ڕێوجـێ دەکـا
بێ دەرو شـەیدایە ئـاخۆ، حـەز لـە چـاوی کـێ دەکـا؟
مەست و لاوازە لە بـادەی بـێ غـەش و، دەردی بـە سـۆز
هـەروەکو مەجنونـە داوای باوەشـی لـەیلێ دەکـا
مـن کـە دانیـشتم لـە باخـچۆڵەو، بەعیـشوە هاتـە لام
لامـل و کوڵمـەی ئەپۆشـی، گوایـا شـەرمێ دەکـا
خونچە ئێخـەی دادڕی، بولبـول، کـە بەنـدی دەمیـەتی
ئەم دڵ و جەرگی ئەسـووتێ، ئـەو تـەنی ڕێ ڕێ دەکـا
گـەر ئـەزانێ لارو لەنجـەی ڕانەکێـشێ شـاو گـەدا
هـەروەکو زوڵفـی لـە دوولا، ئـارەزووی بـەر پـێ دەکـا
چاو، چ چاوێکە! مەکینەی ویسکی یو مەستی و هـەوەس
لێـو، چ لێوێکـە! مـەزەی ڕۆژی قیامـەت تـێ دەکـا
دوژمنـی بێبـەش لـە هـەرلا، وا خەریکـە پێـی بگـا
دەستی بێ ئەنگوسـتی بەشـکە پەنجەوانـەی تـێ دەکـا
هێنـدە پـەرپووت و کەریـشە، ئـەو سـەگی دەسـناکەوێ
کـەوتووە لـەم تەوڵـەدا، داوایـی ئەسـپی شـێ دەکـا
داری بـەرداریش هـەتا یـەك بـەر زیـاتر نـاگرێ
دڵبەری (ڕاجی) گـوڵ و نـارنج و بـێ و هـەرمێ دەکـا!.

(٣١)

چاوەکەت هەر وەك غەزالەی دەشتە، وا لێم ڕەم دەکا
بۆیە صەیادی دڵم، نسکۆ لە زام و خەم دەکا
لەتلەتت کرد جیسم و جەرگم، تۆ بە شمشێری برۆت
یار لەگەڵ یاران ئەمێستا، زامی بێ مەرهەم دەکا
زامی کۆنەی هەڵوەشاندووم و لەباتی مەرهەمێ
وردە وردە، ئەو تەداوی من بە ژەهر و سەم دەکا
یار بە ڕۆژێ گەر بکا قەتڵی سەدان، ناڵێن چ بوو
من لەسەر یەك جامی مەی، وا عالەمێك لۆمەم دەکا
ئەو، لەساتێ سەد کەرەت گۆڕینی جلکی پیشەیە
من بە ساڵێ خەرقەیێکە، هێشتە سەرکۆنەم دەکا
هێندە گریاوم لە دووری تۆ، ئەگەر باوەڕ دەکەی
سەیری لێشاوی سروشکم، هەر لە بەحر و یەم دەکا
(ڕاجیا) ڕۆژی ئەزەل، من خۆشەویستی دڵبەرم
ئێستە پێی عارە ویسالم، خۆیی نامەحرەم دەکا[1].

١٩٣٦

(٣٢)

نازی ئێوارەی کە سەیری بەرزیی و ئەستێرە کا
بۆ تفەنگ ئاوێتنی، غەمزەی گیانم سێرە کا
تا لەبەر پێی کەومە سایەی ئەو چەم و باخچۆڵەیە
هەر نیازێکی هەیە، دڵبەر، بە حازر لێرە کا
پێکەنینی نیوەڕۆی کردمە پرووکانی فریو
بۆیە ئێواران خەریکە مردنم پێ گێرە کا!!

١- ئەم نیوە دێڕە بە پێی هەژمارکردنی پیتەکانی ئەبجەد دەکاتە (١٩٣٦).

تاقە ماچێکم بەسەر لێ خواست و، هێند پاڕامەوە
پێی نەبەخشیم، چۆن ئەبێ خۆی خاوەنی ئەم خێرە
کا؟! دەمژێنێ ئەو بەنازو، هەر بە نازیش دەمکوژێ
کێیە وەك من، خۆی بە تووشی ئەم بەڵاو تاوێرە کا؟!
چاوەکانی مەیکەدەی عیشقن، بەڵێ، لێی نابزووم
خۆ مەگەر عیسا وەکو من، خاوەنی ئەم دێرە کا
ئاگری بەرداوەتە ناو جەرگی (ڕاجی)، ڕوومەتی
داوی کوردستانی زوڵفی، تا لەمل ئەو شێرە کا!!.

(٣٣)

وەختە لە خەفەت بمرم، هەرچەندە کە ئەو سڵ کا
پەردەی دڵەکەم شەق بوو، من ڕەنگە کە بێ دڵ کا
تا ڕۆژی دوایی دێ، هەر دوای ئەکەوم ئاخۆ
لە کوێ کەمەری دەگرم، دەستم لە سەرو مل کا
تا سوورەتی غارم بێ، ترسم لە ڕەقیب نابێ
دەججالی بە نەفرەت بوو، با هەر کەرەکەی جل کا
پارەی جگەری مفتم، دەسکەوتووە تا ئێمڕۆ
نۆرەی حەسەنەی یارە، چاوی کە پڕی کل کا
مەی، میوەیی مێوێکە، عالەم لەمە سەرسامە
هیوایەتی مەیخانە، پڕ سەوسەن و سونبول کا
باخاتی درەوشاوی ئەو ساقیە لێو ئاڵە
ویستی بەچڵێکی خۆی، گیرۆدەیی چڵ چڵ کا
سۆفی لە دەمی مەی دا، داخی بە دەماخی دا
مێشکی لەسەرا دۆڕاند، خۆی تازە چ ئاقڵ کا!!

یار، بەندی دڵی کێشا، هەی قوڕ بەسەری موفتی
بێ قیمەتە، هەر پووچە، با هەر هەڕەشەی زل کا
ژەهری لە برین ناچێ، چاوی دڵی تا نەفرێ
(ڕاجی) لە خەمی کوردان، گەر خۆی بە مەسەل گڵ کا!!.

(٣٤)

بە تەمای سیمبەرێ مردمو هێندەم هەڵەکا
هەر خەریکە دڵی ئەم خەڵکە بە تووشی تەڵەکا
چاوە چاوی ئەوەمە، جارێ بە باڵای شابم
لێوی وشکم بە تەڕی، مەستی ڕوحی بێ پەڵە کا
نووری دیدەم کە لە زاخاوی خەوی پەرچەم بێ
ڕاستە پەروەردە ئەبێ گیان لە دوو چاوی بەڵەکا!
پێشڕەوی یاریە، بەزمی گوڵە، یار هاتە وەفا
هەر کەسێ عاشقو سەرخۆشە، بڵێن کۆمەڵە کا
هەرچی شێخو وەلیەو، لافی کەرامەت لێدا
سەری بوکتە وەکو مار، بیگرە لە کوچکو کەڵەکا
تەمبەڵی خوردو خەوە، هەرچی لە هۆزی وازە
هەر ئەبێ کاری بەدو، خۆی کەرو بێ حەوسەڵە کا
دڵی (ڕاجی) کە خەڵووزی ڕەشو بێ سۆزی گەلە
دڵبەری مەیلی نیە، تازە بە کێ تەشقەڵە کا؟!.

(٣٥)

دڵ، کاتێ لە ناو چیمەنی زوڵفانی ئەمەڵا
جارێ ئەکەیشتە بەری پێی، جارێ لە باڵا
وەختێ بە خەتو نوختەیی خاڵ، قاقەزی ڕووی هات
کێ بێ لەسەرو کوڵمی نەوەستێ بە موتالا؟!

بڕوانـــه نمـــی ئارەقـــە، گەرمایـــەتی شـــۆخم
ســـەبریکە، دەم و لێـــوو مـــەم و ســـینەیی واڵا
بـەم لەشـکری خـەم، فیرقـەیی خـاڵی نەشـکا بـۆم
چـۆن دێتـە شـکان پـۆلی، لەگـەڵ قامـەتی ئـاڵا
هاوخوێنەکەمـــە پرســـی، لـــە ڕۆژانـــەیی ماچـــان
هـەی کاکـە لـە ڕۆژ چیتە؟ تـۆ لێمپرسـە لـە سـاڵا!!
مـن هـەروەکو مـەجنوونم و، سەرگەشـتە لـە دەشـتان
ئـەو هـەروەکو لەیلایـە، کـە دانیـشتووە لـە مـاڵا
هـەر ڕەش بـەوە، دووبـارە بـسووتێوە تـۆ (ڕاجـی)
قـەت حاڵـەتی تـۆی نایەتـە بـەر چـاوی خـەیاڵا.

(٣٦)

سـەحەر پـەردەی لـە ڕوو هەڵدایـەوە، تـا دیـدە ڕەوشـەن کـا
دڵـی پـڕ ئـارەزووی ئێمـە، بـە ملیـۆن ئـارەزوو بـەن کـا
شـەقامی هاتوچـۆی ڕۆژێ، بـە ڕۆژانـەی خـەیاڵی خـاو
ئەوا هـەر بـێ موهەنـدیس مایـەوە، بـا هـەر خـەتێ چـەن کـا
لـە گـۆکردەی سـەمادا، ڕێگـەیێکی ڕاسـت ناکێـشرێ
لـە دونیـا تـا قیامـەت، گـەر هـەموو فیڵێـك لـە دەربـەن کـا
وەکـو هێـزی تەشـی، تـا بـای نـەدا دەسـتێك و لاڕانێـك
خـوری ناکـا بـە ڕیـس و، نایـەوێ فەبریکـە تـەن تـەن کـا
هـەوای ڕاگرتـووە، تـاکو نەسـیمی زوڵفـی دەنگێـوێ
خەتای کوڵمەی چییە گەر دڵ سـەری مەسـتی لەگوڵـشەن کـا!!
خـەتای کێیـە؟ تـەرازووی کـار لەنگـەو، لینگـە دەسـتارە
ئەلیـدرەم لۆکـە، سـا کـەی هاوتـای گـوززی تەهەمتـەن کـا!!

بەڵێ، باشە لەگەڵ خەڵکی ئەگەر پێوانە سەربگرێ
لەگەڵ سووکا، گران کەی هات، دەسی کێشان لە گەردەن کا؟!
بە تەئریخی جەهەنەم تێ نەماوم بۆ بەشەر، بەڵکو
لە ئاشیلکەی بەهەشتا، کێ هەیە خەروا لە تێچەن کا!
خەیاڵی میوەجاتێکە، پەلاماری هەموو کاری
لە بێکاری چ دێ؟ با هەر کەسێ نەوسی بە با شەن کا
غەریبم، تازە هاتووم، عارە، شەرمە، ئێستە نابزوێم
ئەگەر سەودایی رووتی‌و برسیەتیشم، سەر لە دیمەن کا
لە گریەو ناڵە وا تۆفان هەڵستاو، مێرگ‌و ڕەز شین بوون
بە ناوی چی دەچێ (ژیکۆ)، سەری سۆزی لە چیمەن کا؟!.

١٩٤٩

(٣٧)

گوڵم ناپشکوێ، ئەم باخچەی دونیایە دڵ ون کا
بە هاوارێک‌و بانگێ، ئەم هەموو چەرخە سەرەوبن کا
سەرت سوڕماوە تا سەیری شتی گەورەو فشوفۆڵ کەی
مەگەر نەتبیستووە، یەک زمڕڕە، دونیایەک لە مردن کا
بە زانین داخرا تەندرووری ژین‌و، عەقڵی لێدەرکەوت
لە شەو سەرمای جەهالەت، بۆچ سەرو لاقی لە بەستن کا؟
کە پێپلکەت نەبێ، سەرناکەوی لەم بەرزە بێ ڕێیە
بەخۆ هەڵدانی، ئینسان، بۆچی خۆی وەک گیسکە گنخن کا؟!
ئەمن تۆقم لە پێتا، تا بڕۆی هەر دەنگ‌و ناڵەم دێ
ئەگەر ئازایە دەستت، با ئەویش خۆی پڕ لە بازن کا

هـەزار داس و چـەکوچ گیرانـە دەسـت و، دانەمـەزرا ژیـن
چ خوا بەرداره ئێمە جووت بـە گاسـن، ئـەو بـە ئاسـن کـا؟!
لـە لایـێ ئـاگرەو شـالاّو ئـەهێنێ، لایـێ دەریایـە
دڵـم بـۆ تـۆ زەرەر نابەخـشێ، گـەر سـووتاوو گـەر خنکـا
ئـەوی برسـی بـووه بـەم دەردی عیـشق و سـۆزە، پێویـستە
گـوڵێرەی ڕوومـەتی ئێـوە ببینـێ و، ژینـی ئەوسـن کـا
ئـەوی لافـی ئـەدا بـەم ئاڵوواڵایـە، دوێنـێ شـەو
ئـەبێ ئیمڕۆکـە بـەرگی بێکەسـی و ڕووتیـشی چـڵکن کـا
مەگەر- با- یـی فەنایە، ئـەیزێوێ چـەرخی ڕەنگـاوڕەنگ
بە فەرمانی خەمە، شادی، ئـەبێ خـۆی ئـەنجن ئـەنجن کـا
ئەگـەر گـەش بێتـەوە گوڵـەی، بـە زەردەخەنـدەیی لێـوی
ئەبێ دڵ چەشنی خونـچە، ڕوو لـەناو گیرفـانی گوڵـچن کـا
لـە زسـتان و کرێـوەی بـێ دەمـاغی، ڕێ بـە هـیچ نابـەم
مەگەر نەکوژێتەوە (پشکۆ)، بـەهاری کـوردی پرچـن کـا!!.

١٩٤٩

(٣٨)

هـەتا مـاوە بـەهاری نـامرادی، مێرگـوزار شـین کـا
لـە ناڵـەی بولبـولان، باخـچۆڵەکانی گـشتی پـەرژین کـا
تـەنافی ڕیـزە ڕەز لێـداوو دار سـاباتی سـەر بگـرێ
فەریك و تاڵەبـەر، هەریـەك، لەبەرچـاو ڕوحـی شـیرین کـا
زەماوەنـدی گـوڵان و بولبـولان، وەك ڕەشـبەڵەك بـادا
مل و گەردن، چەك و خشڵی بەرۆکان پوخت و نەخشین کـا

ترومبێـل و فرۆکـان بێنـەکارو، خـەت بکێـشرێن بـاش
لە مەیدانی خەباتا، هەرکەسێ بێ ئەسپی خـۆی زیـن کـا
کەسـێ، گـەر بەرژەوەنـدی کـاری دڵـداری نـەدۆزێوە
لە ڕۆژی ڕوونی شەودا بێ، لە خـەودا دەس بـە نـاڵین کـا
ژیـانی خەڵکـە بـەرماوەی مـن و، ژینـیش کـە ناناسـم
چ خاوەن باوەڕێ بێ، عەقڵی ناسەرسەنگی سەنگین کـا؟!
بڵـێم ناشـیرنم ڕەنگـە لـە باوەشـیا بنـووم ئـەمما
کە پێی ناگەم جوانم، چاو ئەبێ سا کـاری دووربـین کـا
بەرانبەر هەیتوهووتێ، گەر بوەستێ گـون بەدەستی ڕووت
ئـەبێ کـاتی هـەرا باسـی تفـەنگی لوولەچـەرمین کـا
کوڕی کوردم کە دی عاشق بووە، بانگم کرد: کچە کوردە،
بەلاّ ئاگاتە ئـەو یـارەی، کـە یـادی سووری چاوشـین کـا
لەمێـژە، هـەر ئـەڵێم باسـێکی لاجـانگی شـکاوت کـەم
بەڵام بیستوومە هەر کەس باسیکا، خۆی کفن و تەڵقین کـا
ئەوا سەرماو شڵێوە عـەردو بـەردی بەسـت و، شـەختەن دڵ
بـەناخێری گیـانی، تـازە (پـشکۆ) کـاری هـاوین کـا!!.
١٩٤٩

(٣٩)

ڕەمزی بـێ خـاوەنم ئەڕشـایەوە، تڵماسـکی پـڕ خـون کـا
بەرو میوەی بـە شـیرینی ئەوەسـتاو ئێمـە جـون جـون کـا
سەراپەردەی شەهی، مابەینی چوارباخی کە ڕەوشەن کـرد
ئەبێ ئاسـکۆڵە ڕاوێـژی لـە قەسـرو حـەوش و هـامون کـا
بەبـەر چـەخەی هونـەردا تێپـەڕێنن، دەوڵەمەنـدو ڕووت
یەکێك زێڕان لە بن عەردو، یەکێك زێڕان لـە گـەردون کـا

لە مەیدانی کریّ، بانگ ڕائەهێڵێ هەر سەحەر، بولبول
کە ڕۆژیش هاتەدەر، هەر چاوە دێ، فرمێسکی گوڵگون کا
نەهێڵم چاکە دەستم بەربدا، ئەو شۆخە شیرینە
هەتا ئاگر لەناو چاوم ئەخاو، مێشکم لە هاون کا
ئەمن بێژینگە خاکێکم، بە باوکی لەندەنی نادەم
ئەگەر هۆزی هەژاریشم، هەزار نەوڕۆزی لێ ون کا!!
بڵێ فیرعەونە میسری گرت‌و، نێری کوشت‌و، مێی بەردا
ئیتر، بۆ جوولەکەی مە کێیە؟ وەك موساوو هارون کا
زەمانی پیرو جاحێڵیم، خەریکی ماچی لێوی بووم
کە لێوم پێوەنانووسێ‌و، ددانم لێوە مەمنون کا
وەکو مندالّی ناو سك، هەر مژیەو، تامی نەمزانی
ئەمێستا تاڵ‌و تیژی دێ بە گژما، چاوی خاتون کا؟
ئیتر کێیە لە دونیا، تەختی یارو بەختی واژوون بێ؟
وەکو من یاری شیرینی، زمان پڕ عەترو سابون کا
سەری شادی نەئێمە عەردو، پەیمانە هەتا ماوم
دڵم هەر هاموشۆی بازاڕی بیری بەرزو سەرجون کا
نەسیم پشکۆژەکانی سەرچڵانی داچڵاندن لێم
بە ناوی داری گەندەڵ، تازە (ژیکۆ) سەر لە پشکون کا!!.

١٩٤٩

(٤٠)

نۆش بکە ڕاوی دڵ‌و، پڕکە پیاڵەی تەقەلا
فڕکە بادەی عەرەقی قەوم‌و، مەترسێ لە بەلاّ
باخەڵت فوودە لە سەد جۆرە نوقودی هۆشت
ڕووکە هۆدەی ئەدەب‌و، بگرە زریزەی عوقەلا

سەری مەستت بەخولاّ، بەهرەوەریت ئەنوێنێ
هەروەکو کوێرەوەریت، سۆز ئەهێنێ بە دلاّ
شۆخ و وریابە لەناو کۆمەڵی خزم و یاران
تاکو دانەی دڵەکەت، ئەو کچە بیخاتە ملا
ئەم هەموو تاوو تریسکەی لەبی کوردانەیی تۆ
چاوی پڕ سورمەیی ڕوونـاك ئەهێنێ بە گلا
شەنگەبی و، شۆڕە سەروو، تازە نەمامی ئێمە
شۆخ و سەربەرزو جوان، قامەتی پۆشی بە گەلاّ
بێ بەرن، گەرچی وەکو گەنجی خێرەدمەند، بەلاّم
بەری سەر سینەیی یاران، لە بەرانبەر ئەسەلا
زۆرو کەم پێکەوە بن قەومەکە، بۆ دڵداری
ڕێ بڕۆن، پێشبکەون، تانە مەکێشن لەگەلاّ
ڕووکە سەرچاوەیی کوردانە، بشۆ، سا سەرو چاو
(ڕاجی) هەڵبێنە دوو چاوت بە سەرو ڕووی مەسەلا!.

(٤١)

چاوی ئاهوویی خەتا، زوڵفی وەکو چەنبەری لا
سینە پڕ سەیرو سەفا، دوگمەوو مەم، قاوەوو چا
گەردەنی بەرزە، وەکو لالەوو مینا بێڕەنگ
خاڵی وەك دانە هەنارو، خەتی ڕەنگینی تیا
پەرچەمی دەستە بەدەستە، کە بە گژ کوڵمە ئەچن
دیدەیی هەڵقە بە هەڵقە، دڵی ئەم خەڵکە ئەبا
ئاگری گەرمی سەری کوڵمی، لەدڵ هەڵئەگرێ
باوەشێنیشی لە دوولاوە بە ئەگریجە ئەکا
بە تەمابووم بگەزم لێوی، وەکو نوقڵ و نەبات
سەرنخون بووم و، لەپێ کەوتم و، ماوم لە تکا

بەچەکوردم بووەتە بووکی تەرو سازی وەتەن
بە رەقیبم بکەیێنن تەرەسازی بخوا
(راجی) ئاوارە مەبە، ماوە بە دیداری بکەی
بمژی لێوو دەمی، دەستت وەرێنی لە ملا.

(٤٢)

یار، ئێستە لە رێ دیتمو خۆش تێمەوە راما
رۆحی لەسەری زوڵفی گرێدامو، بە جا ما
ئەگریجەوو پەرچەم، کە ئەپۆشن گوڵەکەی رووی
شەوقی لە شەوی ئەم دووە، وەك رۆژی سەما ما
ئێشکچییە جانم، لە دەری حەزرەتی دڵبەر
سوڵتان بە هەوەس بەزمی لە دیوانی سەفا ما
ئەی نابەڵەدی قورعەیی رەندانی خەریکماو
بۆ چارەسەریت، خارو جەفاخانە بە پا ما
تا لەشکری خەت بێنە سوپەرخانەیی کوڵمەی
قەت کەس نییە دەربازی رچەی کوشتن و عاما
ساقی وەرە بەم ئاخری عومرەم بکە فریا
رەنگین کە لەبی خەندەوو، گەردوش دە بە جاما
تێشوویی گەیشتن نییە (راجی)، وەرە بمرە
مەروانە لە کاروانی دوعای ترس و رجاما.

(٤٣)

ساقی وەرە تۆ پرکە پیاڵەی سەرو سیما
قَدْ صِرْتُ علی البابِ فَقیراً وَیَتیما
بۆ رۆژی قیامەت لەهەموو جۆرێ ئەبوورم
إنْ جِئْتَ إلَیْنا بِلآلیكَ نَعیما

عـومرێکی درێـژم بـە هـەبا سـەرفی غـەمت کـرد
فـــآنْظُرني لأن كَيْـــفَ تَـــرى العظْـــمَ رَميمـــا
کەوتوومەتـە نـاو داوی بـەڵای زوڵفـی بـە پێـچت
وَكُلْـــتُ عَلـــى اللهِ حَـــسِيباً وَكَريمـــا
ئـەو نێرگـسە شـەهلایە، ڕفاندوویـە دڵـی زار
لا تَقبَـــلُ عَينـــاكَ مَـــعَ القَلْـــبِ قَـــسِيما
سەرچاوەیی کەوسەر، کە لـە چاوی تـۆ بەدەرکـەوت
مَـــنْ تـــارِكِ عَيْنَيـــكَ فَقَـــد صـــارَ نَـــدِيما
(ڕاجی)، بـە هـەموو دەم کـە دەسووتێ بەتەماشـات
فَآرْحَمْـــهُ مِـــنَ اللهِ، وَأوْصِـــلْهُ زَعِيمـــا.

(٤٤)

تورك و، عەرەب و، هینـدو، حەبـەش، چـوونە تەمـەننا
چـین و، یەمـەن و، مەککـە، پـڕن نـووری تەجـەللا
تـا حاشـیەیی زوڵفـی، لەسـەر ڕوویـەڕی ڕوو بـێ
دنیـا لـە نـەزەر حـەللی ڕمـوزی، عـەدەم ئاسـا
جیلـوەیی ڕەحمـە، سەرچـاوەیی ئـەنواری ئیلاهـی
خەنـدەی دەمـی نـەوبادەیی بوسـتانی تەماشـا
هەڵقەی سـەری زوڵفـی، بـە هـەوای سۆزشـی عالـەم
وەسـتاوە لەسـەر گـەردەنی، وەك لالـەیی بـەیزا
شـەمعێکە ڕوخـی، بـۆ شـەوی خـەم هـەڵبووە ئێستا
پەروانـە، بـەڕووی شـوعلەیی ئـەو شـەمعەوە سـووتا
خـاڵانی وەکـو لەشـکری زەنگیـی، بـە فـریم
وا مەرکـەزیان ناوەتـە سـەر تـاقی موصـەللا

(ڕاجـی) مـەدە تانـە، لـە دوو چـاوی بەڵـەکی یـار
ئـەو مەسـتە، ئـەتۆ بێـدڵ و دێوانـەیی سـەحرا !!.

(٤٥)

کێـــشاویە هەڵماســـی بـــڕژانگی بـــە دوو لادا
موشـکی خوتـەنی داوە بـە دەم بڵقـەیی ئـاوا
خوێنـــاوی دڵ و ســـینەمی گێـــڕاوە بـــە خـــاڵی
کەشـتیی خـەتی بەرداوەتـە نـاو گێـژەنی ڕاوا
کوردێکـــە، چ مەردانـــە ئەنۆشـــێ دڵـــی بـــادە
کردوویـە هـەزاران سـەری پـەژموردە بـە داوا
بـڕژاوە هـەناوم، بـە هەناسـەی سـەری زوڵفـان
سـەد داخـی بـە جـارێکی چـزاندم بـە هـەناوا
ئـەی کـوردە! کـەلێ زارو شـپرزەم لـە وڵاتـان
بمهێنـەوە بـەر سـێبەری پەرچـەم لـە هـەتاوا
نـەمزانی، چـلۆن کـەیوە بـەری تـاڵی هومێـدم؟
کوردانـــە، هـــەوای شـــیرنی پێـــدا لـــە نکـــاوا
لـــەم خاکـــە بـــە هیـــوا ئەکـــەزم لێـــوی وڵاتم
هەر کـون بکـەمێ، کـورجی ئەکـەم دەسـتی بـەناوا
کومبـووم لـە کەسـوکارو هـەواو بـەزم و کەیـشتن
ڕابـــەر نیـــە ئـــەمجارە، دەرمبێنـــێ لـــە کـــاوا
(ڕاجـی)، بـە تـەما کـوردی قەڵەنـدەر مەبـە توخـوا
سەر شاری تەمای بگرن و، شـەی کـەن بـە گـزاوا[1].

١٩٤٢

١ ئەم نیوە دێرە بە پێی هەژمارکردنی پیتەکانی ئەبجەد دەکاتە (١٩٤٢).

(٤٦)

غەم و خۆشی دەزانی چۆنە؟ هەر ئەم دێت و ئەو ئەڕوا
بەڵێ دەوری زەمانە، لاغەر ئەمرێت و قەڵەو ئەڕوا
دەماغی من بە دایم پڕ لە بیرو شۆڕشی یارە
کە ساتێ بێ ئەوی نابم، جەهەنەم دێت و خەو ئەڕوا
بە عەکسی دەهرە تەبیاتی، بە ئەگریجەو ڕوخی ساقی
بە حوکمی دەستی قودرەت، دائیما ڕۆژ دێت و شەو ئەڕوا
دەنێ تەبعێ ئەوانەی وا خەرقەبارن بۆ ڕیابازی
وەکو داوی ویسالی یارە، بوم ئەگرێت و کەو ئەڕوا
عەجەب ماوم کە دڵبەر عادەتی خۆی وایە، یا قەستە
بە ئاهەنگی حودی نایا، بە وەحشی لاجەڵەو ئەڕوا!
کەلێ ئەمڕۆ لە یارم عاجزم، بۆچی؟ کە نازانێ
سەرو ماڵم لە من تالانییە، ئەمما لە ئەو ئەڕوا
ئەمن باوەڕ بە (ڕاجی) گەر بکەم، هەر هەقمە، یا نەیکەم
کە یاری قادیرە ئەمما، لەسەر گفت و شنەو ئەڕوا.

(٤٧)

خوویی ویم کەوتە سەرو، عیشق بە قووەت کە دوا
قۆڵی خۆم هەردوو دەرێنا لە کراس و لە کەوا
دڵی خۆم دایەوە هەرچەند بە دەسیسەو فڕو فێڵ
ئاقیبەت بازی دوو چاوی، بەخوا خستیە هەوا
لاوی کوردانەیی من، (دانس و پلەینگ)[1] ناکا
شووشەیی پڕ مەزەیی عیشق لەگەڵما ئەخوا
جارجارە کە بەیەك غەمزە دو چاو هەڵئەبڕێ
مەقتەتیسیکە، لەسەر عەردەوە ئەمخاتە سەما

---

١- دانس و پلەیینگ - ***Dance and Playing***: سەماو یاریکردن.

هێنده لەو قاپی یە ئەخزێم، دەس و دامێنی ئەبەم
ئاخیری، لەو دەمە ماچێکم ئەبینێ بە ڕەوا
هیچ هەڵنایە بەڕۆژ چاوم و، دڵ بێهۆشە
هەر وەهاش چاکە، لە ژێر تاقی بڕۆی بم لە شەوا
کونجی لێوی بگرەو، (ڕاجی) لە مەیخانە مەڕۆ
بیمژە بادەیی دەم، بۆ هەموو دەردێکە دەوا.

(٤٨)

لەبەر دووری، دڵم وەختێکە خوێناوی جگەر ئەخوا
سەرو داوێن و سینەم، ئێستە شالاوی سەقەر ئەخوا
ئەزانێ موبتەلاتە دڵ، ڕەقیبم، بۆیە ئێمرۆکە
بە سەد فریادو نافامی، ئەڵێن وا مێشکی کەر ئەخوا
خەیاڵم هەر لەلای تۆیە، بەچی باوەڕ ئەکەی بیڵێم
وەکو منداڵی ساوا، مەمکی قامیشی شەکەر ئەخوا
دەماخم وا پەشۆکاوە، بە شێوەی لەشکری زوڵفان
لە سەر مولکی مەلیك غازی، شەڕەر ئێسقان و سەر ئەخوا
بە چۆڵێکدا ئەڕۆم ڕێگای گەیشتن سەختە، نایزانم
ئەوەندەی ماوە ژین تێشووی تکای باس و خەبەر ئەخوا
هەموو عالەم ئەزانێ، دیدە شایانی نییەو، گریان
لەگەڵ ئەم لوتفەدا بۆچی سەروچاوی بەصەر ئەخوا!؟
لە دووری تۆیە ئاخ و داخ و گریەوو ناڵە، هەم دەر هەم
بە وێنەی گورگی برسی، جەرگی (ڕاجی) دەربەدەر ئەخوا.
١٩٣٩

(٤٩)

گوڵڕەنگی ڕوخت ڕەنگی بە سەد زوهرەوو مەه دا
خونچەی لەبەکەت لەعلی بە گەنجینەیی شەه دا

موشتاقی قەدو قامەتی ئەو یارە دیارەم
عومرو سەرو ماڵی منی، یەك دەفعە تەبەم دا
ئەو ڕاوکەری چاوت، بە کەوانی قەمفی ئەبرۆت
سەد مامزی تۆراوی، بە بەر چین و سویەم دا
خاتوونە، بە چەند نازەوە هاتۆتە تەماشا
وا پەنجەیی زیوینی، لەسەر چاوی سیەم دا
هەر جێ کە ئەچێ، هەر دڵ ئەباری بە نیساری
هەر کەس هەبوو وا عەقڵی بە قانوونی سەفەم دا
پڕ زام و برین، بێدڵ و سەرگەشتەم و، بێڕەنگ
تا دڵبەرەکەم جیلوە بە گوڵزاری نیگەم دا
(ڕاجی)، مەکە تۆ باسی مەم و زوهرەوو کەیوان
پاوەندی لەبی یارم و، من چیمە لە مەمدا!!.

(٥٠)

کوردی دەستە شکاو گەیشتە مۆمیا
کەر بوو، نەیهێنا بەکارو تێ ڕیا
نەوت و جەوتی زەوت کردی خەڵك و خۆ
خاك و خۆڵ و ئاوی بردی و پێی ژیا
دوژمنی گیانت ستاندی هەرچی بووت
شارو دێهات و سەراوردی چیا
هەر خوری تۆیە، کە ئەیکەن جەرمەنە
لۆبیاتە، ئەیکەنە فاسۆلیا
ناوی ئاوی بۆگەنت ناوە گەڕاو
ئەیکەنە گۆگردو باروت، ئەشقیا
خەڵکە زانینی لە باوەش کردو، تۆش
ئاخیری مێشکت ئەبا ماخۆلیا

پێکــەوە نووســانو، دوژمــن بــوون بڵنــد
تـۆش نـەوی بـووی، چـونکە لێکـدی بـوون جیـا
قــوڕ بەســـەر، قــەت ناگەیــە ڕۆژی مــراز
ئــەو ســواری ســەر هەوایــەو، تــۆ پیــا
خــاکی کوردســـتانە (ڕاجـــی)، ئــاخو داخ
ســـیمیاوو، فیزیــــاوو، کیمیــــا !!.

**

ب -

(١)

مـوژەت دایـم بـە خـوونی دڵ ئـەدەی تـاب
بـە تـیری ئەمخەیـە سـەد گێـژو گـەرداب
نـەما ڕەنگـی ڕووانم، ئـەی نـەزەرباز
ئـیتر نـابم لـە هیجرانـی تـۆ شـاداب
کـە کاکۆڵـت ئەلـەرزێنی بـە هیـوا
دڵـم دێنێتـە ڕووخـان تـاوی سـیماب
وەکـو تـۆ نـەبووە ئەسـڵەن دڵ فریـێ
بـە سـیحرو فیتنـەیی و تـەرتیب و ئـاداب
ئەگـەر نـەگرم بـە دامێنـی تـۆ، دەسـتم
چـلۆن دەسگیرە بـۆ ڕێـی وەسـڵ ئەسباب ؟!
مەپرسـە قـەت لـە حـاڵی جـەرگ و دڵمـان
کـە لێـت گیرکـردوون سـەد شـیش و قـوڵاب
چ هـەڵبگرێ خـودا لـەم چـاوە کاڵـە
کـە (ڕاجـی) دا بـە فـێڵ و جـەورو دولاب !!.

(٢)

دائیما شـایانی عیشقە، زەمزەمـەی چـەنگ و ڕوبـاب
ڕەقس و دەستوری تەشەووق، ساقیو دەست و شـەراب
دڵبـەرو شـاهید، لەسـەر تـەختی دڵا بگـرن دەمـاخ
ڕوو لەهەر لاین بکەم، سا بمکـوژن مەسـت و خـەراب
ئەی گەلی موفتی و نـەقیب و قـازیو سـۆفی و ڕەقیب
من بە خۆم دەمرم، چ حاجەت، ئێوە لێم بگرن عیتاب

هەر کەخۆی پۆشی لەقەسرو، وردە ڕەمزی خستەدەر
دێمە حاڵی حەشرو ناکێشێ دو زوڵفی بۆ جەواب
تا بە کوللی دەرنەچم، لەم خاکەدا ناگەم بە کام
خاکی غوربەت نەخشە، هێزم لێبرا، دڵ پڕ قولاب
هێندە زەرداتی لە شەش ئەترافەوە هاویتە رووم
أذهَبتُ عَني البَصَر، حَتّى تَوارَت بِالحِجاب
خودفرۆشیی کەس نەکا، تا دڵبەرم نرخی ئەکا
سەربەخۆ، ئاخر کە (ڕاجی) کەوتە حاڵی ئیزتیراب!!.

(٣)

ئەی سەنەمی نازەری دڵ پڕ عیتاب
بۆچی دەکەی ماڵی غەمریان خەراب؟!
شێوەیی ڕەونەق، بە بەهاران لیباس
کوڵمە وەکو نووری خودا، ئیلتیهاب
لەفزی دەمت، گەوهەری بەحری مەعان
خەندەیی تۆ، جیلوەیی مەوجی سەراب
زوڵفی ڕەشت، بوو بە کەمەندی دڵان
شیشەیی موژگانە لە جەرگی کەباب
سیحری دوو چاوانتە، عاشق پەسێن
ئەبرۆیی خوێنرێژتە، تیغی قەساب
دەستی وەکو لالە بە خوێنم ئەکەی
شاهیدە بۆ ڕۆژی قیامەت، خیضاب
ماچی دەمت، بیدە بە (ڕاجی) زەکات
زیوی ڕووان، کەیوەتە وەختی نیصاب!!.

(٤)

شۆخەکەم، ڕووی لە حیجابا بنوێنێ چ عەجەب!!
ڕەوشەنی، ڕۆژی سەما گەر بکوژێنێ چ عەجەب!!
غەمزەکەی چاوی پساندوویە دەمارو ڕەگی دڵ
گەر هوما ئێسک و تەنی باز بشکێنێ، چ عەجەب!!
زوڵفی چەوگانی جەفا، گیانی بە یەغما بردووم
شەق ئەگەر گۆیی لە مەیدان بڕفێنێ، چ عەجەب!!
عیشوەوو نازی، تەپاندوویە هەناوو جگەرم
لەرزە گەر خانەیی دنیا بتەپێنێ، چ عەجەب!!
پرتەوی نووری ڕوخی تۆیە، دڕاندوویە بەدەن
مەه ئەگەر بەرگی کەتانی بدڕێنێ، چ عەجەب!!
تا جگەر ئێشی چەکوچ کاریە، شاگردی دڵم
لە دەروون، کوورەیی خەم گەر بدەمێنێ چ عەجەب!!
ڕەمزی ئەبرۆتە، هەڵیکەندووە جەرگی (ڕاجی)
کارەبا، ڕیشەیی عەردیش بپسێنێ چ عەجەب!!.

(٥)

نووکی پێنووسم ئەوا خستمیە ناو شاری ئەدەب
گەرچی نەفرۆش و نەکڕ خۆمم لە بازاری ئەدەب
چونکە گیرفانم پڕە، وا دەس بەتاڵ داماوە ژین
تا زەمان ئەبڕێ لیباسی بیری هوشیاری ئەدەب
تێکەڵاوم کەن بە خاک و بەردەڵانی مافی کورد
تا موعەتتەر کا دەماخم، بۆنی گوڵزاری ئەدەب
هەر ئەدەب گەر پێکەبێنێ هۆزی دواکەوتوو لە شوێن
ڕەبی کوێریکەی دوو چاوی دوژمنی یاری ئەدەب

**خاکی کوردستان بوو کانی فەنن و زانست و ژیان**
**بۆچی بەختی نووستووە، لێی وشکە ڕووباری ئەدەب؟!**
**دوژمنم زۆرن، بە کوردی، نایەڵن سەر هەڵبڕم**
**تا بە سەربەستی بدا دەستم پەلاماری ئەدەب**
**ڕووی هونەر چۆنی ئەکا ئاوێنەکاری، تا ئەبەد**
**دیمەنی ئەسڕێتەوە هیچ کەس لە دیواری ئەدەب**
**هەر بڕۆ، تا شارمزاییت دەسکەوێ لەم خاکەدا**
**تا لە گوێی خۆتی ئەنووسی، یەك وشەی زاری ئەدەب**
**وا کوڵی (ژیکۆ)، لە چاوی بێکەسیدا هەڵقوڵا**
**کەس نییە گەر لێی بپرسێ، حاڵی بیماری ئەدەب!!.**

**(٦)**

**یارەکەی بادەگەرم دڵ دەرفێنێ بە ئەدەب**
**ڕشتەیی گەوهەری ڕۆحم ئەپسێنێ بە ئەدەب**
**شێخ لەناو باخی ڕیا، خۆی لە کەناری ناوە**
**گوڵ، بەهارێکە لەلای، ئەیچڕێنێ بە ئەدەب**
**زوڵفی ئەو شۆخە بە سەرشۆڕییەوە، وەکو زاهید**
**کوورەیی فیتنە بە عالەم ئەدەمێنێ بە ئەدەب**
**بەرگی عیززەت کە چ قەدرێکی ئەبێ، بۆچی بێ؟**
**بەدەنی بێ شەرەفی خۆی ئەنوێنێ بە ئەدەب**
**ڕازی دڵ بردنی من، بۆ دەری یاران چ دەکا؟**
**گەر لە بەر پێی هونەرا، خۆی ئەمرێنێ بە ئەدەب**
**یاری شیرین چ عەجەب قەدرو جەماڵێکی هەیە!!**
**ڕووحی پڕ دەردو خەمم، وا ئەنوێنێ بە ئەدەب**
**شەهی ئیقلیمی جوانی بوو، لەسەر تەختی مراد**
**هەر بە ڕووی دەوڵەتی لەم تەختە ئەمێنێ بە ئەدەب**

تــاکو عیــبرەت بگــرن، تازەجــەوانانی چــەمەن
لەسەر ئەم سەروو مەهە، موو ئەخشێنێ بە ئەدەب
نیــەتی قیمــەتی ماچــێکی حەبیبــەی، (ڕاجــی)
مەر لە قــاپی کــەرەمی، لێــی بستێنێ بــە ئەدەب!!.

(٧)

ئەم چاوە خومارەی، چ عەجەب دڵگرە یارەب!!
ئەو قامەتە شۆخەی، چ عەجەب ئەنوەرە یارەب!!
پێویستە کە بێم سەیری جەماڵی کەمو بمرم
ڕەحمێ بکە من بێمە سەر ئەم مەنزەرە یارەب
شادم بە سەبەب بادی سەبا، زوڵفی کە لادا
یارەبی ببۆسم ڕوخی ئەم دڵبەرە یارەب
سەد ئاه و ئەمان!! بێکەس و خونخوارو زەلیلم
فریامکەوە لاچم لەسەر ئەم مەجمەرە یارەب
وایزانی ڕەقیب، دۆست ئەکەم تەرك لەبەر ئەو
هەی هەی لە ڕەقیبم چ حەسوودێ کەرە، یارەب !!
چەند چاپك و لاوچاك و، بەدەن نەرم و جوانە
حەیرانە دڵم، کەی بووە ئەم زیوەرە یارەب؟
خۆت گەورەوو ساحێب بە ژیان و بە هیلاکی
(ڕاجی) کە ڕجای وەسڵی هەیە لەم دەرە، یارەب !!.

(٨)

تێکەڵێ بەخاکم ئەکەم، فرمێسکی هیوا تەڵەب
تا سەوزو سوورو شین کا، گوڵیش بپشکوێ جەلەب
ڕەحمەت بباریێ بەسەر باخ و ڕەزو مێرخوزار
دونیا درەوش بخاتە هەموو لا بە ڕۆژو شەب
چاو هەڵبڕێ گەل هەموو، بە لێوی پڕ پێکەنین
قاپی لە خۆی دابخا، خەزێنەداری غەزەب

خێوەت بە خێوەت بڕۆن، لیـژمن بـە لیـژمن بکـەن
مەبەست کاردروستی بێ، لەڕێی پەروەردەو ئەدەب
کەس نالەباری نـەوێ، کـەس ناهـەقی هـەر نـەکا
هەر کەس ڕەوا کا بە خۆی، ڕەوشتی شیرین مەزەب
چەند خۆشە بێ پرسیار، بدەی هەموو کـەس وەڵام
لەگـەڵ نیگـاران کـەوی، دوورە بـەڵاوو نەکـەب
هەرچـی بـووە بـێ ڕەزا، نـەبێ لـە خـەڵکی قـەزا
چەوت و چەوێڕ ڕاست ئەبن، گوڵ دێنە سەر زارو لـەب
هەرچـی قـسەی لێبکـەی، بـە نیـسبەتێک تێکـەڵاو
ببرە ڕەگـی ناحەزی، لـە دەنـگ و ڕەنـگ و نەسـەب
بەهەشـتی کێـوان وەکـو زەمـانی زەردەشـتەکەت
بژێنـەوە بـۆ گـەلت، هـەنارو سـێوو عەنـەب
خـاوێن بـشۆوە دڵـت، بگێـڕە کـارو مـشوور
وەکو(سکەندەر) بـڕۆ، سـەبەب بخـە دوای سـەبەب
کـە هێـزی بـاوەڕ هـەبێ، بۆچـیتە ئـاتۆم و تـۆپ؟
بەشەر کە زۆڵ دەرنەچێ، هەر خۆی ئەبێ موتەخـەب
سـەبا بـەگورجی وەرە، بڵاوکـەوە بـۆنی خـۆش
بـە تـۆ کـەش ئەبێتـەوە، باخـاتی کـوردو عـەرەب
گـەر ئەتـەوێ سـەرکەوی، دەسـتکە بـە گیرفانتـا
بەخێوکـە ڕووت و هـەژار، لەناوبـە لۆمـەو لەقـەب
(ژیکۆ) لە چاوی دڵان، جێ لـەق بـووە چـاوەکەم
چونکە کـوڵاوە لـە هـەق، دڕاوە گرتوویـە تـەب !!.

١٩٦٠/١٠/٥

(٩)

تـازە بـەهاری گوڵـە، ئـەی بـوتی شـیرین تـەرەب
هەسـتە بـەڕووی سـۆزەوە، بـادە بـدە لـەب بـە لـەب

شێوەیی باڵای ئەتۆ، نەبووە لە باخی کەسێ
شۆخ و تەڕو بێ گرێ، ئەی سەنەمی خۆش لەقەب
مەستی خووی خۆشییە، چاوی سیاهت کەوا
فیتنە نوێنە بەدڵ، قەت نییە خاڵی لە تەب
بولبولی باخی وەفا، تووتیی سەبرو سەفا
کەوتنە داوی جەفا، وەختە ببن بێ ئەدەب
دەوری بوتی کوردییە، ڕۆیون شێخ و مەلا
گشتی لە دین وەرگەڕان، فارس و تورک و عەرەب
دەفعەیێ مەیلی نەبوو، پرسشی حاڵی ئەسیر
پەردەیی ڕووی لانەچوو، کەوتمە بەندو تەعەب
هێندە تەماشا بکەم، ڕەونەقی چاوم نەما
ئەی دڵ ئەگەر چوویە لای، بۆی مەکە باسی مەزەب
کەس وەکو دوو چاوی ئەو، مەیلی لە ئافەت نییە
لای وەیە لەم ئاگرە، تێ‌ئەکەوێ (بوولەهەب)
سەرفی بەری پێی بکە، جان و جگەر، ماڵ و سەر
غەیری ئەوە (ڕاجیا)، سوودی چییە ماکەسەب؟!!.

(١٠)

زامی سەختم کردمی ئاتاجی نازان و تەبیب
چاوەڕێی دەرچوونە دڵ، لەم خەستەخانە وەك غەریب
گەر سەرو ماڵم بدەم، سا جێگەیەك پەیدا ئەکەم
هەڵبدەم بەیداغی ساغی کوردی بێ سەبرو شەکیب
تا لە ژێر باری خولامیی، شانی هێزم داخزێ
ناگەمە ئاواتی بەرزی هۆزی دەسکاری ڕەقیب

شــاهیدی زۆرن ولاتــی مــن لــه چــاخی نووحــەوه
شـای ولاتانـه، کـه عالـەم هـەولْ ئـەدا بیـدا فـەریب
چـونکه نەمبرزانـدەوه، ئـەم زامـه کۆنـەم هەڵوەشـا
ڕەنگی ناشـۆرێتەوه، هـەر جێگـه قـەترەی بـێ نەسـیب
مـن نـەبم، ئـەم کائیناتـه گـشتی ڕێککـەوتوو ئـەبێ
شەڕ لەسەر شوێنی منه، پڕ کەن لەوی، گیرفـان و جیـب
ئـەم هـەموو میراتـه جێهێـشراوه بـۆ ڕۆڵانـی کـورد
وا بـووه ئـەیتام و کەوتـه بـەنك و بـازاڕی عـەجیب
بۆچـی تیمـارم نـەکا، ئـەم گیـاوو گوڵـەی نەوبـەهار؟
بـۆچ کـەژو کێـوم نەکاتـه ئاسمـانی پـڕ لـه زیـب؟
عـادەتی ڕۆژانـه شـاه و دەوڵەمـەن بکـرێن هـەزار
هۆزەکەی تۆش دێته ژێن لەم پێچه (ژێکۆ)، عەمن قەریب.

١٩٦٠/١١/١٤

(١١)

ئەی عەزیزان، وەرنه سەیری سۆزی ئەشعاری غـەریب
تا له حەلقەی بێکەسیدا، بێمـه سـەر سـەبرو شـەکیب
نامەوێ جەننەت لەگەڵ هیجراتی تـۆ، ئـەی نـازەنین
بۆ جەهەننەم حازرم، گەر وەسـڵی ئێـوەم بـێ نـسیب
پەرچەمت دەوری لـه گـەردن داوه هـەروەك ئـەژدیها
دوو تەلیسمی چاوو گـەردن، بوونـه ئاسـاری عـەجیب
لالــەزاره، خونــچەباره، نەوبــەهاره ڕوویــی یــار
سـەبزەواته، هـەم نەجاتـه، ئـەم بەراتـەی زۆرو زیـب
زۆر گەڕام و چاوی خـۆم گێـڕا لـه دنیـا، بـۆ کەسـێ
موتلەقەن نەمدی وەکو تۆ، شـۆخ و سـەربەرزو نـەجیب

دڵبەرێکی چاوخومارو، موشك زوڵفو، شوعلە ڕووی
سینە سافو، دڵنەوازو، جانگودازو پڕ عەتیب
قەت بەسەرهاتت لە ڕێی عیشقا لەلای کەس ناکرێ
(ڕاجیا)، لاچۆ لەلای پیرو مەلاو شێخو نەقیب!!.

(١٢)

وەختە بمرم لە فیراقی لەبی گوڵناری حەبیب
خوێنی چاوم وەکو باران، دەڕژێ سەر بە نەشیب
تاکو سینەم نەڕژێ من بە شەپۆلی فرمێسك
نافڕێ تەیری حەیا، بۆ قەفەسو داوی صەلیب
سەبەبی مەرگمە، دەسماڵو حیجابی سەرو مل
چ بەهەشتێکە لە ژێر وانەوە بۆ شەوقی غەریب ؟!
من لە ڕێگایی ڕجا بەندمو ناگەم بە ویساڵ
سەد هەزار هێندە بەلای گەورەترە داوی ڕەقیب
پاسی وەسڵم هەبوو بۆ گەنجی قەدی دڵدارم
ڕێی نەدامێ سەگی هەوشاری ڕەقیبم لە حەجیب
جانو دڵ بێ بە فیدای پەرچەمی پڕ پێچانت
دەمو لێو بێ بە فیدای جامی لەبو لێوی لەبیب
دڵی خۆت سادە بکە، تۆ لە هەموو گەردو غوبار
(ڕاجیا) بەستە ئەمە، عیسمەتە بۆ ڕۆژی فەریب !!.

-پ-

(١)

ئەز دەڵێم سێوو تری، نابێژمە تۆ (ئەپڵو گراپ[1])
من قوتابخانەی ئەنووسم، گەر (سکوڵا[2]) دەن لە چاپ
ناوەڕاستم ڕۆژهەڵاتو، ڕۆژئاوا دوورە لێم
عەدلەکارم، کوردی سەربەستم، ئەگەر نەمکەن خەراپ
خاوەنی هەر پیاوەتیو مەردایەتیو دیوانی تۆ
بگرە یارو، زوو لە دوژمن داخە قاپیو، داگرە قاپ
وازمەهێنە قەت لە ڕاستیو، کەس لە ڕێگا لا مەدە
نایەوێ کوردی، دروشمی نارەواو نارێکو لاپ
هەر کەسی بێگانە هات، ئامۆژگاری تۆ بکات
لێدە، تێی هەڵدە بە شەق، ئەو دوژمنێکە پڕ قولاپ
چونکە تۆ ئاوێنەدڵ بووی، کەس شەپرزەت با نەکا
هەق، لە بیرت گەر نەچێ، نابەن زەفەر شەیتانو پاپ
گەر لە گوێی ئەگری براکەم، با قسێکت پێ بڵێم
هەرچی شۆپی گەورە بێ، تێری ئەکەن شەپلاخو شاپ
ڕۆژو شەو، چەرخو زەوی، بۆ تۆیە ڕێکوپێک بێ گەر
تا بە نارێکی بڕۆی، هەر چاو بە تۆزیو دڵ بە تاپ
من کە بۆ ئازادیی کوردان، گیان لەسەردەستو فیدام
یەکدڵو یەکباوەڕم (ژیکۆ) ئیتر بێ لافو گاپ.

---

١ ئەپڵو گراپ (*Apple & Grape*): سێوو تری.

٢ سکوڵا: مەبەست لە وشەی (*School*) ە: قوتابخانە. خوێندنگە.

(٢)

باڵق و فامیدە بووم، ناسیومە دەستی ڕاست و چەپ
لێمکەڕێن ڕێی خۆم ئەزانم، باش و بێ شاباش و گەپ
هەر کەسێ بیرێکی ناشت و، خۆی لە خەڵکی شاردەوە
بێ چرا ئەیدۆزمەوە ڕەنگی دزان و چەوت و تەپ
چۆن قەڵەو بێ گیسکەکەی خاڵە هەیاسی گورگە ترس؟!
چۆن ئەبێ دووڕوو ڕەهایی بێ، لە داوو قیر و قەپ؟!
بازوویی مەرگ و هەژاری، هێندە پڕ هێزەو درێژ
چۆلەکەی دڵ دەرئەهێنێ، لەم کون و لەو کون بە لەپ
ئەهلی دڵ، بڕوانە ئاتۆم و ئەکسی مانگ و خۆر
شارەزابن کاری وەستای بێ چەک و بێ تۆزو تەپ
خاوەنی بیر و زمان و نیشتمان و یانە نین؟!
ئێمە وا بۆ مەشکەژێنەی خەڵکە بووینە لۆرەلەپ!!
ئەو زەوی خۆی جووت ئەکا، بەو هێزو باوو ئاگرە
ئێمە هەر ماندوو ئەبین، بەم گاسن و هەوجاڕو هەپ
نەگبەتی ئەم باوەڕە، خستمیە بەر داری فەنا
ڕایەڵەو دواکەوتنم، گرتمیە کۆشی شاپ و شەپ
بەسیە (ژیکۆ) وێنەبازی و تەون و بازاڕی قومار
زەوتی کردووی فێڵی سووری چاوزەقی مل قیت و ڕەپ!!.

**

-ت-

(١)

چاوی هەڵنەبڕێ بە دووسەد نازەوە دڵ کا خەڵات
هەر خەڵاتێکی هەزار تیری موژەی پێوە ئەخات
سینەیی سینی، ئەڕازێنێتەوە نارنج و سێو
تا بە نارنجۆکی مەم بکوژێ سەرو، بگرێ وەڵات
لێو، شەکەرخەندەو گوڵ و یاقووتی لێ بارکردووە
بۆ دڵی عالەم ڕفاندن، دائەنێ خێر و بەرات
ئاسەواری بڕیەوە، هەر خۆشەویستێکی هەبووی
چی لە شاهی گرژەڕوو کا، نۆکەری بێ دەستەڵات؟
وەک هەوەڵ شاقاوم ئاویتە خەتی دڵبەروەری
خۆم بە جارێکی دەراویتە دەری سەبر و سوبات
چاوی کاڵت شەربەتە، یاخۆ شەرابی مەستییە؟
یانە قاوەی شیرنی مەرگە لە فنجانی نەجات؟
ماری ڕەشپۆشن دوو زوڵفت، یا شریتی دارەمەیت؟
یا سویچ و وایەری گوڵمەن لە شاری ڕۆژهەڵات؟
قەت بەهای ماچی تەواو نابێ لە عالەمدا بەکەس
وا مەلەک ڕۆژی ئەزەل تا ئێستە هاتوونە مەزات
من لە ئەم دڵدارییە دیتم جەهەندەم دوورییە
پێکەیینی جەننەتە، بخوازە گشتی موشتەهات
خوازەرو خوازراوو تالیع، عاقیبەت پیرۆزییە
وەرگەڕاوو زوورو دەر، سابیت بە هاتی کارەسات
ڕەملی من وێنەی تەرازووی کارە، ئەیکێشێتە ڕوو
خاڵ و خەت ڕەمزن لەجێ، چیکەن بەنات و ئومەهات
خۆڵەمێشی خەم لە ڕووتا بسڕە (ژیکۆ)، کەشبەوە
سۆزی ڕاستی خۆت نیشاندەو، هیچ نەبێ پێچ و پەنات.

(٢)

یار لە نەشئەی پەنجەرەی زوڵفی، کە کوڵمی دەرئەخات
هەرکەسێ کە تۆ ئەبینێ، خەم بەسەر خۆیدا ئەکات
دەم، بە نازی لێوەکانی ئەتڵەسی پەڕ دەر ئەکا
ڕۆح و جەرگ و دینی عاشق، گشتی بێ مینەت ئەبات
چاوەکەی تیری لە جەرگم داوە، چۆن شیوەن نەکەم!!
مەرحەمەت فەرموو نەجاتمدە بە ماچێ، تو خودات
بەس بفەرموو، تۆ ئەسیری موسلیمی خاڵی منی
من لە کوشتەی چاوی فیرعەونم، بە ئەمری زوڵفی لات
شاهی حوسنی تۆ تەرەققی کردووە، فەرزینی مەن
دەست و پێ بەستوو لە داوو، شاهی بەختم بۆتە مات
ئەمری ئەبرۆتە بزانم جەلبی دڵمی کردووە
یانە ڕەحمی زۆرە، دڵ بیمارە، چاوت هاتە لات
گەر لە ڕێگا ئەتگەمێ، نازت قەرزدارم ئەکا
بۆیە گەر لەنجەی ئەفەرمووی، لەعلی ئەشکم دێتە پات
مەن ئەزانم تۆ لەمن تینووتری، ئەمما ئەبێ
بۆ جەفای دڵ، شاهی چاوت زاهیرەن بگرێ وڵات
موددەتێکە عەیب و عاری ئێمە (ڕاجی)، هەمدەمە
چونکە سەرخۆشن دڵ و جان، پا بەجێ نین یەک سەعات.

(٣)

دیمەنی کێوانی کوردم کرد مەزات
تاکو دامالام و ئەمما دەستەڵات
ڕەنگی گوڵزارانی بەردی ئابرووم
ڕۆژی ئاواتم بە ڕوو زەردی هەڵات

هێنده گریاوم له تاوی مافی کورد
تا له چاوم هەڵقوولان دیجلەو فورات
هۆزی من، هێزی له دەست بێگانە نا
تا رەگ و ریشەی بە لاوازی دەرات
میرو ئاغاو شێخ و بەگ، هەریەك لە یەك
رایەڵێکی هەڵبڕی و کوشتی خەبات
مێشکی بردم، قاوە قاوو جاوە جاو
پیری کردم رێگەیی هات و نەهات
ئەی خوا خۆ دوژمنی ئەم هۆزە نی؟
بۆچی وا پێی وەرئەکەی میکروّب و لات؟
تا بکێشم رەسمی سەوزو سووری کورد
هەر خەریتەی زەردی دەردێ، یا سپات
قامەتی شۆخی بە بیر سەودا ئەکەم
تا هەڵێنم پێی، سەرو چاوی وەڵات
تاکە سەردارێك بوو، ئەیگێڕا مشوور
ویش، کە هەر چاری نەما دوو جار هەڵات
هەستی بەرزی پێ ئەکا دوژمن ئیتر
مەرجە تا تێکی نەدا، کارێ نەکات
بەسییەتی (ژیکۆ)، ئیتر هاوارو بانگ
کێت هەیە دۆست و برا، بێنە پەنات؟!.

(٤)

دنیا چلۆن نواندی شۆرو نەوازو ئاوات؟
لایێ بە شین و گریان، لایێ بە رەقس و ساباط
یەك ئاقڵ و سیاسی، یەك جاهیل و پڕوپووچ
تێکەڵ بووە هەموو شت، لە شاران و لە دێهات

یـەك تـاڵیبی ژن و مـاڵ، یـەك مـائیلی نیفاقـە
یەك زۆر بەخیل و ئاڵچاغ، یەك غەرقی ناو سەخاوات
یـەك عابیـدو هونـەروەر، یـەك بـێ حـەیاو موفـەتتین
یـەك سـاقیی شـەرابە، یـەك تێـچوویی خـەرابات
پـڕ خـەوش و خـەم زەمانـە، ڕازاوە هەرچـی ڕووخـا
ڕووخـاوە هەرچـی ڕازا، مەقـسەد کرایـە هـەیهات
بولبـول بـە ئـاخ و ناڵـە، ڕێـوی بـە دەسـتی گـوڵی
هـەموو هـەر چوونە بەنـدا، تـا گـورگ و مـارو مـالآت
(ڕاجی)، قەسـەم بـە قورئـان، دەلیلـی چـاك ئەمانـەن
خودا کـە بـێ شـەریکە، دروسـت ئـەکا چ حـەز کـات.

(٥)

ئیـشارەی نـازی چـاوی، نـەفی و ئیـسپات
وەکـو موسـا، دڵـی بـردم بـە میقـات
بـە بزمـاری مـوژەم، قـایم دەکـەم دڵ
لـە سـروەی بـاخی پـڕ ئەسـراری بـالآت
دەخیلـی چـاوەکانت بم لـە بەرچـی
ئەبـەی تـالآنی ڕووحـم بـۆ خـەرابات؟
ڕوخـت گـوڵ، قامـەتت عەرعـەر، سـەرت شـەو
دڵـت بـەردو، مـوژەت تـیرو، بـرۆت لات
شـکاندت جـان، بـە شـیری نـازو لەنجـە
ڕفانـدت دڵ، بـە بـازی چـاوی شـەهلات
هەناسـەی مـن لـە دامێن عەسـکەری زوڵـف
لـە پـێش چـاوی ڕەقیبـان بۆتـە ئـالآت

کە سینەم کرد هەدەف بۆ تیری دوژمن
بە مەرگی تۆ قەسەم، نەمبوو موخافات
کە نووری ڕۆژ ئەبەخشێ، خاڵی تاریک
ئەبێ چۆن بێ لە ئوفقا ڕووت کە هەڵهات؟
لەوی زێتر نەبوو ئومێدەوارت
فەقەت (ڕاجی)، نەبوو جاری مواسات.

(٦)

سەد ئەسەف گوڵشەکەرا، مەیلو موحابا بووە قات
بۆ دڵی خەستەوو بێچارە، موداوا بووە قات
لە هەموو لاوە دەڵێن، تازە چەمەن خەملیوە
گەرچی بۆ بولبولی دڵ، خەندەیی گوڵها بووە قات
ئەی دڵا، گەر بە ئومێدی قەدی زیبایی ئەوی
شێتو بێهۆشو هوری، قامەتی ڕەعنا بووە قات
دڵی مەجنوونی منە، شۆڕشی لەیلا ئەیەوێ
بۆیە ئێمڕۆکە مەگەر خیمەیی سەحرا بووە قات
ماهی تابانە سیمای حوسنی، کە دامەنگیرە
موشتەری قەدری نەما، هەروەکو زوهرا بووە قات
چونکە دەستو قەدەحی یارمە، ئێمشۆکە لە ناو
خەندەیی لێوی ڕەقیب، وەك شەوی یەڵدا بووە قات
شەوی بەزمو تەرەبە، موتریبو ساقی بە هەوەس
شێخی تۆبەو نەزەری عیففەتو تەقوا بووە قات
چەنگو نایو دەفو عوودو، چەقەنەو بەربەتو ساز
چونکە هاتوونە سەدا، مەنهەجی فەتوا بووە قات

خەوە یا زیندەگییە کۆمەڵی بەزمت، (ڕاجی)؟
کە بەراوازە دەڵێی، مەیل و موحابا بووە قات!!.

(٧)

مژدە بێ ئەی دڵ، لە ئوفقا ڕوویی دڵئارا هەڵات
چارە دەتوانی بکەی دەردت، ئەگەر سەودا هەڵات
ڕووی لە پەردەی شەرمەوە هەڵهاتووە، گیراوە ڕۆژ
کەوکەبەی خاڵ و خەتی، تاقم بە تاقم وا هەڵات
شاهی یارانی زەمان، هاتۆتە خانەی بەزمەوە
لەشکری عەقڵ و ئەدەب پشتی شکا، پرژا، هەڵات
خانەیی تاریکی دڵ وەبزانە زوو بکرێتەوە
وا جەماڵی دڵبەران وەک تالیعی بەیزا هەڵات
کەشفی چۆن ناکا؟ خەیاڵاتی دڵی غەمباری من
هەر دەمێ، لەو بورجی ڕەحمەتدا ڕوخی مەعنا هەڵات
چنگی بازی چێشتووە، کەوتە شەفەق ڕۆژی سەما
یاری من هاتو، بەسەد زام و برین عەنقا هەڵات
بۆ هەوای کوردی عەزیز و خۆشمویستم (ڕاجیا)،
چیهرەیی ساغەر، لە کەففەی شاهیدی ڕەعنا هەڵات.

(٨)

ئەی دڵ، چ ئەبەستی تۆ تەعەللوق بە مەحالات؟
گەر نەقدی تەڵەب کاسیدە، بۆچیمە خەسارات؟
تا جەرگی من و دیدەیی تۆ مەستی حیسابن
ئاگرکرە دڵ، لەم قەسەبەی کۆیی عیبادات
ساقی وەرە تالانی سەرمکە، سەرو ماڵم
نەک خەرجی بکا چەرخی سەما، فیتنەیی ئەوقات

یـــا لەشـــکرە، یـــا زائیبـــەیی ســـەروی ڕەوانـــن
ئـەم دەســتەیی زوڵفانــە، لەســەر قامــەتی ڕەعنــات
گـــەنجی دڵـــی وێرانـــە، کـــە وێرانـــی نیـــازە
ماچـێکی دەمـت بـەس بـوو، کـە نـەتکردە موافـات
دڵ حـــازرە بـــۆ مـــوڵکی تیجـــارەت، بـــە تـــەفائول
وا کەوتـــە ســـەفەر قافیلـــەیی فیکـــرو خـــەیاڵات
بـەم زوڵفـە، ئەگـەر قـابیلی خنکاندنـە (ڕاجـی)
ســاتێ مەکــە تــەئخیری قــەنارەی قــەدو بــاڵات!!.

(٩)

دانیـــشتم و بـــورجی حەمـــەلم، قەوســـی وەلا خـــست[1]
عـەقرەب بـە لـەبی سـونبولەوە، دڵمـی لـە پـا خـست
جـەدیی ئەســەدم، ســەوری شـیکایاتی شـکاندم
چـنگی سـەرەتان، حـووتی لـەناو داوی فـەنا خـست
دەلـوی دڵـی مـن، ڕاسـتە کـە میزانـە لەگـەڵ ئەشـك
جـەوزایی مـەمی دڵبـەرە، ئێمـەی بـە فیـدا خـست
ئەوجی سەری من، عەینی حەچیچی بەری پێتە تەعدیلی
ڕوخـــت، عەکـــسی لەگـــەڵ بـــەختی ســـیا خـــست
ئـــەم مینتەقـــەیی قـــەددی تـــۆ، بەســـتوویە دڵ و ڕۆح
ئـەبرۆیی قـەزەح، تـیری بـەناو جـەرگی منـا خـست
بـێ موشـتەریە زوهرەیـی مـن، چـونکە لـە ئافـاق
هەرچـی سـەری دا، پـایی لـە کەنـداڵی خـەتا خـست

١ ڕاجی لەم هۆنراوەیەدا ناوی هەر (١٢) کەلو (بورج) ەکانی هێناوەو شارەزاییەکی باشیشی لەو بوارەدا هەبووە.

وەك حەزرەتی خورشید، لەناو قەوسی نەهارا
یارم قەڵەمی شەوقی بە (ڕاجی) بە سەما خست!!.

(١٠)

دانیشتووی مەحزون بووم، سوڵتانی خەیاڵت هات
هاتیف بە نەوا فەرمووی: هەستە سەروماڵت هات
جێژنی ڕەمەزان ڕۆیی، من زارو بە ڕۆژوو بووم
ئەی دڵ گلە بشکێنە، هەنگامی ویساڵت هات
تێکۆشە لە مەینۆشی، سەر دەرکە بە مەستانە
وا پایزی هیجران چوو، باغاتی جەماڵت هات
نەورۆزی خەت و خاڵت، باخی ئیرەمی ئەنگاوت
شەددادی تەئەسسوف چوو، تەشریفی جەلالت هات
ئەم مەیکەدە تا سەربێ، یارەب لە خراپی دوور
ساقی وەرە ئاغووشم، وا حوکمی حەلاڵت هات
مەسرووره هەموو عالەم، لەم پرتەوی کوڵمانەت
مەخمووره دڵی عالەم، وەختێ مەیی ئاڵت هات
تەحریکی مەدەن سۆفی! با حیلە نەکا یارم
(ڕاجی) مەکە تەنگانە، وا زەوق و مەجالت هات.

(١١)

چەندە دانیشتم لە کونجی خانەقا، یارم نەهات
چەند برینداری نەخۆشم، مەرهەمی زارم نەهات
چەند بەهێش، فرمێسکی خوێنین هاتە لێشاوو خرۆش
مات و ناکام و هەراسان، یاری دڵدارم نەهات
بێ دەرو ڕێگەو عیلاج و قوڕبەسەر، دەگریم و دێتم
ئاوی کەوسەر، میسك و عەنبەر، سەروی گوڵنارم نەهات

ئەی ڕەفیقان، وا وجـوودم تـك بە تـك ئەڕژێتە خـاك
چونکە وەعدی داو شکاندی، هـەر بـە ئاقـارم نـەهات
مـن شـەهیدی ئـەو دڵارامـەم، بـە هیـوا کوشـتمی
لـەو هـەموو کاروانـسەرایە، کـەس بە هـاوارم نـەهات
سـەر لـەخاکی زەحمـەتا هـەڵنابڕم، مەمگرنـە کـاخ
هـەر سـەرەی نەگبەتـە نـۆرەی دادو دیـدارم نـەهات
زەحمەتـە (ڕاجـی) ڕەهایـت بـێ لـە داوی گـوڵڕووان
وەك منی بێچارە، دووچار بووم و، نیوچـارم نـەهات[1]!!.
١٩٣٦

(١٢)

بێنـی شـاهی دڵبـەرانی نـازکی گوڵبـۆ نـەهات
شـەممەیی بـاخی بـەهارو سـەبزەواتی تـۆ نـەهات
دائیرەی عەقڵم لە دەست وەستاوە، خـوارو پـڕ غەڵـەت
چونکە بۆ تەشـریحی عیشقم، جـەدوەلی ئـەبرۆ نـەهات
زوو لـە کـوورەی عیشق کـەوتم، تـا دەرەنگـێ دامـرام
ئەی خودا بۆ شەهری یاران، بۆ لـە مـن بۆنـسۆ نـەهات؟
سـەبرو ئـارامم نـەماوە، تـاوی هیجـرم کەوتـە سـەر
مـردم و سـاتێ لـە دەورەم، شـیوەن و ڕۆڕۆ نـەهات
والـەیی دەردی فیراقـم، گێـڵ و سـەرگەردانی تـۆ
داخی جـەرگم، داروویـی شـەوبۆیی زوڵفـی تـۆ نـەهات

١ لەشوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (ڕاجیا)، زەحمەت خەلاسیت بێ لە جەوری گوڵڕوخان وا زەمانێکە ڕەفیقی کونجی هاوارم نەهات.

یـــار، غەزالێکـــە لـــە کوردســـتان و ماچـــین خالیـــە
وەختە کوێربم، چونکە شوعلەی ڕوومەتی ئیمـڕۆ نـەهات
جیسم و جـانم دایـە دەسـت ئـەم دڵبـەرەی غارەتگـەرە
ئەی عەجەب! جارێ بە عیـشوە بـۆ سـەری تـاپۆ نـەهات
دڵ لـە داوی بەنـدە، هەقیـە، شـوێنی جیـسمم ناکـەوێ
کەی لەگەڵ ڕۆژا ئەڵێی، بۆ شەمعی جوسـتوجۆ نـەهات؟!
کـاتی مەرگـە (ڕاجیـا)، ڕۆیـی ژیـانی بـێ ویـساڵ
دەردمان سەد دەردە چونکە، بۆیی یـاری کـۆ نـەهات.

(١٣)

مـەزاقم تاڵـە بـەم ژەهـراوو خوێنـاوی خـەمی عیـشقت
دەروون ئاشـوفتەیە دایـم، بـە تـۆزو ماتـەمی عیـشقت
لە کوورەی دووریـا سـووتا، هـەموو بـەرگی ویـساڵی مـن
فـەقیری کـردووین قوربـان، عـەجایب حاتـەمی عیـشقت
ئـەزانی مـن لەبەرچـی شـێت و سەرگەشـتەو هەراسـانم؟!
هوجوومی کردە سەر من، ئـەی عـەزیزا، عالـەمی عیـشقت
برینـــداری دەمـــی شـــیری بـــرۆت و تـــیری موژگـــانم
هەمیشە خەسـتەوو گـیرم، لـە حەلقـەی ئەدهـەمی عیـشقت
لە دەشـتی سینەما هەڵـسا، غوبـاری وەحـشەت و نـەفرەت
بـە زاهـیر چـاکە بینـایم، بـە دڵ کـوێری تـەمی عیـشقت
چـلۆن ژینێکـە ئـەی دڵبـەر، کـە مـن هـەردەم نـەناڵێنم؟
چلۆن نەرژێ ئیتر ئەشکم، بە شێوەی شـەونەمی عیـشقت؟!
جگەر دووپارە بوو (ڕاجی)، غەمی دووبـارە دیـسان هـات
موحەققەق بوو کە تۆ فەوتای، بە تیغی دوودەمـی عیـشقت.

(١٤)

گەڵایی پایزم دوور بێ، لە یارو خزمەکان ئەی دۆست
بە ڕەنگی زەردی بێ قیمەت لە کۆی پڕ قیمەتان ئەی دۆست
فلان کەس بمکوژێ یاخۆ ببەخشێ، من چم و چبکەم!
بە غەیری ئاهی بێدادی، لە بازاڕی بوتان ئەی دۆست
تەبیبی دەردی یاران یارە ئیمڕۆ، بۆ منی غەمگین
خودا هەڵناگرێ دوژمن بکا دەرمانی جان، ئەی دۆست
لە بۆتەی ماتەما جەرگم کولاّ، ئیکسیری ڕووت بێنە
بە میعیاری لەبتکە تەجرەبەی زێڕی عەیان، ئەی دۆست
مەراق و وەحشەتی دنیا بوو، چێشتی ڕۆحی ناشادم
فەرەح بەخشێ نەبوو دامانی بگرم، (ئەلئەمان) ئەی دۆست
ئەزانم هێندە بێ ڕەحمی، وەکو گاور لەگەڵ ئیسلام
نەبوو مەیلی سەلاّحەت کەی، لەگەڵ یەخسیرەکان ئەی دۆست
قەزا نووسیویە کارم، هەتا مردن کە (ڕاجی) بم
ڕجاگیریی ئیتر خۆم خستە خانەی دۆستان، ئەی دۆست.

(١٥)

وا دڵی من بەندە بەم غەمزەوو هیندوویی دۆست
قامەتی من بەستەیی حەلقەیی گێسوویی دۆست
چارەیی موشتاقی دڵ، کوشتنی دەرگاهی یار
مەرهەمی عوششاقی ڕۆح، زەخمە بە بازوویی دۆست
مردنی زاری منە، هیجرەتی شیرین لەبان
ئاوی حەیاتی منە، لەنجەیی ئاهوویی دۆست
ژەنگی خەمی گرتووە، دڵ لە تەمەننایی خووی
لازمە سافی بکا، دوو لەبی خۆش خوویی دۆست

ڕەنگــی بــەهارم شــکا، قــوڕ بەســەرم، بــێ مەفــەر
کەس نییە خۆی ڕاگــرێ، بــۆ خــەمی ئــەبرووی دۆست
داخــی دڵ و جــانی مــن، مەرهــەمی نایــا بــە هــیچ
غەیری لــەبی ڕەحمــەت و، خــاکی دەری کــویی دۆست
ئــاگری عیــشقم بــەجۆش هاتــەوە بــۆ ڕوویــی گــوڵ
نــەوتی بەســەردا ڕژانــد، هێــشتە دوو جــادوویی دۆست
هــــەر غــــەزەلێکم پــــڕی دەفتــــەری عوشــــشاقییە
فائیــدە نــادا ئەگــەر، جــارێ نەچــی سوویی دۆست
لاف لێمــــەدە (ڕاجیــــا)، بــــەم غــــەزەلی ســــیحربار
مەنعــە لــە کێشانی ئــەو، پــایی تــەرازوویی دۆست!!.

(١٦)

گیــانم بــە فیــدای چــاوی ڕەش و تــیرو کــەوانت
مــاڵم ســەدەقەی لێــوی گــوڵ و، ســەروی ڕەوانــت
بــۆ نیــو نــەزەری خۆشــیو، یــەك لەنجــەیی بــاڵات
هەرچــــی هەمــــە بــــەرتیلی دەم و لێــــوی جوانــــت
چــاوم لــە تەماشــای هــەموو کــەس، کــورج ئەنووســێ
بێجگــــە لــــە قــــەدو لەنجــــەیی دڵــــسۆزو هــــەژانت
دڵ تەنگــە وەکــو خونــچە کــە فووچــاوە لــە دووریــت
وەك خەنــدە ئەپــشکوێ، بــە هــەوای چــاوو موژانــت
بــــۆم پڕکــــە پیاڵــــەی دەم و لێــــو، تــــاکو بنۆشــــم
ئــاخیر نەفەســــی مەرگمــە، دووربــــێ لــە گیانــت
نــــەختێ وەرە باوەشــــم و، کــــەنارم بکــــە گــــوڵزار
جەنەتمــە کەیــشتن بــە تــۆ، ســوێندم بــە زیانــت

هەرچەندە دڵم ڕائەکوشن پەنجەیی زیوین
زێدە لە خەیاڵم، خەم و خوێن دێنە خوانت
هەرچی هەمە هەرزان و بە تالانی ئەبەی تۆ
بێ زێڕو زەبەر چییە لە بازاڕی گرانت؟!
هەر ڕۆژە بە جۆرێ دڵی خۆم دایەوە، خۆش بووم
بەو باوەش و ماچانەوو نەشئەی شەوەکانت
هێند ناسکی، ئەتوێیەوە وێنەی عەرەق و قەند
چەند دڵبەرە سینگ و مەمەکەو، بەرگی کەتانت
خۆڕایی نییە سۆزو گەشەو خەندەیی (ژیکۆ)
ئەی کوردە لە ڕێی گوڵشەنی ڕووی مەملەکەتانت!!.

(١٧)

مەخۆ ژەهری هەلاهیل میللەتی کوردی بە تەخمینت
چلۆنە زەلزەلەی وەختت، لەگەڵ تاڵاوو شیرینت؟
سوپاسی میللەتی خۆم هەر ئەکەم، ئەمما تەحەممولکە
کەیف خۆشی بەسە، ببڕە ڕەگی دڵداری پڕ کینت
لە خۆت هەرگیز فەرامۆشی مەکە، پێداکە، نازانی!!
شکاوە شووشەیی دنیا، پساوە ڕشتەیی دینت
ئیتر زۆر واجیبە ئیمڕۆ، دروستیی کەی لەکاری خۆت
کە حەیفە سەوزەواتی تۆ، هەموو بکرێتە پەرژینت
بە ئەسباب و تفەنگ و تۆپ و تەیارەو ترونیێلی
ڕەواجی خستە بازاڕت، ڕفاندی خەزنەیی ژینت
بەسە خوا بتگرێ، فکرێ لە ئەحواڵت بکە میللەت
چ حەیفێکە کە دوژمن بێ، بەبادا خەرمەنی شینت!

ئەمن کوردم، وەکو (ڕاجی) بە داخیشی لە فەوتانم
ئەتۆش ڕەحمێ بفەرموو خۆت مەخە ناو داوی چین چینت.

(١٨)

هۆش و دڵ و ئاوات و ژیانم بووە نەکبەت
ڕەنگە نەگەمە باوەشی ئەو سەرگوڵە قەت قەت
کەوتوومە تەم و ماتەمی دووری، بە تەماشم
بیگرم، بگەزم، ڕایبگوشم، بیخەمە سەر خەت
ترسم هەیە، پەرچەم بە سەبا هەڵبزرکێ
یا هەڵبوەرێ میوەیی ئاکامی لە ڕوومەت
ئەو، زینەتی باخات و گوڵ و گیاوو درەختە
کاتێ کە بە لێو دێ بە بزەو، لەنجە بە قامەت
گەر تیری موژەی خستە بڕۆی ماڵی کەوانی
سینگ و جگەرن، دەبنە نیشانەی هەموو ئافەت
بەو نیوە تەماشایە، کە ئەیکەی بە دزی خەڵك
عاشق ئەکەیێنی بە هەموو پایەوو دەوڵەت
قوربان و بەلاگێڕی گلێنەو نەزەرت، دڵ
بیبەستە بە لاگیرەوە، لاگیری خرینگەت
تا لەو ملە ئەتلێتەوە، بەو تاسە ئەتاسێ
ئەو کاتە لە دوولاوە، بە قژ بیخەرە ژێر پەت
بێژە ئەمەیە قۆچی فیداو، حەجی قبووڵم
بۆ خەڵکی مەکە، بیکە لە کابە بە زیافەت
ئەو عیشوەوو نازانە کە ئەنوێنی لە ڕوو دا
بۆ بردنی گیان و دڵە، کردووتە بە عادەت

**(ژیکـۆ)، بـە تـۆ پەیوەنـدە ئەگـەر بیخەیـە پێوەنـد**

**ئارامــە لـە چـاوی ڕەش‌و، ئـازادە لـە خەنـدەت !!.**

**(١٩)**

**ئـەی شـاهی منـی خەسـتە لـە دونیـاوو قیامـەت**

**یەکـچاوە تەماشـا بکـە، یـەك عیـشوە بـە قامـەت**

**هەر عیشقی ئەتۆم جێـی تەڵەبـەو، گەوهـەری مـەرغووب**

**سـاندووە لـە دوژمـن بـە تـەما، بـاج‌و غەرامـەت**

**لـەم داوی شـەوی هیجرەتـی تـۆ، بـێ دەسـەڵاتم**

**خـۆت فـەرموو، هـەتا چـارە ئەکـەی دەردو سـەقامەت**

**بـۆ وەصـڵی جـەماڵت، دڵەکـەم مـانیعی دینـە**

**دەرچـوون نیـە، لـەم مـانیعی جەمعـە[1] بـە سـەلامەت**

**چـبکەم، کـە گوڵـستانی جـەماڵت ئەدرەوشـێ**

**مـن بەنـدی تەڵـەی ئافـەت‌و جـەورم، بـە مەلامـەت**

---

١ المانع (ڕێگر ڕێنەدەر)، زاراوەیەکی زانستی بیرسایە (علم المنطق)و، ڕێگر دەبێ لەبەردەم پێکەوە سازان‌و گونجان‌و پێناسەکردن‌و کۆکردنەوەی هەموو جۆرە جیاوازەکانی سەر بە ڕەگەزێکی دیاریکراو لەژێر سایەی خۆیدا. لێرەدا، زاراوەی (مانع الجمع ڕێگری کۆکبوون) ڕێگرە لەبەردەم سازان‌و کۆکردنەوەی پێکەوەی (وەسڵی جەماڵی یارو، دین). واتە هەر دەبێ یەکێکیان هەڵبژێردرێ‌و هەردووکیان پێکەوە هەڵناکەن‌و ناکۆك‌و نەساز دەبن، چونکە خەسڵەتە گەوهەریەکانی هەردوو بێژەی (وەسڵی جەماڵی یار)و (دین) لەیەکتری جیاوازن‌و ناتوانرێ لە ژێر سایەی پێناسەکردنێکی بیرساییانەشدا کۆبکرێنەوە.

واتای دێڕەکەش بەمجۆرەیە: (بۆ زوان‌و گەیشتن بە جوانی تۆ، دڵم کە تامەزرۆو تاسووقە دەبێتە ڕێگر لەبەردەم دیندا. لەم ڕێگری‌و نەگونجان‌و نەشیانی کۆبوونەوەی پێکەوەی هەردووکیشیاندا بە سەلامەتی قوتارم نابێ، چونکە هەرکامێکیان هەڵبژێرم، ئەوەکەی دیکەم لە دەستدەچێ). یان: (بۆ زوان‌و گەیشتن بە جوانی تۆ، دین دەبێتە ڕێگر لەبەردەم دڵی شەیداو تاسووقەمدا، لەم ڕێگری‌و نەگونجان‌و نەشیانی کۆبوونەوەی پێکەوەی هەردووکیشیاندا بە سەلامەتی قوتارم نابێ، چونکە هەرکامێکیان هەڵبژێرم، ئەوەکەی دیکەم لە دەستدەچێ)، چونکە دەستەواژەی (دڵەکەم مانیعی دینە) بە دوو واتا خۆدەنوێنێ.

وێرانــــه هــــەموو خانـــەیی عــومرم بـــه نیـــازی
سەد وەیـل، کـه بـێ مەیلـه لەگـەڵ مـورغی کەرامـەت
لــەم قافیلــه ئەفکارەیــە، (ڕاجــی) بکــه یــادم
لــەم غوربەتـــەدا، لێمـــەدە تـــۆ مـــۆری ئیقامـــەت.

(٢٠)

ڕازایـــەوە ئـــەم کوڵمـــەیی تابـــان و موخەتتـــەت
پێـچایەوە سـەد سـونبولی چـین چـینی موفـەڕڕەت
ئـەی دڵبـەرە تێرمکـه لـه ماچـی لـەب و کوڵمـەت
وەك زامـی جگـەر، تـۆ بکـه جـان مـەزج و موخەڵڵەت
نـاوێرم ئەگـەر باسـی دەمـت کـەم، لـه جیهـەت ماچ
خـۆ بـاوەش و دەسـتگرتنەکەت، نـاکرێ قـەت قـەت
لـەم گەنجـه، لـه کونجێکـەوە وەستا بەچـه زەنگـێ
یـا کـافری زوڵفـت، لەسـەری کـردە موسـەڵلەت!!
ئـاهم لـه هـەموو لاوە سـەمای گرتـووە، خـەت خـەت
ئەشکم له هـەموو خاکـەوە جـاریی بـووە، شـەت شـەت
عیـشقت، سـەنەما! مەدخەلـه بـۆ قـەلبی برینـدار
وەسڵت، چ عەجـەب! بـۆ منـی بێکـەس بـووە مەسقەت
نـازك تەنەکـەم مەنعـه لـه وەسـڵی دڵـی پـڕ شـۆر
(ڕاجـی) بکـەوە بـەحری موحیتـا، تـۆ وەکـو بـەت.

(٢١)

لــەم بــاغی بناگوشــە، منــی دیــوە گـــوارەت
بــەم شــەوقە، لەســەد بێکەســی پرسـیوە گـوارەت
باســـی ســـرۆتن ناکـــەم و هاتوومـــه کـــەنارت
وەك لالــە، کــه لــەو جەنەتــه خــەملیوە گــوارەت

عەکـــسێکە لـــە دڵ کـــەوتووە، پێـــچاویە جیـــسمی
جیـــسمێکە، وە یـــا نیـــوە دڵـــە، نیـــوە گـــوارەت؟
هەرچـــەندە جگـــەر کونکـــونی موژگـــانی بـــە خـــوێنم
ســـەد داغـــی منـــی بێکەســـی پۆشـــیوە گـــوارەت
سەد گـەنجی زەڕو زیـوی (سـولەیمان)یـیو (قـاڕوون)
ئێمڕۆکـــە بـــە یـــەك پیـــسەیی نـــەکڕیوە گـــوارەت
بـەم ڕەنگـە، کـە هەمڕەنگـە درەوشـانی بـە هـەرلا
قـــەدری جگـــەری بولبـــولی ناســـیوە گـــوارەت
دڵ ســـەر نـــەزمری عیـــشقە، دەمـــێ چـــوویە تەماشـــا
نـــابینی؟ هـــەوای پەرچـــەمی گۆڕیـــوە گـــوارەت
بەم بەم، چ عەجەب، تێکەڵـە نەشـئەی گـوڵو نەسـرین!
هەڵبـــەت، چـــەمەنی جەنەـــەتی هۆنیـــوە گـــوارەت
بـەم تیشەیی ئـەفکارە، بـە سـەد مەسـقەلی ئـەڵماس
(ڕاجـی)، بـە گـەلێ سـوورەتی تاشـیوە گـوارەت!!.

(٢٢)

دڵ حـــازرە لـــەم دەرگـەیـــە بیـــدەم بـــە بەشـــارەت
نـــەك چـاوی بەڵـەك نەقـشی نەکێـشێ بـە ئیـشارەت
لەوســـاوە لـــەناو ڕەوزەیـــی حوســـنت تـــەرەبم بـــوو
ڕۆیـــی ســـەرو مـــاڵو دڵو دیـــنم بـــە تیجـــارەت
تاکـــەی هەوەســـی گوڵـــشەنو، ئـــاواتی ویـــساڵت؟
ئـەی خانەخـەرەس، هەســـتە لـــەناو تـــۆزی فـــەقارەت
دەســـتی دەشـکێ، ئـەو کەسـە چـاوی لـە تەڵـەب کـا
بەغـــدا نییـــە هـــەر جێگـــە ببینـــی بـــە ئینـــارەت

قەومی حەبەش و تورک و عەرەب، دەست و دوعاتن
ئەی کوردی گران، فەرموو، ئەگەر مەیلتە غارەت
نەقدێکە، لە دەستی چووە قاروونی بەلاکێش
مەگرە لەسەرم، تینەت و کەرپووچی حەقارەت
چاوی لە ئومێدی کەرەمی تۆ نیە، (ڕاجی)
ئەم سەنەدە نووسراوە لە دیوانی وەزارەت.

(٢٣)

لەم لالەیی نوورینە دووسەد خانە بەدەرکەوت
ئاگر لە پەڕو قالبی پەروانە بەدەرکەوت
لەم چاوە، لەبەر مەستی یو کالایی مەحەبەت
سەودایی مەی و ساقی یو مەیخانە بەدەرکەوت
مورغی دڵەکەم بەستەیی سەد عیجز و نیازە
خاڵێ لەسەری زوڵفی، کەوەک دانە بەدەرکەوت
سۆفی کە بە چەند تەعنەوە دوێنێ سەری کێشا
لەم حەلقەیی مەردانەوە، مەستانە بەدەرکەوت
دڵ هاتەوە ڕووی شەهپەڕی سوڵتانی عەدالەت
بۆ قەیدو بەلا، بێ دڵی دێوانە بەدەرکەوت
زاهیر بووە خونچەی دەمی ئەو دڵبەری ڕەعنا
بولبول بە دووسەد ناڵە، لە هێلانە بەدەرکەوت
ناچێ بە دوو عالەم، کەسەری سەر دڵی (ڕاجی)
لەو پەرچەمە، گەر تووڕەیی شاهانە بەدەرکەوت!!.

(٢٤)

دڵێکی گەر نەبێ پەروایی عوشرەت
بە نەفرەت بێ لە بن دەرگایی عوشرەت

هـــەوایی موتریـــب و ســـاقی لـــە هـــەر جـــێ
دەگێـــڕێ چـــەرخی ســـەرتاپایی عوشـــرەت
بـــە گـــوێزەی چـــاوی شـــۆخت، ئـــەی دلاّرام
کـــەرەم فـــەرموو بـــە مـــن مینـــایی عوشـــرەت
لـــە خەنـــدەی لێـــوی پـــڕ نـــازو نیـــازت
دەپـــشکوێ خونـــچەیی زیبـــایی عوشـــرەت
نەســـیمی زوڵفەکـــەت، حەیفـــە نەشـــێوێ
بـــە لەنجـــەی قامـــەتی ڕەعنـــایی عوشـــرەت
دڵـــی پـــڕ حەســـرەتم ئـــەمجا ئەڕسـکێ
بـــە عیـــشوەی نەرگـــسی شـــەهلایی عوشـــرەت
چـــلۆن بـــشکێ بـــە تیپـــی غـــەم لـــە مەیـــدان
کەســـێ، گـــەر هاتـــە بـــن ئـــالاّیی عوشـــرەت
ســـەفا هاتۆتـــە جونبـــوش، هەســـتە غـــەمبار
شـــکاتی خـــۆت بـــە لای شـــایی عوشـــرەت
خـــەوە یـــاخود خـــەوە (ڕاجـــی)، ئەمەنـــدە
دەفـــاتیر پـــڕ بـــووە ئینـــشایی عوشـــرەت!!.

(٢٥)

بۆچـــی ناپرســـی لـــە حـــاڵی عاشـــقی میـــسکینەکەت؟
کـــەوتووە، بێکـــەس دەناڵێنـــێ، ئـــیتر غەمگینەکـــەت
زارو هـــاواری شـــەوو ڕۆژی، ســـەمای داگرتـــووە
گەه دەسووتێ، گەه دەسووڕێ، بۆ چرای ڕەنگینەکەت
بولبـــولێکم، ناڵـــەناڵم عالـــەمێ بێـــزار ئـــەکا
کـــوا حـــەبیبا، بـــاخی خونـــچەو سونبول و نەسرینەکەت؟

مەی پەرستێکم لە خانەی عیشقەوە ناگرم قەرار
تێکە، بۆم دانێ هەدیەی پەنجەکەی زیوینەکەت
شاهیدی خاڵ و خەتت ئیقراریان داوە کە تۆ
دەمکوژی هەردەم بە تاری پەرچەمی چین چینەکەت
لەعلی لێوت کەی دەکا شیرین، مەزاقی رۆحی من؟
وا گەیشتە فالی سەروەت، چاوی تالیع بینەکەت
لەحزەیێ دەستم نەگەیە باخی شمشادو هەنار
هەر تەرەف دەورەی ئەسووڕێم، مانیعە پەرژینەکەت
مەرحەمەت ناکەی کە جارێ بێمە مەنزەرگاهی رووت
یا بەسیتە، کەس قبوولێ ناکا روخی ئاینەکەت
سەرزەدەی جامی خەراباتم، لەسایەی عیشقەوە
بورجی نەسخی رۆژی عەقڵە، کۆمەڵەی پەروینەکەت
رێم نیە، بێمە کەناری جەنەتی تابانی تۆ
چەند تەلیسم و سیحرە وا پۆشیویە گەنجینەکەت
(راجیا)، ئاوی حەیاتت هەر لە لێوی دڵبەرە
هەستە خێرابە قومێ فڕکە، ئەسووتێ سینەکەت!!.

(٢٦)

زۆر زەحمەتە دەرچم لە خەمی فیکری بڵاوت
هەر کوشتنە پیشەی دەم و سەیارەیی چاوت
رەحمێ بکە تینوومە، لە دووری تۆ نەخنکێم
تێرمکە لە شەکراوو مەی و نوقڵ و گولاوت
خەڵکی هەموو شادن لەبەرابەر نەزەری دۆست
من بەندی گرانم هەیە، بەم خەنجەرو داوت

دڵ دەرچوو لە سینەی منی میسکین، بە تەمەننات
هاتۆتــەوە نــاو گوڵــشەن و لالــەی نەچــناوت
بـەم خاڵـەوە، ڕووت مەکتـەبی پـڕ نـووری کـچانە
ســایەی بەســەرا خــستووە مورغۆڵــەیی خــاوت
ڕۆح، بۆتـە نـەمامێکی تـەڕو وشـك و بـڕو زڕ
ڕسـکاوە بـە قـەترەی عـەرەق و جـامی شـکاوت
(ڕاجـی)! هەوەسـی ڕەنـدی یـو بێبـاکی یـو هیمـەت
مەعلوومـە، لـە دەرچـوونی دڵ و سـینگی دڕاوت !!.

(٢٧)

ئـەی جیلـوەدەری عالـەمی ئـەعلا، ڕوخـی گوڵبـووت
وەی چارەسـەری عاشـقی ڕیـسوا، سـەری گێـسووت
زوڵفـت لـە نـەزەر ئاینـەیی حوسـن و جـەماڵت
حەیرانـە، پەشـۆکاوە، لەبـەر شـوعلەیی دڵجـووت
خەنـدەی لـەبی گوڵنـاری تـۆ، گـەر بێتـە تەجـەللا
بـێ شـوبهەیە سـووتانی هـەموو عالـەمی ناسـووت
وا هەڵخەڵـەتا دڵ، کـە لـە گۆشـەی نـەزەری تـۆ
کەوتۆتـە بـەلا، هـەروەکو دێوانـەیی هـاڕووت
سـەرحەڵقەیی مەسـتانە، ئـەوی مەسـتی دەمـی تـۆن
وەك خـاتری مـن ئێـستە کـە سوڵتانە لـە لاهـووت
بزمـاری مـوژەم، سـوورو سـپی ئەشـك ئـەدۆزێ
چـاوم بـە خـەوا نایـە، لـە تـاو نێرگـسی نوسـتووت
(ڕاجی)، لە ئەزەل باغی سەرو سوورەتی تۆی چاند
بۆ بەختی ڕەشی، خونـچەیی ئـەو باغـە نەپـشکووت.

(٢٨)

دڵبـــەری کـــوردم کـــە دی، خـــوێنم بـــزووت
ڕوومـــەتی، جـــەرگی کزانـــدم وەك بـــزووت
خەنجـــەری موژگـــانی ڕاکـــردم لـــە دڵ
بـــۆ ســـەرم وەســـتاوە ئـــەبرۆی تـــاق و جـــووت
فارســـیی وت: (خـــون بیغمـــا میخـــورم)[1]
(مـــا یَفـــوت)ی عـــارەبی، بـــووە مایـــە فـــووت
خـــزم و دۆســـتانم، لـــە پێنـــاوی تـــۆ نـــان[2]
وا لەســـەر تـــۆ، بوومـــە ڕەنـــدو ڕووت و قـــووت
ئـــەی ڕەقیـــب، تـــۆ کونجرێـــك پەیـــدا بکـــە
(تـــەیری گـــوڵ ئاشـــق بـــە داری زەقنـــەمووت)
چـــۆن لـــە ژێـــر ئەگریجـــەوە، کـــوورەی دەمانـــد!
ســـینەوو جـــەرگ و هـــەناوی پـــێ دەســـووت
خـــستمی، لەنجـــەو نیـــازو نازەکـــەت
کوشـــتمی، بـــالآیی بـــەرزو هاتوچـــووت
نەخـــشی خـــاڵ و خـــەت، خـــەتێك بـــوو خوێندمـــەوە
(هەرچـــی چـــاوی پێتکـــەوێ، ئـــەو دێتـــە دووت)
وا هەڵاوەســـراوی پەرچـــەم، کەوتـــە چـــاو
ڕەش بـــووە (ژیکـــۆ)، بـــە وێنـــەی خـــاڵی ڕووت.

(٢٩)

بـــێ کەســـم، هێنـــدەم بەســـەرهات هـــەیت و هـــووت
ئێـــستە ڕاهـــیم، بوومـــە کەشـــکی ئاوەســـووت

---

١ واتە: (بەفارسی گوتی: من خوێن بە تالآنی دەخۆمەوە).
٢ واتە: لەسەر تۆ لە خزم و کەسوکارم بووم.

مـــن وەکـــو مێـــشی گەڕیـــدەی شـــیرینیم
زوڵفـــی تـــۆ لـــێم بۆتـــە تـــاری عەنکـــەبووت
شـێتو هـار بـووم و، لـە چـاوت، چـا نـەبووم
بۆچـــمە ســـا (بوودوجانـــە) و (جەلجـــەلووت)
پەرچـــەمت بـــن بـــارو، ســـەربارت کـــە بەســـت
بـــۆ تـــەن و لێـــدانی ســـەرمە، بـــارە شـــووت
هـــەر وەکـــو مـــاری ژنـــان کوشـــتەم، ئـــەمن
دایوەشـــاندووم، تـــۆپ تراقـــەی گـــورج و زووت
هێنـــد لـــە دیـــوانی مەحەبیـــەت مامـــەوە
بـــیری ئەســـتوورم، بەرامبـــەر داوە مـــووت
خاڵـــەکانت دەنکـــەنارن بـــۆ نـــەخۆش
چـــاوەکەم، یـــاقووتی لێـــوت بۆتـــە قـــووت
هەندەســـەی بـــاڵاوو کوڵمـــانم کـــە خوێنـــد
شـــارەزا بـــووم تـــوول و عـــەرزو، ئینـــج و فـــووت
هـــەروەکو (ژیکـــۆ)، لـــە ئـــاگردانی ڕووت
ڕووت و قـــووتم، وەك فرووجـــی ئـــاوەڕووت.

(٣٠)

گـــوڵ و نێرگـــز، لـــەدڵ وا بوونـــە لالـــووت
دڵـــیش وەك جانـــەوەر، لـــەم لانـــە نـــەبزووت
دەمـــی قووچـــاندو، خونـــچەش هـــەر خـــەمی خـــوارد
کـــە بولبـــول هـــەڵفڕی، جـــا لێـــوی پـــشکووت
لـــەناو شـــاری جوانـــان، گەرمـــە بـــازاڕ
بـــە دڵـــسووتاوو ســـەودای کفـــن و تـــابووت

لەسەر پۆپی درەختی شاخی کوردان
هەڵاوەسران، هەزار هاڕووت و ماڕووت
کە ڕۆژ لووتی لە لوتکەی کێوەکان دا
بە ڕوو زەردی هەڵات و، پێی هەڵەنگووت
مەجەس کاری نەما، ئاری لە کوێ مرد؟!
هەتیوی وا کراون پووت و پەڕپووت!!
ئەبێ کێ بێ، ڕەقیبی ئەم هەژارە؟
کەمەندیکەی، بەهێزی دەست و بازووت
ئەگەر دڵبەر تەبایی کا، لەگەڵ دڵ
ئەکەن هەر لەشکری پڕ چەک، بە نابووت
نە ڕۆژ هەڵکا چرای چاوی حەسوودان
نە شەو بگرێ پەنای دووڕووی ئەدەب، ڕووت
چ ئەشکەوتێکە من تێیدا ستار بم؟!
چ بەختێکە لەگەڵ یارم ببم جووت؟!
بە یەکجاری لە هیوا بەش بڕاو بووم
کە خاڵێکی خیانەت کەوتە سەر ڕووت
کە تۆ بێگانە دەستی لێوەشاندی
ئەمن شێت بووم و دەستی خۆم لە تۆ شووت
بەسە (ژیکۆ)، لە هەر جۆرە خەیاتی
خەباتت هەر جوان کردو، جلی سووت!!.

١٩٦٠/١٢/١٤

(٣١)

هێندە خواردم غەمی ئەو شۆخە، لەژێر دارو شریت
وەکو ئاڵۆزیی سەرو پەرچەمی، بوومە شەل و شیت

غـەمی تـۆ جـەرگی ڕژانـدم، بـووە خـۆراکی دڵـم
تێکەڵی کۆمـەڵی بەدبـەختی یـو، سـەر، کەوتـە زەویـت
دەرکـەنارم لـە نیگـاران و، لـە خوێنخـواری گەلـە
بێ گوڵیش خۆشە کـە دوور بم، لـە کـەوادو لـە دەویـت
تـا بـە سەربەسـتییو بـەرزی ئەگەمـە خـوازراوم
قەدەغـەم بـێ خـەوو خـۆراک و چـەم و ئـاوی شـەویت
باغی گوڵ، مێرگی وەنەوەشەت نییە ئەی کوردی ئەسیر
شـین بکـە، هـەروەکو ڕازاوەتـە بـازاڕی چـوویت
بـووە وێرانـە لـە تـۆ شـارو، بـووە بـاخی خـەڵک
کـە تـرازا سـەری بنـچینەت و، بـەردی بنـە پێـت
کـەی ئەگاتـە سـەری بـەرزو، تەقـەلاکا لـە ژیـان؟
گەلەکـەی سـواڵکەرو سـاویلکەوو بـێ ئـازو ئـەویت
هەر لەخۆی خـوێن و خـوری خواتـەوە، بـا هـەر بخـەوێ
دڵەکەی ڕوح پـەڕەوو چـاو لـە دەسـی خـەڵک و کـەویت
هـەر کەسـێ هـات و وتـی: مەیـە تـۆ وێـژەی (ژیکـۆ)
هیچ گوێی خۆی مەدەیـە، هـەر وەبزانـە سـەگە، ڕێت!.

(٣٢)

لـەب و کولـمـەت بـەبارێ ئـازەوە، ئـەم خاڵـە هەڵئـەگرێت
عەجەب ماوم کـە جەنـنەت بولبـولی بـەرداوە، قـەل ئـەگرێت
لـە داوی پەرچـەمی گیرۆدەیـە دڵ، چەشـنی ئەسـکەندەر
بـەڵای ئـەم داوە بـازی گرتـووە، لای وایـە مـەل ئـەگرێت
کەچـەڵ خۆشـبوو بـەناز و نیعمـەتی دونیـاوو مافیهـا
دەمـاغی سـاغە، داغـا! ڕێگـەیی مـەرگ و ئەجـەل ئـەگرێت

سەری زوڵفت، سپێری خستە ئەترافی بناگۆشت
چ جەنگی لەشکرێکە قایمەی کێشاوە، کەل ئەگرێت؟!
کەسانی بێ سەرو گوێ، پاڵەوانی عوشرەت و شادین
خودا! بۆ عاقڵ و زیرەك، لە خۆی بێزارە چەل ئەگرێت!
بە غەم دێ دەمکوژێ ئەو دڵبەرە شیرینە ڕەنگینە
کە نازانم بە خەشمە، یا دڵی نایا بەدەل ئەگرێت؟
لە گەردو باری دووری، مات و سەرگەردان و دڵتەنگم
ئەگەر تیغی موجەوهەر حورمەتی نەگرن، چەپەڵ ئەگرێت
لەبەر چاوم کەوت بەختی حەبیبەم، وەك تەلیعی خۆم
دەنی خوو شێری ناوێ، حورمەتی ڕێوی دەغەڵ ئەگرێت
بە جامێکی ویساڵت تینووە، دەم وشکە، دڵ داغە
کە (ڕاجی) دەردی دەرمان ناگرێ، بێ مەی کەسەل ئەگرێت.

**

## -ج-

### (۱)

ئەی ڕوومەتی تۆ گوڵگون، وەی گەردەنی تۆ بێ باج
دڵ شانەبەندی مووتە، یان تووڕە بۆ سەرو تاج
زوڵفی تۆ بارەکەڵڵا، پۆشیویە ڕۆژی ڕووناك
ڕوویی تۆ حیکمەتوڵڵا، تاریکی کردە تاراج
تا قوللەیی خەیاڵم، بۆ وەسڵی تۆ نەڕووخێ
بۆ عەرش و کورسی ئەڕوا، ڕێگەی هەزاران میعراج
عیشقت ئەڵێی قومارە، مەراقی بێ نیهایەت
زۆر ترسمە دوایی، دەرچم بە چەشنی لەحلاج
بەم دەردو داخی دووری، ناخۆش و بێ قەرارم
ئەی (خدر) ی دەردەداران، بۆم تێکە جامی ئاماج
تۆخی بەهارە قوربان، گەردن کەچە وەنەوشە
قومری بە سۆزە، بولبول، بۆ لێوی خونچە موحتاج[۱]
تاعەت چلۆن قبووڵە؟ وەستان لە ڕووی دوو میحراب
یەك ڕابەری بەهەشت و، یەك دۆزەخێ لە ئینتاج
قەوس و قوزەح لەسەر ڕۆژ، هات و کەوانی کێشا
وەك نانی هەورەمانی، سووتا دڵم لەسەر ساج[۲]
ئەڕوا ژیانی (ڕاجی)، ئەی دۆست ئەگەر نەبەخشی
جامێکی زەوق و خۆشی، ماچێکی لێوی غەنناج[۳].

۱- لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (قومری بە سۆزە بولبول، بۆ لێوی خونچە ناتاج).

۲ لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (وەك نانی هەورەمانی گیانم گەیشتە سەر ساج).

۳/ أ لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (جامێکی زەوق و خۆشی، بەناوی حوکم و نیفراج).

(٢)

گەشە ژینم بە ژیانت، پڕە کیسەم لە خەراج
بە نەسیمی سەرو زوڵفت، هەمە بازاڕی ڕەواج
ئاوەدانە وەتەنی دڵ، بە هەموو دەشت و چیای
چ بە(هەڵگورد)و بە(کۆسرەت)، چ بە(کەندال)و (قەراج)
وەرە با پێکەوە بمرین، کە بە خۆشی ئەژییەین
یەکدگیریکە لە دونیا، هەلە، بۆ قەبرە سیراج
غەمی دڵ بۆکەنە، ئەگرێ بەری چاوی تەقەلا
وەرەمی سی و جگەرە، دوژمنی دەرمان و عیلاج
بەسە بێ ماریفەتی، خزمە مەکەن لێم قەدەغە
خۆشەویستی، کە سەرو دڵ ئەکەیێنێ بە دو تاج
خۆشە ئاوێنەیی کوڵمەی، بنوێنێ دڵی خەڵک
تا لە گوڵزاری مرازا، بستێنێ هەموو باج
وەرە (ژیکۆ)، کە بە کوردی بگرین تاوێ جەمات
تا خەباتت لەبەریکا، کەژی کرمی قەرەقاج.

(٣)

گوڵشەنی پەرچەم، شوکر کردوویە پەنج
دڵ شکاوی کوڵمە بوو، کردوویە پەنج
چۆڵەوانم تا لە سەودای دیدەتا
ڕەوشەنیمە، بۆچمە ساباتو زنج
گەنجی شاهیم خستە دەستی یارەوە
خەم لەبەر بەدبەختییە گرتوویە کونج

ب لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (یەك بادەیی ویساڵت. یەك ماچی لێوی غەنناج).

بـــادەیی شـــادی لـــە کۆمـــەڵ بەشـــکرا
کـــەس نـــەکا بـــا تانـــەداری و منجـــەمنج
گیانـــە، پـــەرداخی گریـــشمەو لەنجەیـــە
پێکەنینیـــــشی هەڵیرشـــــتووە بـــــرنج
قامـــــەتی، ســـــەروی رەوان و دڵکەشـــــە
زوڵـف و پەرچـەم لـووس و ڕەش، بـێ لـۆچ و گـنج
خـــاڵی بـــن زوڵفـــانی ئەســـتێرەن لەشـــەو
رووـمـەتی وەك چـەرخی ڕۆژە، خـشت و خـنج
خـــوێنی دووچـــاوم بـــە ئاســـانی خـــورە
نایـــەوێ ئاوبـــارەوو تێـــی مـــەکرە گـــونج
نەمـــــدەزانی نرخـــــی لێـــــوت، گیانەـــــە
تـــا دڵ و ڕۆحـــت نـــەبرد، نەمـــدا ســـرنج
قـــەت وەڵاشـــیی ئـــەو کەســـەم پێنـــاکرێ
رووپـــەکی بـــێ کـــونجرو پـــۆش و کـــرنج
وەك پڵینگـــــی پـــــر خـــــەمم لێهـــــاتووە
ڕۆژو شـــەو، هـــەر شـــوێنمە خێـــزرو خـــورنج
ســـینە بیـــنم، وا دوو چـــنگی لـــێ ئـــەدەم
بیـــچرم ئـــەو دوو مەمانـــەی وەك تـــرنج
کەشـــبەوە (پـــشکۆ)، نەکـــەی بکوژێـــەوە
تـــا کـــزەت پێـــدا، لـــە بـــاڵای قیـــت و قـــنج!!.

(٤)

قـــەدی ســـەروت، ئـــەوا گرتوویـــە نـــارنج
لـــە(شـــەقڵاوە)و (ســـەلاحەددین)، (قەڵاســـنج)

سەرو ماڵم لەپێناوت ئەنێم، تا
لەژێر پێت هەڵبدەم سەرم و، بکەم پەنج
لە(کۆیە)و، (نازەنین)و، خاکی هیران
هەموو گوڵزاری ئامانجن، بەبێ گەنج
لە(کانی خان)و، (کانی سارد)، (قەمچخۆ)
بە قەمچی دەرئەچن ئینگلیزو ئەفرنج
لە کوردستان بڕا چاوی حەسوودان
دەوا بوو داخی تێکبەردان و ئەشکنج
هەموو ڕازاوە دیوارو حەساری
لە سافیدا، ئەما ئاتاجی ماڵنج
لەکێوانی، ئەگەم ئینجا بە ئاوات
چ کوێستانی، چ گەرمێنی، بەبێ زنج
بەقوربانی قەدو سینەو بەرو بۆت
تیجاراتی فەڕەنگ و، ڕۆم و، بێت لەنج
لەتاوی ڕوومەتی نازداری تۆیە
ڕەقێتەی گرت و، کوردی خەڵک قۆڵنج
بەکوردی، میوەجاتم پێگەیشتن
هەنارو سێوو هەرمێ و قۆخ و ئەترنج
بەدڵ داخی ئەما (ژیکۆ)، لە خۆشی
گوڵی ڕووی دلبەری کوردی، گەش و خنج.

(٥)

شەکەرخەندەت پڕی کردن گوهەر، گەنج
لە لێوی گوڵ ئەپشکون نەخشی بێ ڕەنج

ئەگــــەر ســــاتێ بــــەرەو ڕووی دڵ بــــشەنگی
گیــان ســەرخۆش ئــەبێ، بــێ بــەنگ و بــێ بــەنج
وەرە ئاورێـــــک بــــدە بــــۆ لای هـــــەژاران
بــە دەردت موبتــەلان، گــەر پــیرو گــەر گــەنج
لەبـــــەر نـــــارنجی ســــینەو، گوڵـــشەنی ڕووت
فرێمــداون ســەرو مــاڵ و، (شــەش و پــەنج)[1]
چــــیە توانــــام! کــــە تــــاوێ دابنیــــشم
کــە زەنگیــی کەوتــە ژێــر دەســتی ئــەفرەنج
لــە خــاڵ و زوڵــف و کوڵمــەت، چــۆن پەشــۆکام
خــــەڵوزو ئــــاگرو دوکــــەڵ، لەگــــەڵ غــــەنج
زمانـــــت لاڵـــــە (ژیکـــــۆ)، تـــــۆ لـــــە تـــــاوی
قــــەدی ســــەروی ڕەوان، لێــــوی گوهەرســــەنج!!.

(٦)

هەردوولا هەر خزمی خۆمن، مام ڕەجەب، یان خاڵ فەرەج
خزمــەتی هــۆزم ئەکــەم، بۆچــی ناکــەم لێــرە حــەج!!
تیــر کــولێرە گــەر نــەخۆی، بۆچــی ئەکــەی دوو تیرەیــی؟
یــەک دڵ و یــەک ڕێ بــڕۆ، ئــەی مــەردی مەیــدانی بــەوەج
گــەر ئــەتۆ خــاوەن وچــانی، دوژمنــت، مەیــدە وچــان
نــەک دەرێنــێ چــاڵی چــاوت، هــەژدەرت لێبکاتــە خــەج
شــێخەڵی ئــەو نەونەمامــە، شــاقەلی مــەردانی گــرت
تــا بــە بــاخی نیــشتمانا، ڕاســت بــڕۆن و بــێ عیــوەج
(نالی)ی ناڵەی دڵ لە گۆڕو، (حەمدی)ی دڵخۆشــی نــەدا
وەک (مەلای کۆیە) بەرامبەر (حــاجی قــادر)ی گۆڕقــەرەج

---

١ شەش و پەنج: مەبەست لە (ئیمان و دین)ە.

شاعیران، هەرچوون و خۆیان خستە کۆشی نیشتمان
وەك برێشکەی کون لە کۆشان، کەوتنە ناو جانتای قەرەج
چەندە تیژو تاڵە (ژیکۆ)، ئەم ژیانەی بێ وچان
هۆزی چی؟ ئاواتی چی؟ سەیرانی چی؟ سامانی گەج!.

(٧)

بردمی بای دامەنی باجی مەنیج
تا لەلای (بەصرا)وە خستمیە خەلیج
گێژی دام ئەم بەحری بێ پایانی خەم
قووتی دام دوژمن وەکو نوقڵ و عەریج
هەرچی دوژمن پێت بدا هەنگوین و شیر
چاك بزانە تامی تفتەو، زەوقی لیج
گەر گرفتار بووی بە داوی ناکەسان
سوودی لێ نابینی جەفرو عیلمی زیج
گەر بەخۆت باوەڕ بکەی، تۆش ئادەمی
هەر لە ئەو یانەو قوتابخانەی خەریج
(کەس لە دایکی دەرنەهێناوە جیهان)
هەر لەگەڵ تەدبیرو بیر، بۆتە مەزیج
تۆش وەکو من، قوڕ بەسەر خۆتا مەکە
مەیفرۆشە خاکی نایابو[1] بە هیچ
چەندە ناخۆشە لەبەر چاوی هەژار
ڕوویی گرژو دەستی قووچاو، چاوی قیچ
نامەوێ (ڕاجی) ڕەواجی ڕووبەڕوو
تا نەبینە نەخشی هەر تەون و نەسیج.

**

---

١ نایابو: نایابت.

-چ-

(۱)

بۆ ژیانی من بەهەشتی پانە ماچ
لەو گوڵی کوڵمەت بە گیان هەرزانە ماچ
من لە منداڵیوە لێوی خۆم دەسووم
تا بکەم جارێ لە ئەو لێوانە ماچ
ماچی لێوی تۆ لە قەند شیرینترە
بۆ موسڵمان و سەقەر نێوانە ماچ
چۆن ئەسووتێنێ جەهەندەم، ئەو کەسەی؟
خۆشدڵیی کا، لەو سەری کوڵمانە ماچ
قەت لە ماڵمەت نایە سایەی زوڵفەکەت
وا بەرانبەر کۆمەڵی ئینسانە ماچ
ماچ نەبێ عالەم درندەی یەکترە
یەکدگیری هێزی ژێر ئاسمانە ماچ
نەجمەیی سەر شانی پاشاوو گەدا
خاوەنی بڕواو شکۆە و شانە ماچ
دوژمنی گریان و سەختی و تاڵییە
دۆستی بەرزی و خۆشی یو خەندانە ماچ
عالەمی غەیب و شەهادەت دەرئەخا
شاهیدی بوونی هەموو ئیمکانە ماچ
تووخوا تا رۆحی سەختم دەرئەچێ
بەدەرێ ڕۆژانە یان مانگانە ماچ

پێت بڵێم (ژیکۆ) ئیتر عیلمی پزیشك
بۆ هەموو دەردی گران، دەرمانە ماج!!

(٢)

ئەی قەلەندەر بەسیەتی سا منجە منج و مرچە مرچ
شاری بەغداو پارسی گرت، لەشکری کاکۆڵ و پرچ
تا بە هیوا ڕانەکا، ئەم دڵ کوژاوەی دەربەدەر
هەروەکو داوی هەتیتە، خۆیەتی لاوازو چرچ
یارو ئامۆزاو برادەر، لێم کە بێزارو دژن
بۆیە ئەمنیش، هەرچی ئەیبینم پڵینگەو شێرو ورچ
هەروەکو جاران، بە یادی ڕوومەت و سینگ و بەرۆك
دڵ گڕی گرتۆتەوە، پڕ بوو هەناوم قرچە قرچ
وا بوغازەی سەر بەکوڵ هات و لە هەڵچوون ڕوو ئەکا
جۆشی پێ سەندوتەوە چاوی خومارت زرچە زرچ
خەڵکی شاری کۆیە یاری سەرکەش و تاق و بەناو
تەرزو باریك و بڵندو، نەرم و شلك و چوست و گورج
پێت بڵێم (ڕاجی) کە گەیە دڵبەرت، میوەی ژیان
چەندە خۆشە چمشنی خرچە، بیکرۆژی خرچە خرچ!.

(٣)

بۆ عاشقی ڕیسوایی، دڵدادەیی ئەنوەر کچ
بۆ لەززەتی تەنهایی، قەد نازکی ئەسمەر کچ
پڕ نازو نیازو لێو گوڵنارو تەڕەب ئەتوار
پۆشاوی تەم و ئەنوار، سوڵتانی موعەنبەر کچ
ڕووخۆش و نەرم گوفتار، دڵ نازك و مەه ڕوخسار
بۆ شەوق و سەفا بێدار، تووڕەی زەڕی ئەحمەر کچ

ئەنگوستی وەکو کافوور، کاکۆڵی وەکو دەیجوور
ئەبرۆ بە هەوا مەعموور، تاقانەیی ئەختەر کچ
کچ بۆتە یەدی بەیزا، بۆ ڕەسمی تەحەددی کچ
کچ بۆتە مەهی کەنعان، بۆ چاوی سەفاگەر کچ
تەشریفی کچی مەکتەب، گەر بێنێ بە خەندەی لەب
دێنێتە دەسم مەتلەب، قەت نەبووە موکەددەر کچ
گەر قامەتی باریکە، خاڵی وەکو تاجیکە
زینەت لە مەمالیکە، مەعلوومە لە دەفتەر کچ
شەمعی شەوی یەڵدایە، عیجزی دەمی عیسایە
خۆشنیعمەتی مەولایە، ڕاکێشە سەروبەر کچ
(ڕاجی) نەزەری عالەم گشتی لە کچە هەمدەم
هەم زینەتی دنیا کچ، هەم حۆریی کەوسەر کچ!!

**

## -خ-

### (١)

لـــە ئـــاگرینی تـــری، بـــۆم پڕکـــە پـــەرداخ
بـە بـەر (بـا) دە لـە دڵ، بـەو بـادە هـەر ئـاخ
لـــە ســـەرما دەرکـــە ماخولیـــایی هەســـتی
دڵـــی عالـــەم بکـــە خـــەرمان و مـــشتاخ
بـە سـۆزی خـۆت، بـسووتێنە هـەموو کـەس
بـە یـەك چەشـنیی بپـشکوون تـا ڕەزو بـاخ
بـــە یـــەکڕەنگی و تـــەبایی لەشـــکری بـــیر
لـــە ئەســـپی یەکیـــەتی دەن، زیـــن و ساچـــاخ
نـــەبێ فـــەرقی کـــون و کـــاژێر و ئەشـــکەوت
لەگـــەڵ کۆشـــك و تـــەلارو قەیـــسەری و کـــاخ
هـــەموو، یـــەك کـــان و ئـــاوە نیـــشتمانت
هـەموو سـوودە، ئەگـەر دەریـا، ئەگـەر شـاخ
چ قەیـــدێ، هـــەر مـــەقامێك و دوو نـــاوە
لـــە یاریـــدا، چ (ســـابورا) وو( چـــالاخ)[1]
هـــەموو کـــوردین، چ ئێـــسکان و چ ســـاکین
لـــە دۆ پەیـــدا نـــەبێ شـــیرێژ و تـــۆراخ
ئـــەڵێن (کەشـــکیش بـــرای دۆیـــە)، عـــەزیزم
هـەتا مـاوی، مـەخۆ قـەت نـانی چـەخماخ

١ (سابورا سابوراوا)و (چالاخ) ، دوو گونـدن سـەر بـە قـەزای دوکان. کەوتوونەتـە نزیك یەکتری لـە سـەر ڕێگای گشتی سلێمانی دوکان. خەڵکی سابوراوا لـە دوای ژێـر ئاوکەوتنی گوندەکەیان (گەڵنێری) بـە هۆی دروستکردنی بەنـداوی دوکانـەوە. لە ڕۆژی (١٩٥٨/١٠/٢٦) لـە لایـەن حکومـەتی ئـەو کاتـەوە گواسـترانەوە بـۆ سابوراوا. کە پێشتر خانووی نیشتەجێیان لەوێ بۆ دروستکرابووو زەوی کشتوکاڵییان بەسەردا دابەشکرابوو.

ئەمە عەردی زەراعەت، یانە تەبیات
بە گەنم و تووتن و ڕێواس و سیچماخ
هەموو گیانت بەهارەو سونبول و گوڵ
ئیتر بۆچیتە گوڵباتەان و شیرداخ؟
وەرە (ژیکۆ)، بڕۆ سا دەس لە دەستا
نەبێ باکت بە بەشکردن بە بەیداخ!!.

(٢)

گوڵشەنی ڕوویی ڕەوشەنت، عیززەتی کوردی بۆشناخ
دیتنی پاکیی دیمەنت، سوورمەیی چاوی هەر مەناخ
لەم سەروچاوە جوانەدا، هەڵتەقوولێ هەموو تکا
خزمەتی کوردستان ئەکا، لادێ وو شارو دەشت و شاخ
نێرگزو گوڵ بە چاوی دڵ، بولبولی خستە بەندی چڵ
لە ناو بەهارو خاڵ و پڵ، ئەخوا لە دەستی خەڵك ئاخ
هەژارو پەست و بێکەسم، جگەر بڕاوی نەورەسم
ڕێگام پڕە خارو خەسم، لێرەوە تاکو سابلاخ
کوردی عێراقیی لێو شەکەر، خەریکی ڕێی قەزاو قەدەر
نەبێ لە خاکی دەربەدەر، نەچێتە چاوی ئینتیساخ
نیگاری نیشتمانی گەش، گەیشتە ڕۆژی بەختی ڕەش
خودا نەکا کە ئەم هەلەش، بچێتە بەندو دەردو داخ
خزم و برادەران وەرن، لەهەر هەواریێ داوەرن
وەرامی یەکییەتی بەرن، بەهەر کەنارو کاخ و لاخ
بڕوانە ڕووی هەولێرو کۆ، کەرکوك و دەوری بەکرەجۆ
کزەو شەماڵ و ڕەنگ و بۆ، لە ئابلاخ و گربداخ

(ژیکۆ) لەتاوی هۆزی خۆی، خـۆڵی پـڕە لـە شـیرو دۆی
نەکەی بوەستی یا بخۆی، هەتا ئەکـەی بـە (تورپـاخ)[1].

(٣)

مـــنم جانـــا غـــەریبی خانـــە، ســـەد ئـــاخ
ئـیتر تاکـەی؟ بـێ دڵ، دێوانـە، سـەد ئـاخ
مـــوحیبی ڕاســـتو ئـــەرپابی مەحەبیـــەت
هـەمووم دانـا لەسـەر ئـەم دانـە، سـەد ئـاخ
زەفـــەر نابـــەم بـــە جـــامی چـــاوەکانت
دەنـــاڵێنم لـــە دوور مەیخانـــە، ســـەد ئـــاخ
دەســـووتێنێ چـرای کوڵـەت، بـەبێ سـووچ
پـەڕو بـاڵانی ئـەم پەروانـە، سـەد ئـاخ
لـــە مەوتـــەن دوورمو، مەئیوســـی ڕووتم
حـەریفی تـۆن هـەموو بێگانـە، سـەد ئـاخ
چـەمەن خـەمڵی بـە نەشـئەی قامـەتی تـۆ
نـەهات بێنێکـی ئـەم بوسـتانە، سـەد ئـاخ
لـە تـۆ خۆشـی، لـە(ڕاجـی) دادو زاری
عەدوشمان شادە بەم سـەیرانە، سـەد ئـاخ !!.

**

1 تورپاخ: وشەیەکی تورکییە بە واتای خاك. لێرەدا مەبەست لە (مردن)ە.

-د-

(١)

سەبا گوڵزاری تۆی هێنایە بەر یاد
لە بیرم چوو (مەدینە)و (شام)و (بەغداد)
بە لارو لەنجە گەر هاتی بە گەردوش
دڵو جان بوون لە خۆیان زارو بێداد
خەریکم دابڕێژم جەوشەنی عیشق
لە خۆی، شیرین کە ببڕێ ناوی فەرهاد
زەمانە مەوتەنی ئەغمامە، گەرچی
تەمەننامە، لە ماتەم بێ دڵ ئازاد
سەری زنجیری زوڵفت بەندی دینە
کە ئیمانی نەهێناوە دڵی شاد
دەسووڕێم من لە بەحری بێکەسیدا
تەمامە گەوهەری وەسڵم کەم ئیجاد
بە تاوی خەنجەری ئەبرۆتە، (ڕاجی)
بریندارە، ئەبێتە پیری ئیرشاد!!.

(٢)

نەرمو شل زنجیرە بوو، دەسپێکرا کاری ویداد
هەڵخرا هەرلا لە عیشقا، تەونو بازاڕی ویداد
موشتەری زوهرەی کڕی، ڕۆژ هاتە سەوداوو مەزات
وا پڕە هەرجێ دەچی، کۆڵانەوو شاری ویداد
ئاسمان پڕشنگی دایە عەردو نەجمەی دا بە شان
بۆیە زەردو سوور ئەچێ، پەرژینو گوڵزاری ویداد

دەستگایێکە هەموو مەیدانی بەغداوو عێراق
تێکەڵی نازو نیازو، چاوی بیماری ویداد
مەینەتیی، ئاڵۆزەری ئاڵۆزی دوو چاوی منە
نەشتەری ناو جەرگمە، زوڵفی خەس و خاری ویداد
سێبەرێکە بۆ بوتی گوڵ، ئافەرینی خونچەیە
بۆیە هەرچی کەوتە ڕێگا، دای پەلاماری ویداد
دەست ڕەس نابم بە بالاّی و، بڵێم بمێنچەوە
هەروەکو (ڕاجی) ئەناڵم، دوور لە دیداری ویداد.

بەغدا- ١٩٤٤

(٣)

بێ سوودە لەگەڵ عیشقی بوتان، شۆڕشی بێداد
چبکەم لە هەرای ڕۆستەم و کاریزەیی فەرهاد؟
دارایی ئەسکەندەرو، زانینی ئەرەستۆ
بۆ پێکەینی دڵبەرە، وەك لەشکری بێ زاد
چبکەم لە سولەیمان و، لە تەسخیری جنۆکەی؟
هێشتاکە لە زنجیری نیگاری نیە ئازاد
من چیمە لە ئیدریس، لەگەڵ مائیل و زائیل؟
با ئاگرو ئاو، خاك و هەوای، بشبنە ئەوتاد
کێ بێ وەکو من دەربەدەری یارو نشیمەن؟
هەر دێم و دەپاڕێمەوە، هەی داد، خوا داد!
جارێ بەسەری لێوەوە، ئەمدی کە بپرسێ
کێیە، چ هەتیوێکە، چ دەروێشە، چ بەرباد؟!
مەرگی من و دەرگاتە، هەناسەی من و پەرچەم
تا گۆشەیی ئەو چاوە، دەرمدێنێ لە بونیاد

چاوم نەڕژێ تاکو لە خاکی دەری یاران
هەر کوێرە لە ڕووی بەزمگەهی دڵبەری بەغداد
(ڕاجی)، چەمەن و مێرگی ژیان گەر تۆ ئەپرسی!
سەد جۆرە بەهەشتێکە، سەری خۆش و دڵی شاد.
١٩٤٦

(٤)

بێ وەفایی بەسە ئەی زوهرە، کە بێ تامت کرد
موشتەری، زەوقی دڵی ئێمە بوو ئیعدامت کرد
لەحزەیێ دەرنەکەوت، گۆشەیی شەمعی نەزەرت
ئەی عەجەب تۆ لەسەر ئەم کیبرە چ ئیقدامت کرد!!
یا شکاوی سەفەری وەسڵ و زنجیری فیراق
لە هەموو لاوە ئیتر، خەستەوو ڕیسوامت کرد
ڕێگەیی وەسڵی لەبی خونچە، بە ئاخیر ئاگا
بەچە گاور، تۆ چلۆن بەم لەبە شەیدامت کرد؟
بەسە عەییاری، هەر ئەمجارە ویساڵم یا مەرگ
عەیبە لەم بێکەسییە، ترشی یو ئیحجامت کرد
بێ حەیا ماوە نەزاکەت، لە بەرابەر قەددت
بەوە زانیم، کە لە یارانەوە تەنهامت کرد
سینەیی من قەفەسێکی شڕە، چی تێناوەستێ
کەوی دڵ هاتە دەرێ، هەر کە تۆ سەرسامت کرد
ئێستە جێی سوڵحە، دەبا بێ قەدەحی ڕومانی
با فیدای چاوی تۆ بێ، هەرچی لە ئەندامت کرد

یـار ئـەوا خـۆی لـە کـەمین داوە، هـەتا نـەیبینیٚ
حەیفە (ڕاجی) کە دڵـیٚ بـوو، بـە جـەفا ڕامـت کـرد!!.

(٥)

دڵ هاتـەوە قاپـست، بـە جـەفا بـیٚ زەوەرت کـرد
وەتزانـی کـە قازانجـە، کەچـی تـۆ زەرەرت کـرد
دڵ، مـەردی هـەموو کـات و هـەموو جـۆرە کونێکـە
ئـازادە، کـە لـەو چـەمبەری زوڵفانـە دەرت کـرد
تووشـی تـەم و غـەم، دەردو بـەلا بـووی لـە بڵنـدیت
پیرۆز بیٚ لە تـۆ، چـەندی بـەبیٚ مـن سـەفەرت کـرد
ئاگـات لـە هـەرای تازەیـە، وا پـڕ بـە جیهانـە؟
هـەر قیرەشـەوە، هەرچـی کـڵاوی لەسـەرت کـرد
چـاوت، کـە ئـەڵێن شـەربەتی شـاهانە ئەنۆشـیٚ
بڕوانـە، چـلۆن تووشـی دوڕنـدەی بەشـەرت کـردا!
نـازانی لـە بـازاڕی دوا، تۆڵـە ئەسـێنرێت؟
بۆچی دڵی ئەم خەڵکە، هـەموو دەستبەسـەرت کـرد؟
(ژیکۆ) کە لە وێنـەی گـوڵی ڕووت، بـیری ئەپشکویٚ
بیـستوومە بـەلێوی شـەکەرین موعتەبـەرت کـرد[1].

(٦)

لەسـەر چـاوت، هـەموو کـارو گـەلم بـوارد
ئەوی هەمبوو، هـەمووم بەخـشی و غـەمم خـوارد
ئەمـە دونیایـە، سـەد چـەرخی ئـەگۆڕیٚ
دە بینۆشـە ئەگـەر گەرمـەو، ئەگـەر سـاردا!

١ لەشوێنێکی دیکەدا دەڵیٚ: (هەربینە لە لێوی شەکەرین گوێشەکەرت کرد).

کــــه مـــــارت پێـــوەداو، دوبـــشکە دەرچـــێ
بزانــــە مـــووی دڵـــی بـــردو، ســـەری نـــارد
لــــە ڕوودا، تــــەمتومان و خۆڵــــە پۆتــــە
بەســـــەر خۆماکـــــە، بێژاومـــــە وەکـــــو ئـــــارد
لــە دەرکـــەت نـــابزووم، ئـــەی شـــۆخی عالـــەم
کــە لــەت لەتکــەن دڵ و جــەرگم بــە ســیکارد
لەســـەر ئـــەم تەختـــە لووســـەو، کیـــسە تەســـکە
بـــە دارم یاریـــــە، وەك تـــۆپی (بلیـــارد)
ســــەرو مـــــاڵ و دڵ و جــــەرگ و گیـــانم
ئــەوی هــەمبوو، لــە تــۆم دەرخــست و ئەمــشارد
ئەگــــــەر دادم ئەپرســــــی، دڵ شــــــیفا دە
کــــە بیــــستوومە (ســــەلاحەددین و)و(ڕیکـــارد)
ئەوەنـــــدەم عیـــــشقی تـــــۆ خـــــستۆتە دونیـــــا
خـــەیاڵم بۆتـــە ڕادیـــۆ، چەشـــنی (مـــۆلارد)
مـــــــشووری کـــــارو بـــــازاڕم دەراویـــــشت
هـــەموو ئیـــشم بـــە چـــاوی ئێـــوە ئەســـپارد
بـــــەڵێ (ژیکــــۆ)، لــــە ڕۆژانــــــی ژیــــانم
ســـەرەم ڕاگـــرت و، هیـــچم نوختـــە نـــەبوارد!!.

(٧)

وا دڵــم هــەڵبوو، ســویەند ئاســا منــی بێــزار کــرد
بــای ســەبای لێدا هەناســەی ڕووی لــەناو گوڵزار کــرد
ســەفحەیی دەتوێتــەوە، وەختـــێ کــە کــوورەم داخــرا
وا بزانــە ئــاهی گــەرمم، چــاوی تــۆی بیمــار کــرد

دڵبەرا! جامێکی گوڵڕەنگی شەرابت بگرە دەست
ئاگری جەرگم بە کوللی، عالەمی بێدار کرد
ڕۆحی پڕ دەردو غەمم، تێکەڵ بە کوڵمەی تۆ بووە
ڕوویی تۆی بۆ هەردوو عالەم، مەتڵەعی ئەنوار کرد
نەشتەری کاکۆڵی ژەهرینی، لە زەخمەدا شکا[1]
هەر کە لوقمان هاتە سەر دەردم، بەوی تیمار کرد
من، بە بۆیی زوڵفو ئەگریجەت لە سەودا هەڵگزام
زاهیدی ملکەچ لە باتی عیشق خۆی دیندار کرد
موددەتی پیریو جەوانی، تا زولەیخا هاتو چوو
یوسفی ونبوو بە داخی عیشقەوەی هاوار کرد
ڕوو لە شوعلەی نەوخەتی کوڵمەی کە، گەر خاوەن دڵی
هەرچی خاوەن سۆزە گیانی خۆی لە هیوا سوار کرد[2]
لەعل بەندی گەردەنی، لوقمەی حەڵاڵی باخەڵە
شێخی سەنعان بۆیە هێندەی خزمەتی زونار کرد
یەك نەفەس هاتو نەسیمی زوڵفی خستە شارەوە
لەشکری هۆشی بەجارێ، تەفروتوناو تار کرد[3]
کێیە گەر دەردو بەڵای (ڕاجی) بە ئاسان چارەکا؟
غەیری ئەو یارەی کە چاوی پێ بە هەشتو چار کردا!.

(٨)

کوردی بێ غیرەت لە هیچی، بیری ئەوتانی نەکرد
دوژمنی میوانی هاتو، سفرەوو نانی نەکرد

---

١ لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (نەشتەری کاکۆڵی پڕ صەیقەل، لە زەخمەدا شکا).
٢/ ا لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (هەر کەسێ سۆزی هەبوو، گیانو دڵی خۆی سوار کرد).
ب لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (هەر کەسێ سۆزی هەبوو، ڕۆحو دڵی نیزهار کرد).
٣ لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (عالەمی عەقڵی بە جارێ موبتەلای تاتار کرد).

گـشتی پێـشکەوتن لـە ئـیش و سـەنعەتا، جیرانـەکان
ئـەم دەنــی تەبعـە تەماشـای کـاری جیرانـی نـەکرد
چـاوی پـڕ تـۆزت، کـە دوژمـن هاتـە نـاو مەیدانـەوە
کوشــتیو تــالآنی بــردو، دەرکــی تــاوانی نــەکرد
شەککەرو هەنگوینی خاکی کوردە، پەروەردەی مەگـەز
خـاوەنی بـێ مایـە مـاوە، تـامی لێـوانی نـەکرد
چەند گران بوو موڵکی کوردستان، لـە کـێش و قیمـەتا
بـێ بـەها دایانـە خـەڵک و، خـەڵک هـەرزانی نـەکرد
بـا بمقرچێ تـوو خـودا، قـەومێکی بـێ عـەقڵ و وەفـا
خـاکی، بــێ تـاپۆ بەشــی کــردو چ پـاوانی نـەکرد
کەس لە کەس ڕازی نییە، هەرکەس بە مەن خۆی دائەنێ
شاهی سەنعەت هاتە مەجلیس، کەس چ جووڵانی نەکرد
کۆمـەڵی کـوردان! تەماشـاکەن، چ سـووتا جانفیـدا!
میللـەتی غـەیرت وەکـو پەروانـە ئامـانی نـەکرد
(ڕاجیـا)! بـەرزی وەتـەن نابـێ لـە کوردسـتانەکەت
خاکـە بیمـارە، تـەبیبی قـەوم دەرمـانی نـەکرد!!.

(٩)

تـاوی کـوورەی سینەیی مـن، وا مەیانـدی ئـاهی سەرد
ئـاهی سـەردی مـن عـەزیزم، پێـی دەسـووتێ دارو بـەرد
نەقدی سـککەی سـافی گۆنـەت، نەقـشی کـاری کردگـار
بۆیـە بـانقی ئـەو تـەواو ناکـا سـەماوو مـوڵکی عـەرد
گـەه سـپی ڕەنگـم، گـەهێ سـوورو، گـەهێ تـاڵی فیراق
ئەی عەجەب ئەشکی مەحەببەت، ڕوو دەپۆشێ سوورو زەرد!
مـن لـە غوربـەت، بـۆ قـەدی دڵـگیری تـۆ تاقانـە مـام
ئێـستەیش لـێم ناگـەڕێی، دەمکـەی بـە پـەیکی بەڕنـەوەرد

چـاوە غـەمزێکم لـە لـوتفی تـۆ تەمـەننا بـوو، نـەبوو
تـا لەچـاوم، مەردمـەك نـاوی لـە خـۆی بـەرداوە مـەرد
مەملەکـەت بـەحری غـەمم پۆشـیویە، دەسـت ناکـەوێ
قـەت لـە ئـەرزی وەسـڵتا بـۆ دڵنـەوازی، تـۆزو گـەرد
هـەروەکو (ڕاجـی)، لـە تـاوی دڵبـەری شـیرین بـەدەن
چوومە خەڵوەی بێ قەراری، خۆم لـە عالـەم کـردە فـەرد!!

(١٠)

(کەین و بەین، دارو تەون)

لەشـکری عیـشقی لـە مەیـدانی جوانانـدا نوانـد
پاڵـەوانانی، دڵـی شـاه و گـەدای گـرت و ڕفانـد
خـستیە غەمخانـەوو بەنـدو سـزاو هیـواو تکـا
داخـی خـاڵی پێوەنـاوو، موشـکی زوڵفـی تێوەچـاند
تـا لەسـەر عـامودی بـاڵای، کارەبـای کـرد ڕوومـەتی
خـوێنی سـەرتاپا مـژیم، تـا پـشتی ئـازادی شـکاند
بولبـولی گـوڵزاری حوسـنی، هێنـد بـە شـێتی هاتـە ڕوو
خونـچە وا پـڕ پێکـەنی، تـا لێـوو ئێخـەی دادڕانـد
مـن، کـە تـاڵانی سـەرو مـاڵم لـە ژێـر پێـی نـازی نـا
چـاوی جـادووی بڕیـە دڵ، عفریتـە دەسـتی لێوەشـاند
دڵ کـە ئـاوێزانی بـاڵای بـوو، لـە باوەشـیا ئەسـووت
وەك پـەری پـرس و وەڵام، تـا نەیمرانـدم، نەیدوانـد
هـەر وەکـو موسـا، لەبـەر خێـوکردنی خـاڵ و خـەتی
زوڵفـی گۆچـانی چـەماندو، پۆپی گیـانمی پـێ تەکانـد
کـاش ئـەیزانی کـە کوڵمـەی نەوبـەهاری ژینمـە
ئەو دەمە دەمگوت: ڕەقیب پەژموردە بـوو، قـەل نەیقڕانـد

**وا لە یادم چوو، هەموو بەزم و نەوای ساڵانی چوو**
**چاوی تاریکم دڵی کێشایە ناوخۆی، تێی کەیاند**
**ڕۆژو ئەستێرە ئەبێ بکوژێنەوە، بەس نووری ڕووی**
**وا بزانە ئەم هەموو چەرخەی بە ڕووی خۆیدا جماند**
**هەردوو هۆزێکین، زمانمان ئێک و دووی کێشاوە خەڵک**
**گەورەمان باپیرەیە، نەك (فازەرو مازەرگراند)[1]**
**بۆچی ئێستا دوو دڵی، لەم یەك دڵەی پەست و هەژار؟**
**وا لە داخی تۆ لە دونیا، تۆوی بەدناویم ڕواند**
**لاپەڕەی ڕووی وێم، بە وانای سۆزی دڵ پڕکردەوە**
**چەوتی زانی هێڵ و نوختە، بەو موژانە لێی کڕاند**
**خۆشی خۆشیم بوو، لەگۆشەی چاوەکانی جێ گرم**
**بارەشی نەگبەت لە هەر شەش لا گوڵی بەختی وەراند**
**گەوهەری نازی لە دەم بەست و، بە لێوی خوێنمژی**
**هێزی بینایی لە چاوی گەل بڕی و، جەرگی کزاند**
**خەنجەری ئەبرۆی لە کالانی دڵان هێنایە دەر**
**پەردەیی سینگ و هەناوی عالەمێکی هەڵدڕاند**
**هەر کەسێ کەوتە وەنۆزی ڕاحەت و بێلایەنی**
**هەروەکو شێخی کەرامەتدار، لە خەودا پێی نواند**
**چەندە دەروێشی ڕیابازم دەرس دا، ڕۆژو شەو**
**سۆزی عیشقی تێکەڕێ، نەیبیست و هەر گوێی بۆ لەقاند**
**ئەم هەموو چەرخە، کە سەرگەردانی ئەمرێکی ئەوە**
**هەرچی ئاقڵ بوو لە ڕیشتەی عیشقی خۆی تێوەگلاند**
**(دارو تەون)و، تێوەدان و، ڕایەڵی ئەم عالەمە**
**هەر ئەبینی دەستی غەیبە، ڕیس و هەودای هەڵوەشاند**

---

١ (**_Father Grand_** ): باپیرە. (**_Mother Grand_**)، داپیرە.

کێ هەیە، خۆی گۆشەگیری کونجی خەمکا چەشنی من؟
داری سەرداریم شکاندو، داوی خۆشحاڵیم پساند
شێت و گێلی دڵبەرو، خۆشباوەڕو، دوورە ڕیا
هەر بەتەنیا سۆزی دڵدارم لەدڵما دانیشاند
تاکە ڕێگایی حەقیقەت پێی دەڵێن: دەوری مەجاز
هەر ئەگاتە پایەداریی، هەرکەسێ خۆی لێ خشاند
بۆ تەمای ماچێکی لێوانی، سەحەر زوو پێی گوتم:
ئەو گوڵە، چەند بولبولی وەك تۆی لە باخا هەڵفڕاند!!
جیلوەیێکی دا لە ڕێی دیدار، بە ڕوودا خستمی
کێوی ئاواتی خزاندو، خانەیی ژینی ڕماند
وا خەیاڵە تاویدامو، بیرە پاڵی پێوە نام
بۆ ویساڵی، گەرچی هەرچی پێم سپێرا، نەم گەیاند
زەردەخەنەی، تیشکە تاوی دوو جیهانی عالەمە
وا کە ئەم ئیجاب و سەلبەی بۆ تەماشا داڕژاند
سەیری ئەم سەرداری عەردە، ڕۆڵەکانی چی ئەکەن؟!
یەك دزو، یەك حیزو، یەك ماندوو، یەکێ خۆی نەشلەژاند
ئاخ لەم دەستوورە سەختەو، داخ لەو نارێکییە
دادو ئاشتی کەوتە پاش و، تەفروتونا تاوی ساند
چی بکەم لەو خۆشەویستەی دڵبەرو ئیمان و دین؟!
چاندمی و ئاوی نەدام، میوەو گەڵای ژینی وەراند
تێ ئەگەی هێزی هەیولاو، زینەتی سوورەت هەتا
چەرخی ماموشۆ هەبێ، هەر ئیش و کاری ڕاگەیاند
کەین و بەینێکە لە بەینی چەرخ و هەڵسوڕێنەکەی
لێکەڕێ (ژیکۆ) کە کاریان ستە یا ڕایانپەڕاند!!.

(١١)

لەسەر تۆ نامەوێ ئەرباب و فرزەند
بە قوربانی قەدت، سەروو نەی و قەند
ئەوەند فرمێسکی من دەشتی سەفادا
دیارە وا لەناو چاوم، دەماوەند
شەکەر خەندەت، شکاری ڕۆحی عاشق
سەری زوڵفت، عەجەب زنجیری دڵبەند
مەفەرموو چاوەکەم لێی عارە وەسڵت
بە ئەمری ئەو، موژەت وا بۆتە پێوەند
لە لای تۆ هەرچی بێ، بۆنی وەفایە
لە لای من گەر هەبێ، هەر سۆزە بێ فەند
تەماشای کوڵمەکەت، لەززەت نیشانە
لە خۆشیدا، کە زوڵفت بۆتە ئەرژەند
بەهانەت بوو، وشك بێ چاوەیی خوێن
بە خوێن چاوم سپی بوو، وەعدە، ئەم سەند
لە تەحقیقاتی ئەهلی دانشیدا
بە دوو قیسمی تەبیعەت، زوهدە، یا ڕەند!!
بەڵام (ڕاجی)، لەسەر ڕووی نازەنینت
ڕەگی زوهدو ڕیای وەك دێو هەڵکەند.

(١٢)

لەم لەعلی لەبمت کێیە، بە ماچێکەوە خورسەند؟
دووری قەدەحی لالە، بکێشێ لە جگەر بەند
عیشوەی قەدەمی نازی تۆ، ئەی سەروی سەمەن بۆ
بردوویە بە تالان، دڵی تورکانی سەمەرقەند

مەخشێنە لە ئەو گەردنە، ماری سیەهی زوڵف
مەشکێنە هەوای گەنجی سەفا، بۆ حەبەشی چەند
تا سەڵتەنەتی شاهییە، بەم حوسن و جەماڵە
بۆ قەتڵی منی خەستەیە، بەستوویە کەمەربەند
کافووری لە قۆڵ گرتووە، ڕەسمێکە لە بازوو
پەنجەی لە دڵم خستووە، خوێنی لە خەنەی سەند
لالەی هەمەدان، موتەزیری ئەشکە لە چاوم
گەردن کەچی خوێنی جگەرە، دامەنی ئەڵوەند!!
ئاهم، کە سەمای گردووە عەرقی تەم و ماتەم
تێدا بزرە، قامەتی سەد کێوی دەماوەند!!
بۆ بەزمی خەرامیدەنی ئەو نازکی شیرین
فەرهادی دڵم، کێوی تەن و عشرەتی هەڵکەند
سەرچاوەیی حەیوان، چ دەکا مەیلی سەمەندەر؟
(ڕاجی) وەرە تۆ بمرە، بەبێ یاری شەکەرخەند.

(١٣)

وەختی کەشاکەش بۆ مەدەد، سەرکێشە خاڵت بێ عەدەد
هەڵمەت ئەبەن جەیشی ئەحەد، ما مثلهم عوض یَجِد
بەر ملك دل دعوی زنان، تحوی الزمان والمکان
دەڕژێ دڵ و جەرگ و ژیان، والکُلُّ شیئاً ما اُعتمَد
جائَتْ صَبا تَفشي الهَوی، دەردو برین دەکا دەوا
في حَرب العِشقِ واْستَوی، بر پای بیماران خرد
دوێنێ لە ڕێ پێم پێکەنی، فرَّجتُ في تَصدّني
گفتم کە تو شاه منی، فاْشغلني فیم یقتَصد

(راجـی) بیـا خـون خـور بـدل، لاتقتـصر ولا تَحـل
بر خیز جانان کـن خجل، فـەرمو بیۆسـە جـام و خـەد.

(١٤)

چـاوەکەم، چـاوەنووارِم چ بـە کوشـتن، چ بـەجوود
بێکەس و رووت و ڕەجاڵم، سەری حەسـرەت لـە سـوجوود
ئولفـەتێ بـا بکـرین پێکـەوە، ئـەی نـازك تـەن
بە دەف و شادیی و عوشرەت، بـە مـەی و مەسـتیو عـوود
شاهیدی حاڵـە، خـودای عالـەمی هـەر کـەون و فەسـاد
لـە دلا ناچـیـە دەر، ڕۆژی حیـسابات و خلـوود
عـادەتی عیـشـقە سـەری ڕاسـتیو ڕۆحـی کـەرەم
ناڵـەیی وەحـدەت و ئەشـکی تەلـەب و زیکـری وەدوود
چ مەپرسـە تـۆ لـە ئـەم زاهیـدە دنیـادارە؟
ئیـشی ڕێکخـستووە سـا یـا بـە درۆ، یـا بـە درووود
ئـەی سـەنەم، ئێستە مەگـەر حورمـەتی ڕۆحـم ئـەگری
تـەنی جێهێـشتووە، هێناویـە دڵیـشم بـە ورووود
وەکـو (ڕاجـی)، سـەری ئێـوارە هـەتا بـانگی سـەحەر
هەڵدەکێـشم قەبەسـی ئـاه و، تـۆ ناترسـی لـە دوود!!.

(١٥)

میهری ڕوخسارت نیشانەی ڕەحمەتـەو ئـەیامی عیـد
فـاحترز في الإنجـلاءِ مـن کُـلِّ شَـیطانٍ مَریـد
وا ڕەقیبان گەنجی دڵبەر دا دەکـەن، ناکـەن خـەیاڵ
یَـوم یحمـی ثـمّ تکـوی جِـبهم، هَـل مـن مَزیـد
لارو لەنجـەت کوشـتمی، جانـا لـە بـەینی دوو ڕجـا
کُـلّ ذیـنٍ في قَریـبٍ منـكَ مِنّـي في بعیـد

ڕوو مەپۆشە لێم بەکوللی، گەر بە ئەمری خـوا ئەکـەی
قـُـلْ یَغـضّوا مـِـن عَـدا یَغضُـضْنَ مِمَّـن لا یُفیـد
گـەر فریـشتەم بێتـەڕێ، ئـەمجارە بگـرم دامـەنت
أغْتَـرِقْ فیمـا أحـبُّ، أغتَـنِم مِمّـا أُریـد
سەر بڵند ناکەم لەچۆکی حەسـرەتا، تـا ڕۆژی حەشـر
إنْ تُـدعني في الوِصـالِ، أو تُعـدني کالطَریـد
شـوکری مـەولا واجیبـە دایـم لـە وەصـڵتدا بکـەم
إنَّ في التَـألیفِ ذَوقـاً، ذاكَ أیّـام سَـعید
گـەر قبووڵمکـەی غـولامێکم لـە قاپیتـا، مـەدام
إنَّ غَـیري في الحُـضورِ لَـیسَ إلاّ بالبَلیـد
دێمە مەیخانەی ویـسالت، بگـرە نـاو دەسـتم قـەدەح
مِثـلْ (راجـي)، أقتَـدیكَ في صَـفا النَّـشاِ الجَدیـد.

**

-ز-

(1)

دەسـتەئەژنۆ، دڵ بـە تـابم یـا مـەلاز[1]
دەردەدارو حـاڵ خـەرابم یـا مـەلاز
ڕووم نیـە، گـەر بـچمە نـاو عالـەم دەمـێ
سەرگوزەشـتەی پـیرو شـابم یـا مـەلاز
پـڕ هەناسـەی سـەردو ئـاه و ماتـەمم
پـڕ بڵێـسەی ئێزتیـابم یـا مـەلاز
دڵ لـەلای دڵبـەر بـە نـەوعێ سـاکینە
تـەن کـزو سـەر ئاسـیابم یـا مـەلاز
گـەر بوەسـتم مـن لـە قـاپی مەحـشەرا
قوڕبەسـەر خـۆم، بـێ جـەوابم یـا مـەلاز
مەقـسەدم دوورە، فیراقـم دائـیرە
حـیرەتم، نێزیکـە وابم یـا مـەلاز
دوور لـە ڕەحـم و شـەفقەتی دیـوانی تـۆم
غـەرقی دەریـایی عـەزابم یـا مـەلاز
سـەر نویـشتم، ڕەنـدیو بێباکیـە
عاقیبـەت مـەوجی سـەرابم یـا مـەلاز
کەوتـە چـاڵی هـەتك و (ڕاجـی) دەرنـەهات
وا بـەتاڵان چـوو شـەبابم یـا مـەلاز.

**

---

١- سەرروای ئێرەکانی ئەم هۆنراوەیە بریتیە لە (مەلاذ ملاذ) کە بە واتای ( پەنا) دێ. لێرەدا مەبەست لە خوایە، وامان بە باش زانی بە ڕێنووسی کوردی بینووسین.

-ر-

(١)

(دەنگی لادێ لە کۆیە)

تــازە ڕۆژی عالەمــە، ســەر ســاڵە ئیمــڕۆ، نەوبــەهار
خوێن جما، ژیــن سەرکرا، هەرزانە هەرچی هاتە شار
شـــارو دێ ئامادەیـــە، بـــۆ ئـــاوەدانیو تێکـــەڵی
بــۆ مــشوورو ئــەرکو دانــانی هــەزاران ئــیشو کــار
مێرگــەکان سەرسامی ڕەنــگو بۆنی خۆیــانن، هــەموو
هەر چڵە گیاوو گوڵووکێـك، شەونمی خەنـدەی بە زار
گوڵ بە سەوزی بەرگی پۆشی، وەختە ڕووی گەش کاتەوە
نێرگــزی بــێ سەبرو بیرە، ڕووی سپی کــرد چاوەزار
هەرچی مــەوجودێکی بیری لــێ بکــەی وا خــۆی نوانــد
لەشــکری سەرمای شــکاندو، سەربەخۆ گرتــی هــەوار
هایــدرۆژین، غــازو ئــاتۆمی بــە بــادا ڕۆژی ژیــن
تــازە بنیــاتی ئــەنێ، هیــوای وڵاتو گیــاوو دار
قیــل یــا أرضُ ابلعــی مــاءَ سمــاءُ أقلعــي
تــا لــەجودی عــەدل کەشــتی لەنگــەری بگــرێ قــەرار
هــۆزی هەڤپــەروەر، لەهــەر شــوێنێك، نویــێ ڕۆژی هەیــە
قــەومی عــادی دا بــەقڕ (بَــردُ العَجــوز) ی ئیعتیبــار
هێــزی مانــا هێرشــی هێنایــە نــاو دنیــا، ئــیتر
هــەر شــتە عاشــق بــە ڕاوێژێکــە، سەیری تــەیرو تــوار
گەر موسڵمانن، براو بــابو کــوڕن، هــەر کــەس بــە ڕیــز
ڕێــزی لێبگــرن بــەپێی خــۆی، ئوممیــە یــان خوێنــدەوار

فــادْخُلوا في الـــسّلْمِ جَمــا بـــسلام آمـــنین
وادْفعـــوا بـــالحَقِ كُفْـــراً و نفاقـــا فالْبــدار
ئـەی بـرای کـوردو عـەرەب، بـاوەڕ کـە کۆتـان کاتـەوە
وەرنـــە هانـــای یـــەکترو، بـــبڕن لـــە دوژمـــن ئاســـەوار
دوو هـــەزار ســـاڵێکە قـــەومی جوولەکـــە پـــەرت و بـــەخێو
یەکدگیر بـوون، ئێستە ئەیکـەن هەرچـی کـاری نالـەبار
ئـەم هـەموو فـێڵ و دەسیـسەی خەڵکـە، لێتـان ناگـەڕێ
هـەم زەمانینـە، دە ئێـوەش، سـەر بڵندکـەن جاروبـار
ڕوو لە ڕووی ڕەنـگ و بریقـە، کێـوو کـەژ ڕەوشـەن کـران
بۆتـە دمریـا شـەوق و ڕوونـاکی لـە هـەر کێڵگـەو بـەیار
ئاسمـــان بـــاڵی بەســـەر کێـــشاوە، پـــەرژینی ئـــەکات
کـێ هەیـە لـەم عالـەمی نـەورۆزە، مەحکـەمتر حەسـار؟
فـەرقی ناکـەم، بـۆ هـەموو خەڵکێکـە پێکـەڵێنک و ڕێـك
کوێر بێ چاوی ناحەزی، گەر وەسوەسـەی خستۆتە کـار
ئـادەمی خـاکی، پـشووکێش و کـە خـۆڕاگر ئـەبێ
نەشـڵەژێ بـا ئـەهلی بـاوەڕ، قـەت لـە ترسـی نابـەکار
ئـاگری شـەڕ هەڵئەکـەن، قـەت خـۆ بـەخۆ ڕێکناکـەون
سەیرە بۆ نەورۆزی ژین، ڕێکخـا مـەڕو گـورگ و هـەژار!!!
چـەرخی گـەرمازۆ، کـە ئاشـی بـیر و هۆشـی نایـەوە
کـــۆن و تـــازەی کـــردە بـــاراش و نموونـــەو یادگـــار
مەرکـەزی خاکـت، کـە بـیری ڕەوت و نـەوتی هەڵقوڵانـد
پێی بـەخاوەن کـەن کـەداوو، بـێ نـەواو پـەرپووت و تـار

**حاڵەتی (ژێکۆ)، بە ڕووتیی جیسم و هۆشی پۆشتەیە**
**کاری سەد وەستا ئەکا، شاگردە ڕووتەی هۆشیار.**
**نەورۆزی / ١٩٥٤**

**(٢)**

**(ڕێگای نیشتمانپەرستی)**

**هەموو دوژمن، لە تۆ بوونە سەگی هار**
**ئەتۆش کوردی، نەبووی خوێنڕێژو خوێنخوار**
**برام، کەی تێئەگەی کرداری دوژمن؟**
**پەلامارت ئەدا، نەیدەی پەلامار**
**ئەگەر خۆشت نەناسی، من بناسە**
**کرێکارم، کرێکارم، کرێکار**
**دەرامەت گەر هەبێ، بۆ هۆزی پڕ ئیش**
**دەس و باسک، هەموو دەبنە گرێ دار**
**گرێدەن پەتک و مل، شان و گوریسان**
**سەری مەردی بەرز کەن، مانگی ئادار**
**بە جوتیاریی، بە جووت، یاریدە دەن هۆز**
**بە تەنیایی مەکەونە هاتو هاوار**
**بە هۆ هۆ، وەرنە سەرچاوانی چاندن**
**بە هەو هەو، بووکی هیواتان بکەن سوار**
**بە لێژەن لێژەن و، مەیدان بە مەیدان**
**بە بیرو هێزو خۆشی، غار بدەن، غار**
**چەکوچ بەندان و هۆنین کەن، لە کانگان**
**بە جەنجەڕ گێرەکەن، خەرمانی بەدکار**

بەکارخەمن خاکەناس و، بیورو تەوراس
بمالن، بیقەلێشن، ببڕن دار
مەدەن ڕێی گاڵەگاڵ و، واتەیی بۆش
بنووسن نامەیی مەردیی، بە تاو بار
بە ئازادی لە ڕوودا دامەمێنن
کە ڕووڕەش بن، ڕەش و ڕووتن، هەموو جار
دزو، بوختانکەرو، حیزو، درۆزن
دوایی، هەر لەناو قوڕدا ئەخەن بار
بە دەستوورو، بە پیلان و، بە پیلان[1]
بە بەرزی گەل، هەموو کاتێ بکەن کار
وەکو خونچە، دەمی بەستەو دڵی ڕێک
نە وەك گوڵ، دەم بەخەندەو جەرگی بیمار
لە ڕووی دوژمن، کە پشکووتی وەکو گوڵ
بە تلیان ئەتجنن، ئەتبەن بەرەو شار
ئەبێ بۆنت بکەن، پیس و گول و گەڕ
کە سیسیش بووی، بنێسای، ناتگرێ چار
لە قاڵب نەخشی ڕێکیی دابڕێژن
تەنافی لێبدەن، تامان و دیوار
دڵت باوەڕ نەدا، هەرچێ پیاچووی
بناڵێنن لەبەر دەمتا، برینداڕ
شتی خۆت دایە خەڵك و، چوو لە کیست
فرۆشیاریش نەبووی، لێت بوونە کڕیار

١ پیلان: نەخشەو بەرنامە. پیلان: گۆی پیل: بازوو، شانو پیل.

لـە ڕێـی هـاتیی، کەچـی پێـدا نـەهاتی
لـە لافـاوی بـەڵادا، بـووی گرفتـار
بـە دەم دەردو قـەزادا، بـێ قـەزا بـن
بەسـە، بـۆ دوژمـن مەبنـە چـینی دیـوار
وەکـو کارتـەیی تـەڕ، داچـەمیون
گرانبـارن، گرانبـارن، گرانبـار
دە بنـە کۆڵەکـەی هـۆزو، بـە هێـز بـن
کـە ڕابگـرن بـە سـەر، ڕاژەو گـڵ و دار
زراو ڕێـژاو مـەبن، چـیتر لـە دەسـت خـەڵك
ئـەوانیش ئـادەمیزادن، زراودار
لـە لاتـان، هەرچـی بـێ لـەولاوە گورگـە
بـە خۆتـانیش، بـەرانێکی کـەوی سـار
دە هەسـتن، دامەنیـشن، هاموشـۆ کـەن
دە ڕا بـن، شـارەزا بـن کێـو و ڕووبـار
وەکـو دووبـشکە کـوێرە، هـەر بـە هەسـتی
کـەلێ جـار، چـۆتە سـەر تـەپڵی سـەری مـار
پـشیلەش، سـەگ ئـەخنکێنێ بـە ڕێکـەوت
قـولاپێکیش نەهـەنگ ئـەگرێ، کـەلێ جـار
ئـیتر خـۆ ئێـوە هـۆزێکی بەجێـشن
لەگـەڵ (نـوح) یـش، لـە تۆفـان بـوون ڕزگـار
لـە کوردسـتانە دامـەزران و مـەزران
بـە دیـداری دیـارو، بوونـە دووچـار
ئەگەرچـی خـوێنڕژاون، دڵ پـڕژاون
کـە بوونـە خوێنـدەوار، ئەشـبن بـە خوێنـدار

ئـیتر(پـشكۆ)، هەتاكـەی هـەر ئەسـووتێی
لـە ئـاگردانی هـۆزی بـێ كەسـوكار؟!!.
١٩٤٨

(٣)

داشۆرینی فەرمانگەی ئینحیساری تووتن لە كۆیە
دوور لەڕەحمەت، بێكەسی هێنایە سەر بەش، ئینحیسار
دەس بەلەرزین، چاو بە گـل، قاچی شەل و، دڵ نالـەبار
لەشكری رووتـی و فـەقیری خسته ولكەی نیشتمان
شەق دوو شانی گرتووە، زیـرەی كەمەنـدو زولفـەقار
هێند شـەپرزەو ناهومێدە، هـۆزی كـوردی دەربـەدەر
تـووتنی وا هاتـە سـووتن، چـی لـە كووتـاڵی توجـار
فـەحس و تەفتیشی لقێك و، دوو لقی تەمغـەو قـەپان
تـا چـەكی ئـەبڕێ، بـەری بۆگـەن ئـەبێ سـا پـیرەدار
ڕەسمـی ئـەم پـوول و ئیجـازەش، وا شـەپۆلێكی نوانـد
پـێی دەخنكـێن بێكـەس و ڕووت و ڕەجـاڵ و سەنگەسـار
قائیمـەو زنجـیرەوو تـەئریخ و نـومرەو، چـەندو چـوون
نـان و ئـاوی نیومرۆشـت، لـێ ئەكاتـە ژەهـری مـار
باسـی دان و، گـرتن و، وەرگـرتن و، هەدیـەو خـەلات
نـاكرێ، ئـیللا بـەزەبری دەسـتی پـاكی خوێنـدەوار
مووی ڕەشی ڕیشت شریتی فەردەت و، گونیـەت گونـە
داڕزیـن هـەردوو بـە ئـاوی دیـدە وەك تـاوی بـەهار
وا ئـەهالی هـەش بەسـەر، زووخـاوی لـێ ئەخواتـەوە
نێرەمووكـە نـەك لـەڕۆژا، ئـەو شـەویش نایێتـە كـار

هەر کە ڕووی دیناری دی، بێچارە، خێرا ئەیمژێ
پێت بڵێم تیمسالی؟ عەینەن کچ لەباوەش هەرزەکار
زۆری وایە، وەك ژنێك هەشت ئێکی خۆی داوا ئەکا
ئاخری، کچ نیوەیە، کوڕ دوو بەشە، مێرد ئێك و چوار
چی ئەمێنێ؟؟ خزمی دوورو دوژمنی قەرداری جاو
جگ لە لێدان و جنێوو، حەپس و حیجزی ئابەکار
کاکە باسی چی بکەم! هەرچی هەژارە بۆتە کەر
ئەهلی گومرگ و توجارو ئاغە بوونە کەرسوار
میللەتێکی وا، بەسەرخۆشی و بەسەربەرزی بژی
خوێنی خۆی ئەیکاتە یارو، دەوڵەتیشی پایەدار
مامە! هاوینت بەسەر هات، عەردو بەردت خۆش نەبوو!!
ئاغە! قوربان، نیمە زادو، شەتڵەکانیشم خەسار
ترتڕەی[1] لێ داوە، کرمی زۆرە، پارەیشم نیە
هەر ئەتۆی خاوەن کەرەم، خۆت ساحەبی، من بەندەوار
جگ لەتووتن، لەعنەتی لێدا، بەڵام تەمونەکەش
بۆتە سەرباری گران و، بۆتە ژەهرو کلکەمار
وا تەرازووی عەدلی داناوە، لە عالەم بەش ئەکا
بەو پەتاقەو تەسکەرەو، بەو ئیستیمارەی دەشت و شار
بەعزە شەخسێکە، کونێك و، سەد پەتاقەی پێوەیە
دەست و لێوی شیرنە، هەنگوین فرۆشە، شەکرخوار
هێندە کەس، پەڕپووت و ڕووت و لێو بەسرکەو تاڵی غەم
کێرو گون دەرچوو لە ڕانك، بێ بەش و ئومێدەوار

---

١ ترتڕە: ڕووەکێکی خۆهەڵوسە، خۆی لە قەدی ڕووەکە کشتوکاڵییەکان دەهاڵێنێ و خۆراکی ڕووەکەکان دەمژێ بەمەش خۆی بەهێزو ئەوانیش لاواز دەکا. بە عەرەبی پێدەگوترێ (حامول).

بەگ! بەقوربانت دەبم مانگێکە لێرە ماومەوە
گوم بووە ناوو پەتاقەم، خێرە گەر بمکەی قوتار
دەی دەریکەن، ساختەچی، کرمانجی سەگباب، بێ ئەدەب
ناوی خۆی نایێتە بیر، ئینجا دەپرسێ خزم و کار
گەر پیاوانە کەسێ ڕاستی بڵێ، هەر بێ بەشە
ساختەچی چاوی گەشە، کوێرە دڵ و چاوی هەژار
ئەی خودا چیت کرد بەهۆزی سەربڵندو پێشەوا!!
کاربەدەستی هەر لەخۆیە، خوێنی خۆی ئەخوا بەزار
چی لەتۆ کەم ڕۆڵە؟ زڕ دایك بوو تۆی بۆم پێکەیاند
کەی ئەگەیتە باوەشی ئەو دڵبەرەی سیمین عوزار؟!
ڕۆژی مەرگت هاتووە، وا ئادەمیی بۆتە خودات
هەی خوڵات ببڕێ، لەگەڵ پێشچوون و حیزی و ئینتیحار
تاوی نووسینم نییە، ڕۆڵە نەماوە غیرەتم
وا لەبەر برسییەتی و ڕووتیمە بوومە لەرزەدار
تا بەشی خۆم پێ ئەدەن، سێ بەش هەموو ئەمپشکنن
با ناڵیشم بنووزێنێ لە دامەن مێرخوزار
(ڕاجیا)! هەر پیرقەڵ و، جووتێ برازای دەرئەچێ
سەد بگۆڕی جێگەت و، سەد عەرزو حاڵت بێتە کار!!.

١٩٤٣

(٤)

بەهار

چ سافە هەواوو چ خۆشە بەهار
بە ئاوو پلوسك و، بە بڵق و بوخار

لە فەرشی زومەڕڕەد، گیاو گوڵی گەش
شنۆی شەنگەبی و سێوو سەروو چنار
بە بۆنی وەنەوشەو، بە خەندەی گوڵان
بە ئاوازی قومری و، چریکەی هەزار
پیاڵە لەسەر دەستی ئارەقکەشان
پڕی چەنگە موتریب، زرەی چەنگ و تار
گوڵاڵە لە سارا ئەڕازێنەوە
کەمەی کۆترو، قەب قەبەی کۆهسار
بە حەیرانە گەنج و، بە بالۆرە کچ
بە پێوانە بادەو، بە لەرزانە یار
لە ژێر خێوەتی بەرزی پیرۆزە ڕەنگ
لەسەر سەوزە شاڵی گیا، نەرمە غار
لە رووی بەزم و شادی کچان و کوڕان
هەموو دەوڵەمەندن، فەقیر و هەژار
کە شەونم ئەنیشێ لە زوڵفی بوتان
لە لوتفی خوداوەن، پڕن دەشت و شار
لە نەورۆزی کوردانە بگرن جەمات
بە سۆزی دڵ و، شوعلەیی نوورو نار
لە نەورۆزی تۆیە بەهەشتی خودا
کە ئەژێنیەوە مەردوم و موورو مار
هەموو مێرگ و باخات و فیردەوسی پان
هەموو حەوزو ڕووبباری ڕوون و گەوار
شەرابەن تەهوورو، شەرابەن تەری
لە هەنگوین و شیریش، بنۆشن بە زار

مــەڕو بــزن و مــاڵات و گــامێش و گــا
بـە دەم گوێرەمـەو، گوێرەکـەو بـەرخ و کـار
زەڕینـــی کـــەران و، وەڕینـــی ســـەگان
میــاوەی پــشیلەو، گــزەی تــەیرو تــوار
لــە حیلــەی کەحێلــەو، زریکــەو نــەزای
وەکـــو هـــەور مـــاین ئەڕێـــژن خوســـار
لــە پــەردەی تەماشــا، هــەزار ســینەما
لـە بیـستن خەبـەر، زەنگوڵـەی کـوردو کـار
لـە هـەر لا سـەرت سام و، دڵ گێـژو مـات
لــە هــەر لا خــەریکی گەلــەو کــارو بــار
لـە شڵقاوی مەشکەو، لـە کونـدەی شـەوی
بــە غیلمــان و حۆریــت، بەهەشــتە هــەوار
زڕەی دەســت و بــازن، لــە ڕێگــاو ســەراو
دڵان ڕائەکێـــــشن، بـــــە کەشـــــتوگوزار
وشــەو باوەشــێنی ســەباو پرچــی ڕەش
خــزەی لفکــەدارو، مــژەی بــێ قــەرار
لــە زیــڕەی گــوارەو، زریکــەی بــەروێ
خونــاوەی ســەمڵ، بــۆنی مێخــەك، تــەغار
تەبــەق پرگــوڵ و، لالــە دەکــشێ بەشــان
عــەرەق پــڕ دڵــی والــە، ئەڕژێتــە خــوار
لــە واق واقــی ڕێــوی و، گــزەی دوورەشــێر
لـە گرشـەی بـەرازو، هوشـەی گـورگی هـار
کــە واق ورئــەمێنێ، لــە چــوار دەوری دێ
بــرا گیــان غــەریبی، مــەدە خــۆت حەشــار

درِنــده دەســتەمۆ، لەبــەر دەســتی کــورد
هــەموویان کــەوین و، هــەموو بەســتە بــار
لەگـــەڵ بادەنۆشـــان، بنۆشـــن شـــەراب
لەگـــەڵ نـــازداران، بکەونـــە قومـــار
لە نـۆی مـارتی ڕۆمـی، بـە نـەورۆزی کـورد
بـە مەشـق و زەمـاوەن، مەلـەك دێنـە خـوار
لــە جیلــوەی گوڵــووك و، گــوڵاوی گیــا
چ گەنجانــە مێــزەر ئەکــەن پــیرەدار
لــە شــاران و لادێ، پــڕی دیوانــە بــەزم
لــە ســاراوو دەشــتیش، هەڵئــەدرێن دەوار
ئەگـــەر زەردە مـــەم، بێتـــو بفرۆشـــرێن
بە هـەرزانی بکـڕە، بـە گیـان، ئێـك و چوار
لــە کــێش و کڕینــا نیــە ماچــی لێــو
مەگــەر پشکە خێــر، بەرکـەوێ جـار بـەجار
بــە چــەپڵەو، بـە سـەیران و شـایی و سـەما
کــە لــەو ڕۆژە ئــەمری کــردووە کردگــار
گرۆهـــی غـــەریب و عـــەزیزان لـــە تـــەك
ســـڵاوو ســـوپاس و گوشـــین و بنـــار
ئـــیتر، جـــەژنی تـــەبیات و ڕۆژی دڵـــە
ژیـــانی وجـــوودە، بـــەبێ ئیعتیبـــار
بـــە پیرۆزبـــایی، کـــە (ژیکـــۆ) ئـــەڵێ:
بـــە خۆشـــی بـــبن بـــەرزو پیرۆزگـــار.

١٩٤٦

## (٥)

## خونچە

خونچە پشکووتن لە باخ و، شاهیدن موختاری شار
پێشنیارێکە، بە یاسای دیمەنی جوانی ویقار
خونچە عاجز بوو لەدڵ، بۆ بولبولانی پێکەنی
وا بەجێدێڵێ چنارۆک، چش لە باخی سەرچنار
خونچە، ڕوو سووری خەجاڵەت ما لە قاپی مێرغوزار
چاوی زەردو ڕووی سپی، نێرگز لە چاوانیا دیار
خونچە خاڵی سەر دەمی وا نەودەمیدەی دیدەیە
خوێنی دڵ پێی هەڵەچێ، وەك بڵقی جەرگی هەرزەکار
خونچە قەترەی شەونمی ئەسرێ، وەنەوشەی زوڵفەکەی
باقەیێکی ئەژدیها، کردوێتە کەسکی چاوەزار
خونچە بەو گرژینەوەی، ئەژێنەوە پیرو جوان
بەو دەمەی تیمار ئەکا، مار پێوەداوو دەردەدار
خونچە شادی کا بە خەڵکی، موتەهەم نابێ ئیتر
چاخی سەیران، چی بەسەر بازاڕی سەوداوو قومار!
خونچە با نەدرێ یەخەی، چیتر لە داخی بولبولان
با بەشەو تاکو سەحەر، ببڕێ لە یارانی دەمار
خونچە ئازادی ئەکا، بازاڕی نۆشی دائەنێ
با نەکەونە داوی عیشقی ڕۆستەم و ئەسفەندیار
خونچە باسی خەم دەکا، بۆ ڕەندو لاوی دڵتەڕی
بێ دڵان، با هەر بکەن هاوارو بانگی پڕ بە زار

خونــچه میــوانی ڕەمزو، نەشــئەی بــزوێو بــشڵەژێ
بــۆچ بکــەم باســی هــەواو ئــاوو بــەراوردی بــەهار؟
خونچه خوا هەڵناگرێ سیس بێ، لەباوەش بای سەموم
چۆن هەناسـەی مـارو دێو، بڕژێتە بـادەی پڕ خومـار؟
خونــچه تــا دوگمــەو بــەرۆکی، بیترازێنــێ لــە جــێ
قاچی بۆ هـەڵنێ، کـەلا پەخشانکە، چەشنی پیرە دار
خونــچە، هــەر بــۆنی بکــەو هــەردەم ببینــە دیمــەنی
بگــرە نــاو ئــامێزی شــادی، خــانمو خاتوونــەوار
خونچه، تا تیمـاری زامـی چـاوی (ژیکـۆ) کـا، بـە ڕوو
نایــەوێ دووربــین و عەینــەك، یــا تــەبیبی نالــەبار.

١٩٤٥

(٦)

گوڵ تەنا! مەرگی منت خستەوە سەر بەرگی هەنار
کوا لەسایەی قـەدەمت، مەقبەرە، بـێ پـایی چـنار؟
سـەروەرا! عەرعـەرو شمشـادو نـەیو بـانی قـەدت
وا لـە گۆشـەی دڵەکـەم، ڕستەیە وەك بـاغی بـەهار
ئەتپەرسـتێ لـە بنـا گۆشـەوە، تـا پـایی سـەلیب
چ دەبـێ؟ عەبـدی سـەنەمپەروەری تـۆ بێتـە کـەنار
لـە جـەبین، مایـەیی سـووتانە عـەرەقناکی دڵـم
لـە ڕوخـا، چـارەیی برژانـە جگـەرها، دشـوار
سـووزەیی مـاچـی لـەبت، سـۆزی دەروونـی ڕێـشە
عـەرەقی گـەردنی نـوورین بتکێنـە بـە نەسـار
نـەدەمێ دێیـە عیـادەت، بـە نەسـاغی عیـشقت
نـەدەمێ مـەیلی ئـەکا، چـاوی سیاهت بە خومـار

چ بیابانە بەڕووی عیشقەوە، ئەی لەیلا خوو؟
چ جنوونێکە لە کەللەم، نییە ترسی کۆهسار
ئەی پەری هەستە، پڕی چاوی قەدەح بادە بدە
مەغزی ڕۆحم، کە گەلێ وشکە بەبێ شەربەتی یار
سینە پڕ ئاگری گریان و عەزابە، (ڕاجی)
بۆ بسووتێ بە گوناهی دەم و لێوت، عەیار؟!

(٧)

ڕوویی بلووریی تۆ، ڕێکە بە تایی عوزار
لامەدە دەگری کە یەك ڕێکە لەسەد چاوەزار
تۆزی ڕەمە و دامەنم، هەڵئەوەرم دەم بەدەم
وەختی خەرامیدەنت، دەم دەمیش ئەگرم هەوار
سەیری دەماغم مەکەن، وا دەمی غەم چۆتە ڕووی
خوردە کە خۆی ناگرێ، قەت لە دەمی گورگی هار
ڕەسمی حیجابت بەڵێ، مایەیی تاریکییە
بۆ منی سەودازەدە، یا دڵی زارو هەژار
وەعدە لە هەق تێپەڕی، وەختی تەحەممول نەما
کەعبەیی من بۆتە ڕووت، دوژمنی من بووە قەرار
گەردنی مینایی تۆ، لالەیی شەوقی جینان
خەندەیی ئەنواری تۆ، مەعریفەتی کردگار
سوورەتی تۆ بێ میسال، سیرەتی تۆ کافریی
حەیفە کە ئەو نیعمەتە، ئەم دڵە کا ڕەنجەبار
خێوەتی زوڵفت مەقام، شەربەتی لێوت دەوام
تا ئەمە خوا ڕایگرێ، بۆچمە کۆشك و تەلار؟

ڕشتەیی ئەشعاری مـن، مـەغزی دوڕو گەوهـەرە
واجیبە (ڕاجی) لە پێی دڵبەرەکەت کەی نیـسار!!.

(٨)

لـە ئەگریجـەت کـە دەڕژێ موشـکی تاتـار
کـشا بـاری دەمـاری مـن، هـەتا تـار
بـە ئاسـتەم هـات هەناسـەم، زوڵفـی بـردی
ئەمەنـدەم مـابوو مـن، سـەربارو بـن بـار
بـە ئومێـدی کڕینـی چـووم و، فـەوتام
ئـیتر هەروایـە قوربـان، سـوودی کڕیـار
دەمێکـە دەنگـی نایـا، جـان خەبـەر کـا
لـە پـەردەی دۆسـتییدا، یـاری خـەممار
شـەوو ڕۆژم لـە بـاخی شـین و ئـەحزان
نـەعیمم ئەشـك و ئاهـە، دۆشـەکم خـار
کـە پەنجـەی دا لـە دەرگـەی ئـەقڵ و ئـارام
تـرازا پێـوە یـەك دەم دارو دیـوار
عـەجوولیم کـردو نـەمزانی لەسـەر چـووم
لـە دەسـتم چـوو، تـەواف و حـەججی دیـدار
کـە عـەودەت بوومـەوە، جـەرگی بـڕاوم
لـەبی هێـشتا بـە دەس، نـەك نـوقڵی گوفتـار
کـە شـەوقی دڵ هەڵـستا، هەسـتە (ڕاجـی)
نـەبێ باکـت، بـە جـەوری یـارو ئـەغیار.

(٩)

زەلیلـە دڵ لەبـەر هیجرانـت، ئـەی یـار
تـەنم کەوتۆتـە بـەر تالآنـت، ئـەی یـار

ئەگـەر جـاریّ بـە عیـشوەم تـیّ ئـەفکری
ئەبـەی ڕۆحـم لـە بـۆ بوسـتانت، ئـەی یـار
جەماڵـت شـەیدە، مـن هـەر شـەو لـە داخـی
دەنـــاڵم، ناگەمـــە تابانـــت ئـــەی یـــار
نیـــە حـــەددم، بـــە بـــاخی لالـــەو گـــوڵ
لـە کوڵمـەو زوڵفەکـەی لـەرزانت، ئـەی یـار
لـە ڕێگـەی حـەجی وەسـڵت، بـیّ قـەرارم
دڵ و ڕۆح و جگــەر قوربانـــت، ئـــەی یـــار
عــەجوول و، بـــیّ شـــەکیب و، دەردمەنـــدم
بـە دیـدەی نێرگـسی فـەتتانت، ئـەی یـار
لـە خاسـەی شـاهزادەی (شـەهرەزوور) بـووم
ئەمێـستە خـادیمی غیلمانـت، ئـەی یـار
نـەبوو جـاریّ لـە ژێـر چـەوگانی زوڵفـت
نـەبینم دڵ لـە نـاو مەیـدانت، ئـەی یـار
تەڵـــەبکاری شـــەرابی چـــاوە (ڕاجـــی)
مـەزەی ماچێکـی دوو لێوانـت، ئـەی یـار.

(١٠)

(دنیا خۆیێوەنانە)(*)

دلـبر ماسـت هـر طـرف، بتلـەرەدن، سـپرینگ دەر
بەر سەری خەلق باشقەسی، جەورو جەفایە کینگ دەر
فێـسنە ئـویش یازیـەم، باشـوە گـویزی ئوویـەرەم
زات ئس کلیڤەر گێرڵە، هەپـسی مـەمان و سـینگ دەر

* ئەم هۆنراوەیە بە هەر پێنج زمانی (کوردی، عەرەبی، فارسی، تورکی و ئینگلیزی) نووسراوە..

تاکە در ئاهنگ گرب، موغبەچە پڕ لە عەکسی جام
یوزفلّو بیوتفلّە، پیش دلاّن گرینگ دەر[1]
قاشنە شمشێری هەرا، ئایسە گێتی ماجەرا
ئین همە دنیایی پەن، بۆ منی خستە ڕینگ دەر
وێن لەبی لەعلی ئاتەشی؟ أحرَقَ ذُروَةَ الهُدی
بر دل‌و جان، تو یور بروّس، داس‌و ڕەم‌و برینگ دەر
بحر غمەاست این جیهان، چون قەری مەچ بلایەوار
ڕێد، یەلۆ، ئاند ڤایۆلێت، برنجی دیشە دینگ دەر
خۆشی بە پیری گێوە دێ، في مَفرَقِ المنازِلِ؟
فَکُلُّ أدوار السوری، هەلاّتن‌و دوو لینگ دەر
وەرە، بڕۆ بنۆشە مەی، بپۆشە کۆڵەدو سیلقەرت
اخر کار در فنا، مەرگ‌و گلّو سلّینگ دەر
سەن نە پلاینگ گاردنە، (ژیکۆ)، بە ماچ‌و موچەوە
دنیایە سۆیلەیەم سەنە، خۆ پێوەنان‌و جینگ دەر!!.

١٩٤٨

(١١)

تو خوا وەرە مالّم، ئەی دلّبەری دین بەر
بنوێنە لەب‌و ڕووت، بەڕیا بکە مەحشەر
ئەی شۆخی هەوایی، هەر تۆم وەکو شایی
کاری بکە خوایی، بتهێنە بەرابەر
تۆ سەوزەوو ئالّی، نەرم‌و شل‌و کالّی
هەروەك کەوی مالّی، بخوێنە لەسەر سەر

١ لەشوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (یوزفلّو بیوتفلە، کۆترە یا قوێنگ دەر).

تـــیرت لەجگـــەر دام، تێمـــام و پەشـــۆکام
تاوامـــەوە، ژاکـــام، ئـــەی دڵبـــەری ســـەروەر
بێ ڕەحم و وەفـا تـۆی، پـڕ جـەورو جـەفا تـۆی
بـۆ سـەیر و سـەفا تـۆی، مەمکـە بـە سـەمەندەر
پـــیرم لـــە غەرامـــەت، گـــیرم لـــە نەدامـــەت
مـــاوم لـــە مەلامـــەت، بـــۆ مەرگـــەوو پـــشدەر
ســـەودا ســـەری یـــارم، بێـــدارو دیـــارم
وەك بولبـــولی زارم، بـــۆ غونـــچەیی ئەحمـــەر
تـــۆ حـــۆری جینـــانی، تـــۆ شـــەوقی دڵانـــی
خـــستنە گرانـــی، ســـەد ئاغـــەوو بەگلـــەر
(ڕاجـــی) چ فەســـیحی، دووری لـــە قـــەبیحی
بـەم شـیعرە مـەلیحی، لای حـەزرەتی دڵبـەر.

(١٢)

ئیمرۆ لەگەڵ شـەوقی سـەحەر، یـار بـۆ غـەزا کـە هاتـەدەر
ڕۆحم لەبالەب خۆش خەبەر، گرتی شەکەر، کەش نەیشەکەر
کـە هاتەســـەر لـــە خـــوارەوە، بـــە نـــازو لەنجـــەو لارەوە
بەچـاوی پـــڕ خومـــارەوە، کـــوردی ســـەرو مـــاڵم هـــەدەر
بەجەمعی دەسـتە خوشـکەوە، بـە شـەمعی سـۆزو ئەشـکەوە
مـەخلوقی خـستە ڕەشـکەوە، چـاوی هـەڵێنا پـڕ ئەسـەر
تیری موژەی دەرچوو لە دڵ، بە خوێن دەمیـدا لێـوی گـوڵ
شیشەی هەناسەم خول بە خول، هاتو لە عەرشا دەچووە دەر
حیجـابی ڕووی هەڵدایـەوە، ڕۆژ پـــڕ ئەســـەر پاڕایـەوە
مەوجی نـەزەر پونگایـەوە، قـوڵزوم بـە قـوڵزوم، سەربەسـەر

دەرسم بەئەفسون کردە خەم، شەرعم پەنادا یەك قەڵەم
چەندی نەڕۆیی زۆرو کەم، دیسان تەجەللی دا قەمەر
گشتی مونەووەر بوو سەما، بوە زەڕڕەبین چاوی عەما
پەردەی حەیا شڕ بوو نەما، هەر سوو لە عالەم موعتەبەر هۆشم
نەماوو تێپەڕی، عەقڵم لە پێ دا سەربڕی
ورگی ڕەقیبم هەڵدڕی، ساحەب دڵو سۆزی جگەر
مەستو غەروورو چاپکە، بێباكو نەرمو نازکە
یاقووتو خەمرو ئاسکە، (ڕاجی)! حەبیبەی خۆش کەمەر.

(١٣)

گەر یار بێتە دۆشم، ناچێتە کێشی دەفتەر
وەك شووشە عارەقو مەی، بڕژێ بە تاوی مەجمەر
گوڵ هەمدەمی سەبا هات، پڕ خەندە لەعلی نازك
باخی وەنەوشە ڕسکا، سەد شێوە ئەمبەرەو بەر
ئەی نازەنینی عەیار، ئەی دڵبەرەی جەفاکار
تاکەی بە ئاگری ڕووت، بتوێنمەوە سەرانسەر
وادەی شەرابو ساقیو عوودو قومارە، فەرموو
هەرچی تەڵەب ئەکەی دەی، مەی، شیرو شەهدو شەکەر
ناچێ لەبی حەبیبان، وەك مەرهەمی تەبیبان
پێویستە بۆ غەریبان، جانا بەڕۆحی دەربەر
دڵ جۆشی پڕ خرۆشە، سا دەی دەمێ بنۆشە
لەم شەهدی لێوە خۆشە، وەك دڵ مەبە موکەددەر
ئەم چاوە شۆخە ساقی، گرتوویە جانی (ڕاجی)
هیچ کەس نییە بە بێ تۆ، شایانی تەختو ئەفسەر.

(١٤)

لە غەمی هیجری تۆ بۆ مـن، چ بەهەشـت و چ سـەقەر
لـەدەمی وەسـڵی تـۆ بـۆ مـن، چ عـەماوو چ بەصـەر
گـشتی نـاخۆش و پـڕ ئـازارە لـە هیجـرا، خۆشـی
گـشتی هـەر خۆشـیە وەسـڵت، چ قـەزاوو چ قـەدەر
ڕۆحـی عاشـق لـە قـەدت، مـژدەیی خۆشـحاڵی دا
دەشـکێ وەك دڵـی عاشـق، چ پیاڵـە چ فەنـەر
لـەب و زارت بـە قـسەو خەنـدە ئـەبا ئـاوی گـوڵان
کەسرە وەختێ کە لە خەندەی، چ عەقیق و چ گوهـەر
ئاسمـان نایەتـە کێـشی خـەت و خاڵـت ئەبـەدا
هـەر ئـەتۆ جیلوەفـشانی، چ بـە شـەمس و چ قەمـەر
عەهدی مـن تاعـەتی تۆیـە، بـە دڵ و جـان و دەمـاغ
کاری تۆ حوکمـە لەسـەر مـن، چ بـە ژێـر و چ زەبـەر
وەرە (ڕاجـی)، بـە تەماشـاکەهی یـارانی عـەزیز
هەرچـی مـەیلت هەسـتا، چ قیامـەت، چ کەمـەر!!.

(١٥)

دایـم هـەوایی عیـشقت، بەسـەر دڵ دەکـا گـوزەر
بۆیـە ئـەو خەبـەرداره، منـیش هـەردەم دەربـەدەر
چـاوت بـە غـەمزەو نـازی، کوشـتوومی سـەد ئـەمان
لێـوت بـە نیـوە خەنـدە، ئـەبا ئـاوی گوڵـشەکەر
سـینەم گـەلێ بـە سـۆزو تـاوە ئـەی ئـاوی حـەیات
زۆر تـەنگ و تاریکـە دڵـم، ئـەی غونـچەکەی سـەحەر

جـاریّ بـەلارو لەنجـەوو عیـشوە تـۆ بێـرە لام
ئـاوا بکـە خانـەی بـێ نـەوایانی قوڕبەسـەر
گاهـێ، لـە چاوی خـۆم دەبیـنم نیگـاری بەهەشت
گاهـێ، لـە سـینەدا دەسـووتێم بـە نـاری سـەقەر
مـەعلووم، نـەماوە مەیلەکـەت ئـەی یـاری بـێ وەفـا
ئێـستاکە دەشـکێنی بـە دووری کـەوانی کەمـەر
مێرگـی نەسـرین و وەنەوشـەو سۆسـەن و سـەروی
بۆ زەوقـی ئـەم جەنەتـە، چ نـاکرێ لەگـەڵ قـەدەر
(ڕاجـی) لـە لۆمـە دەرچـووە، وا بۆتـە سەرسـەری
عیـشقی لـە دونیاوەیـە، داینـاوە سـەری لەسـەر.

(١٦)

چـاو کاڵـە، سـیا خاڵـە، سـەفا پـەروەرە، دڵبـەر
خـۆش کامـە، گوڵەندامـە، پـری فامـە، موعەنبـەر
ڕەنگ ئەسمەرە، موو خەنجەرە، قەد عەرعەرە، جان سووز
خـەت ئافـە، جیهـان تافـە، دڵـی سـافە، مونـەووەر
شـەو گێـسوە، ڕەم ئـاهوە، وەك تێهـوە، چـاپك
شـیرین ڕووە، لـەیلیّ خـووە، تـەن بێـچووە سـکەندەر
دەم شەربەتە، لەب ڕەحمەتە، گوڵ ڕوومەتە، خەت خـەت
مـن بـەو گوڵـە، بـەو کاکوڵـە، وا بوومـە سـەمەندەر
ئەو مەهوەشە، ئەو سەرکەشـە، ئـەو ڕووکەشـە، هـەردەم
هـەر سـوویە، لەسـەر ڕوویـە، دەمـی زوڵفـی تەژەنـدەر
هـەر ئاخمـە، هـەر داخمـە، بـۆ جـەرگی برینـدار
سـووتاوە بـە بـۆی ئـەو کلـی شـۆڕاوە بـە کەوسـەر

بەم دەردی خەمت، هیجری دەمت، فەرزە بنالم
ئەی مۆم تەنەی، زیو زەقەنەی، سینە موعەتتەر
من قوڕبەسەرو، بێ جگەرو، دەربەدەری تۆم
ئەی سەدەفی گەوهەرو مەم گردو مودەووەر
دەردت لە سیەم بەختییە (ڕاجی)، تۆ بنالە
قوڕ پێوە، لە هەرجێوە، لە هەر ڕێوە، قەلەندەر!!.

(١٧)

ئەی تەنك ئەندام و سەنگین دڵ، جەبین بەدری مونیر
من گەداوو تۆ شەهەنشا، تۆ غەنیو من فەقیر
دەست تەنگم من لە سایەی کاکۆڵی عەنبەرفشان
پای لەنگم من لە ڕێگەی بەزمگاهت، ئەی ئەمیر
هەڵگرا لالەی سەری کوڵمەت، چلۆن نەتوێمەوە؟
بگرە دەستم، سا بە ماچێکی لەبانت دەستگیر
گەر لە بادەی چاوەکەی کاڵت، دەمێ ئاسوودە بم
قەت بە ڕوتبەو تەختی شاهەنشاهەکان نادەم حەسیر
قەتعەیی کوردو عەرەب، هێنایە ئیجادو نەما
تۆی وەها شیرین و شۆخ و، تازە ڕەسم و بێ نەزیر
خانە ئابادم بکە، جارێ بە شەوقی کوڵمەکەت
ئەی کەسێکی، کەس نەماوە بۆت نەکا هەر شەو نەفیر
بارەکەڵڵا، مەملەکەت جیلوەی ئەقالیمی ستاند
لەم لەبی مەحبووبە کوردە، ئەهلی سۆزت شاب و پیر
زەلزەلەی چاوی سیاهت، کەوتە شەرق و غەربەوە
شاه و سوڵتان و گەدا، وا بوونە ڕەندی گۆشەگیر

ئەی خودا! (ڕاجی) کەوا شەرمەندە ماوە لەو بوتە
کەی دەگا ماچی بکا، دەستی لە مل کا، یا قەدیر؟!.

(١٨)

ئەم دوژمنە، لێم بۆتە بەڵای کەلبی نەانگیر
وەك چەرخی زەمان چەرخە دەکا حیلەوو تەزویر
سیمین تەنەکەم مەستە، لەبەر نازو نەزاکەت
بردوویە دڵی خەستە، بە سەد حەلقەیی زنجیر
مەغرووره بە ڕووی خوێنی کوژاوان، وەکو جەللاد
کوشتوومی بەبێ تۆمەت، بەیەك زەربەیی شمشیر
(حەقتولقەدەم)ی چاوی سیاهی تووە، ڕۆحم
زوو بمکوژە ئەی دڵبەرە، سوودی نییە تەئخیر
گوڵچیهرە! دەمێ دائیرە ڕەنگین کە بە خەندە
دایم کە لەسەر سەر ئەگەڕێ گەردوشی تەقدیر
بۆمەنزەرەیی خەڵوەتی خاسان، نەزەری بوو
شەیتانی رەقیب خستیە سەر ناڵەیی شەبگیر
ئەم ئایەتی خاڵ و خەتە، (ڕاجی)، لە لەب و ڕوو
تەعبیری بە مەعناوەیە، کورتە لەبی تەفسیر.

(١٩)

بۆ مەجلیسی سەربەرزی، هەم تەرزی سکەندەر کوڕ
بۆ تینەتی دڵ لەرزی شەهبازو غەزەنفەر کوڕ
کوڕ قابیلی مەیدانە، پڕ کاری هونەر کانە
خۆش مەعدەنی ئیحسانە، سەر ڕشتەیی کیشوەر کوڕ
کوڕ لایقە کۆمەڵگا، بیدعەت پڕی باخەڵکا
لالەی ئەدەبی هەڵکا، سوڵتانی موزەففەر کوڕ

هـەردەم لــە قەرارێکــە، هــەر وەختــە بەهارێکــە
بـۆ غـەرقی کەنارێکـە، غەوواسـی بـە لەنگـەر گـوڕ
گـەر نووحـە، ئەگـەر مووسـا، ئیدریـسەوو ئیـبراهیم
هەم یوسفو هەم یـەعقوب، موختـاری پەیەمبـەر گـوڕ
گــوڕ قاســیدی عیرفانــە، وەك مــورغی ســولەیمانە
نوورێکــە لــە یەزدانــە، هــەر نەوعــە منــەووەر گــوڕ
سـاحەب جگـەرو ئـاقڵ، زیـرەك لـە هـەموو هائیـل
فاریق لـە هـەقو باتیـڵ، وەك ئـاگری میجمـەر گـوڕ
گــوڕ زینــەتی ئەوراقــە، یــا قــوورڕەیی ئەحداقــە
بۆ هەردوو جیهان تاقە، سـاحەب حیکمـە هـەر گـوڕ
پڕ فیکرو عەمەل بۆ ژین، هەنگوین دەهـەنو شـیرین
ڕەنگین کەرەمو سەنگین، تیمسالی موسـەممەر گـوڕ
بــۆ نەقــشی ســەفاجۆیی، بــۆ ڕاهــی وەفــاپۆیی
بۆ سوڵحو شـەکەرگۆیی، مەشـهوورە لەهـەر دەر گـوڕ
گــوڕ ڕۆســتەمی دەورانــە، دوڕڕی یــەمی حەیوانــە
(ڕاجی) مەبە دێوانە، هـەم جەوهـەرو گەوهـەر گـوڕ.

**

-ز-

(١)

ئیمڕۆ لە ڕەنگەت نەمام، ئەی بوتی گەردن فیراز
من، هەمە عوششاقی تۆم، بۆچی دەکەی ئیحتیراز؟
سەوزە، لە ڕەنگەی حەمام ماندووە ناگاتەوە
قامەتەکەی نازکی، ماوە بە نازو نیاز
بەرگی وەکو تەشکی من، چەشنی گوڵووکی بەهار
بۆ دڵو چاوی غەریب، نەشئەو قووتو جیاز
هەستە بە گەردوش بخە، جامی دەمت ساقیا
زووبە بڵێ موتریبا، دەشتی یو بەندو حیجاز
گەر تۆ لە من ون ببی، تەخەیە زیندانی خەم
وەر تۆ لە من بی دیار، جیلوەمە هەم سۆزو ساز
شەرتە کە گوڵ بێ لەبت، ئێقە فراوان نەکا
عەهدە کە بێ چاوی تۆ، بادە نەبێ مەستباز
لامەدە زوڵفت لە ڕوو، ئاگرە بۆ دینو ماڵ
جەننەتە گەر بێیە ڕووم، زوڵف لە ڕوو، سینەواز
تورڕەیی خەتت بەخاڵ، چاوەیی جاە و جەلال
موعجیزی ئەرواحو دڵ، خاصیەتی ئەفکارو ڕاز
تالیبە (ڕاجی) لە تۆ، مەرحەمەتی ماچی لەب
تاسوقی وەسڵی تووە، ئەی سەنەمی دڵنەواز.

(٢)

تا لەسەرمایەی ژیانی، خەرجکەم تەونو تیراز
نرخی کاتو کارەساتم، نابڕێ سا کاری ساز

کارســازی ســۆزو شــەوقم، تــا بــدا تــاوی دەمــاغ
خوێن هەڵنەقوڵێنێ لە قـوڵپی دڵ بـە چـاوم تانـەخواز
خوازبێنی بووکی مەی کەم، تا لە کووپەی بیرو هۆش
بۆشـە گیرفـانم، کـە ئەشـکی پـڕ مـەزەم لـێ بۆتـە بـاز
بــازی دا، لــێم تێپــەڕی، ئــەو دڵبــەرەی خــاوەن شــکۆ
شەکوە لای کێ کەم بەرانبـەر دڵڕەقـی پـڕ کـینو ئـاز؟
ئــازموودەی جــەنگی حــەفتا دەوڵــەتم کــردو، جــەزام
ئــاخری کێــشا، لــە دیــدەی موقنەتیــسی حیلەســاز
حیلەســازێ هــۆزو هێلانــەی تەپانــدم، ئــازە چــی؟
بــەم ســەری پیرەــە هــەڵبگرم ســەڵەی نــازو نیــاز!!
نازو نووزی دوورە خەج، تاکەی بـە سـەد سـەر هـەڵگرم
هێنــدە وەســتاوم لەســەر پێیــەك، کــە بوومــە قاچەقاز
قازمــەی بــیر هەڵکــەنم، هــەر ئــۆگری خــاکی دەرە
بــۆ تــەمای لــێ نیــشتنی تۆزێکــە، ســا ئاواتــەخواز
من وەکو مـارم، کەچـی سـێوی لـە رووما شـێن ئـەبێ
تــا لــە بــەینی ســێوو مــارا، خزمــە ناکــەم ئیمتیــاز
ئیمتیــازی مــاڵو دەســتی دوژمــنم، پێــشین چــەکە
وا چــەکی کــردم، دزی دەم چــیکەنەی پــیلانو گــاز
گـازو گـازووكو گـەزت، گـشتی فرێنـدە سـەر بـە تـۆز
چەشــنی (ژیکــۆ) تــاکو مــردن، هــەر بخــۆ هێلانــەواز.

(٣)

ســەری شــۆڕا بــە ســەد رووبــار، کاغــەز
نەســیم نەیــدا بــە دەســتی یــار، کاغــەز

لـــە شـــێوەی ڕوومـــەتی جانانـــە نووســـیم
بـــە یـــەك شـــێوەم نـــەدی میلیـــار کاغـــەز
عـــەجایب گـــەردنی نەســـپی بلـــوورین
ســـوواری دوودو ڕەختـــی بـــار، کاغـــەز
موڕەککـەب سـەروی نـازك، شـۆخی عـەییار
مـــەی‌و نـــەی، نێرگـــسی گـــوڵزار، کاغـــەز
کـــە هینـــدی بەچـــچەکان هـــاتن بـــە نیمـــا
وەکـــو نوختـــەی ســـیا هـــەموار، کاغـــەز
نەســـیمی زوڵفـــی موشـــکین، بـــا نومـــا کـــا
لـــە گۆنـــەی پـــڕ خـــەتی ڕەشمـــار، کاغـــەز
نەمەنـــدەم (ڕاجیـــا) نووســـی، نـــەما هـــیچ
بـــە قـــەدری مەرکـــەزی پـــەرگار، کاغـــەز.

(٤)

بـــرا! لێتـــان موبـــارەك بـــێ شـــەوو ڕۆژ
هـــەموو ســـاڵێکی بیکـــەن جـــەژنی پـــیرۆز
بـــە لێـــو خەنـــدان، وەکـــو بـــارانی نیـــسان
بـــە ســـیما گـــەش، وەکـــو هـــاموونی نـــەورۆز
دەمێکـــە چـــاو لەبـــەرتانم گـــەلی ژیـــن
بـــە ڕووی زەردو، بـــە نەشـــکی چـــاوی هـــاڵۆز
هومێـــدم وایـــە نـــەی هـــۆزی بـــە هیـــوا
نـــەبینن قـــەت لـــە دنیـــادا تـــەپ‌و تـــۆز
لەگـــەڵ گیـــانم نەبەســـتن عەهـــدو پـــەیمان
پـــڕی جـــەرگم نەکـــەن، تیرانـــی دڵ دۆز

حەقیقـــەت، ئێــوە ئــەهلی خۆشەویـــستین
لــــەبیبان و تـــەبیبی دەردی جانـــسۆز
لــە جوهــدو کۆشـــشی خۆتـــان بخــۆن بــەر
وەکو جەننەت، نە وەك (ئەندێك و ئەنگۆز[1])
لـــە عالەمـــدا، بـــەخوا دووڕی یـــەتیمن
لــە دنیـــادا، ئەکــەن شــەمعی دڵ ئــەفرۆز
ئــەوی ناخۆشـــە لای، وەســـفی ئــەدیبان
لـە پێـشی دابنــێن، هــەر پــووش و گــاگۆز
ڕەقیبـــی ئێــوە، بــچنە بلقـــی ســـەختیی
لـە خـەم ڕۆچـن، مـل ئەسـتوورانی سـەر بـۆز
ئەگەرچــــی نائەدیبـــە ئێـــستە (ڕاجـــی)
بــەڵام تــۆزێ لــە دڵــدا شــك ئــەبا ســۆز!!.
١٩٣٨

(٥)

نیگـــــارم خانمێکـــــە، خـــــاوەنی ڕێـــــز
دەرم ناکـــا، ئەگـــەر بشـــچم بـــە پـــارێز
بــە شــەو مەســتم دەکــا چــاوی، لــەبادەی
مــــەزەی پـــوختم دەداتـــێ لێـــوی ئـــەوخێز
ئـــەمن پــــاراوی بـــەزم و ڕەزم و خۆشـــیم
ڕەقیبـــیش بابگـــەوزێ وەك کـــەری دێـــز
مـــن و یـــارم وەکـــو مـــەجنوون و لـــەیلا
لــە عیـــشقا، یـــا وەکـــو شـــیرین و پـــەروێز
چ ناخۆشـــیمە، لێـــی دوورو جـــودا بم!
چ خۆشـــیمە، دەمـــێ بیگرمـــە ئـــامێز!

١ دوو گوندی وشك و کەم ئاون لە ناحیەی بێتواتەی سەر بە قەزای ڕانیە.

کـــراوه مەیکـــەدەو، مـــەی هاتـــە بەخـــشین
ئـــیتر پێویـــستە ڕاوەســـتم لـــە دەهلێـــز
بـــە بـــادە گـــەر نەشـــێلراین دڵو تـــەن
هەویرێکـــە، شـــلو بـــێ پیـــتو بـــێ پێـــز
جوانێکـــە لـــــە عالـــــەم تێپـــەڕیوە
لـــە بـــازاڕی جوانانـــدا دەکـــا بێـــز
بەچـــی ســـەرکەوتوون بێگانـــە، (ڕاجـــی)؟
مـــشوورو، بـــیرو، تـــەگبیرو، چـــەکو هێـــز!!.

١٩٤٦

(٦)

یـەك یـەك، لـە خـەتو خـاڵو قـەدو چـاوی دڵئـاوێز
بـۆ کوشـتنی مـن دەم بـە دەمـن، تـازەو نـەوخێز
قوربـانی سـەرو پەرچـەمو بـاڵاو لـە بـت بـێ
سەد موشکو گوڵو سەرو عـەقیقی تـەرەب ئـەنگێز
حەیرانـە لـە ڕووی بـاغی جـەماڵت، ئـیرەمو چـین
لوبنـانو عـەدەن، میـسرو یەمـەن، لەنـدەنو تـەورێز
موتریـب وەرە توخـوا، بدەمێنـە دەفو شـەشاڵ
سـاقی وەرە بـۆم تێکـە، لـە چـاوت مـەیی لـەبرێز
شـاهید وەرە دەم بـاوە دەمـم، سـینە بـە سـینە
زوڵفـت بەتکـەی تارەقـەوە، بیکـەمـە بـاڕێز
دەسـتت، بـە هـەوس بیکـەرە تـەوقی ملـی عاشـق
هـیچ مەیخـەرە دڵ ترسـی ڕەقیبـی کـەری شـەودێز
فانوسـی دڵـی هـەڵبووە (پـشکۆ)، بـە نەسـیمت
تا هێزی هـەبێ سـۆزی هەیـە، خوایـە بـدەی هێـز !!.

١٩٤٦

-ژ-

(١)

نەسپەکەی ڕەشکوژتە دڵبەر، خۆشڕەوو پڕ یاڵو بژ
ڕۆستەمە، یا حەیدەرە، چاپوك سواری شێرکوژ
خۆش بەرودۆش و سەرە، گەردن زەرو، ڕوو سەوزە خەت
ڕەنگی گوڵ، قامەت سنەوبەر، بەرگی ڕەنگین، گیاوگژ
پاڵەوانانە لە جەنگی خۆشەویستیدا جمی
سا چ قەوماوە بە گورجی، هێندە زوو زووم دێ بە گژ؟!
هەر خەریکم من، لەگەڵ دڵبەر دەمێ تاشت ببەوە
نەمدی ڕوویی ڕەحمەت و، دیتم هەموو دەم زیز و دژ
گەرچی بەربادو پەرێشانم، لە دەس چەرخی زەمان
دەردەکەی نێمەن لە دوو ڕوو، پەرچەم و کاکۆڵی قژ
نێستە من چاکم، بە شێتی کاری یاری سەر نەبەم
وا ڕەقیب وەك بزنە گروێ، چین بە چین لێیداوە سژ[١]
کارو پیشەی زاریو هاوارە (ڕاجی)، ڕۆژو شەو
دەردی ڕۆژی گرتووە، بۆتە منالی مەم نەمژ.

(٢)

لەم قاپییە تاکەی بە هەوا ببمە تەمانیژ؟
لەم کوویە خەمی خوێنمە، تاکەی بە دوا چێژ؟
هەر نایەتە هاوارم و، ناگا بە وەرامم
لەم سینەیی پڕ شۆرە، نە دڵ ماوە، نە ڕاوێژ

---

١ سژ: زیندەوەرێکی بچووکی مژۆکە، بە لەشی مەڕ و ماڵاتەوە دەنووسێ و خوێنی دەمژێ.

هیــچم نییــه تــا بیخمــه ژێــر پێـی‌و، بڵـێم بـێ
وازی لـــه گەلـناوێتژییـــە، دوو چـــاوی گەلاوێـــژ
بەخـشیمەوە سـەر مەشقی خـەتی مـەرگی جـوانیم
خــاڵێکی نیــشاندامو، دڵــی کردمــە ســەراوێژ
دڵ کوت کوتـو، تەن پەل پەلە، بەو جینگڵی زوڵفە
ســارێش‌و کــولن، دەردو بــرینم نــەبوو ســارێژ
نەخـشین‌و بەڵـەك چـاوە، خـەواڵوو بـە هـەموو دەم
سەرخۆشـــەوو ژاکـــاوە، لـــە یارێـــە دەراوێـــژ
مــن بوومــە نیـشانەی خەفـەت‌و تـاگری ڕووی تـۆ
تـۆش بوویـە مـەکۆی تـیرو گوللـەو قونبولـە هاوێـژ
دەســتم نەگیــەیی بیخمــە باخــەڵت‌و، لەگــەڵتا
یــاری کــەم‌و بتمــژم‌و، ســەرەو ژووڕو ســەرەولێژ
(ڕاجـی)، کـە لەپـەردەی نـەدەبا مـەرگی بـە تـۆدا
مـاســی وڕی گێـژاوە، دڵـی کاسـە، سـەری گێـژ!!.

١٩٤٧

(٣)

چـەندم بەســەرهات تـاوەکوڵ، چـەندم بـڕین هـەورازو لێـژ
چـەندم دوعـا خوێنـدن شـەوان، چـەندم ئـەدا بـەرتیل‌و نوێـژ
چـەندم ڕیـازەت دا بـە دڵ، چـەندم نەکوشـت نەوسـی خـەڕۆ
چـەندم شـکاند نرخـی گـران، چـەندم دڕیـن هـەوراوو گێـژ
چـەندم لەسـەرنا تـاجی گـوڵ، چـەندم بـە بـادا چـەتری سـەر
چـەندم نوانـدن گوڵڕوخـان، چـەندم فـڕین پیاڵـە نەڕێـژ
چـەندم نـەگرت غـەزالی سـڵ، چـەندم لـە داوا دەرپـەڕین
چـەندم فرۆشـتن نەوجـوان، چـەندم کـڕین ئاشـتی نەچێـژ

چەندم گەیاندن خاڵو پڵ، چەندم مەیاندن سیبەر
چەندم گوشین باڵۆرەزان، چەندم مژین حەیرانەبێژ
چەندم گەشاندن سەوزە چڵ، چەندم وەراندن پەلكو بەر
چەندم خەواندن باخەوان، چەندم چنین شەمامەنێژ
ئاخیر، بەدەن بوو سستو شل، هیوام نەما (ڕاجی) لە گەل
دینو دڵم دانا لە بان، خۆمو خەمی دووڕو درێژ[1] !!.

١٩٤٧

❊ ❊

١ ئەم شیعرە جوانکارییەکی سەیری تێدایە. سەرواى لەتە دێڕی یەکەم لەگەڵ سەرواى لەتە دێڕی سێیەمو پێنجەمو...، سەرواى لەتە دێڕی دووەم لەگەڵ سەرواى لەتە دێڕی چوارەمو شەشەمو ... هەر..... وەها، لەگەڵ یەکتریدا جووتنو ڕێك دێنەوە.

-س-

(١)

لە جەفاو ماتەمی دووری، بە خودا بوومە پەلاس
ڕۆژی شادیم بۆتە مەرگو، ئەجەلیش بۆتە گلاس
ڕەوڕەوەی مەیتی منە، عیشقی دوو چاوی زیبا
گۆڕی ئەفکاری منە، سینەیی خاوی ئەنناس
ڕوویی دڵدارە بەڵێ، جەژنی خەت و خاڵ و خەیاڵ
چاوی بیمارە بەڵێ، دەم بە دەمی شوکرو سوپاس
سینە پەیکانزەدەی زوڵف و مووژەی تیری ئەوم
دیدە هەڵنایە لەبەر تاوو تریسکەو لەب و کاس
پەلەوازەی چ بکەم؟ گێژەنی غەم ڕێژەنی دا
ئیمە ڕزگاریو دەرچوون، بە چ بورهان و قیاس
کە پەلامارم ئەدا سەرکەشی شاماری کەزی
قوژبنێکم نییە مەر بچمە پەنای مەمک و کراس
دەستناوێزەیی ئەو گەردنە نابم، بە خودا
هەروەکو دیتم و بووم تێکەڵی سەد دەنگ و باس
عەرعەری (مەندەلی)یە، (نووری)یە) ناوی، گوڵزار
لامل و گەردنی خۆشبۆیە، لەڕووی ئەون و ئەناس
(ڕاجی)، ئاوارە مەبە چیکە لە ئاوی یاران
وەرەوە باوەشی غەمخانەیی تاری دڵی کاس.

بەغدا- ١٩٤٣

(٢)

ئیمە سەودایی قومارو، ئارەزوویی دەنگوباس
عاشقم، بۆچیمە زانست و ئەرازوویی قیاس

پەرچـــەمت ڕابـــواردنی شـــومە، بـــە خـــاڵی وردو ڕەش
ڕومـــەتت یاریـــدەیی ڕۆژمـــە، لـــە ڕۆژنامـــەی (نەســـاس)
پێکـــی مـــەم، لێـــوی مـــەزە، ســـفرەی بـــەرۆکت مێـــزی پـــڕ
هێـــشتە بـــەرمان ناکـــەوێ لـــەم بەزمـــە ماچـــی لێـــوی کـــاس
دەم چ دەم؟ نـــوقڵی هـــەوەس، چـــاڵی زەنـــەخ، ئـــاوی حـــەیات
گـــەردەنی قەنـــدی عەرووســـی، مێـــشی ڕۆحـــی لێکـــە پـــاس
وا گـــرەم کەوتۆتـــە ســـەر چـــاوی بـــە شـــەربەت ڕشـــتراو
مەســـتی ویم، یاخۆ لەســـەرخۆ چوومو کەللـــەم چـــوو بـــە تـــاس؟
تـــا خـــەواڵوو بـــێ زیـــاتر نـــاز ئـــەنوێنێ بـــە مـــن
وەختـــە لـــێ ڕابـــێم لـــە نـــازو، هـــیچ نـــەمێنێ هـــەراس
ســـێبەرێکیکەم نییـــە، ســـۆراخی زوڵفـــی تـــۆ دەکـــەم
هەر لەڕووی تۆم مـــاوە مـــاوەی، نیعمـــەتو شـــوکرو ســـوپاس
نـــاکرێ هـــەردەم بـــە ســـەودایی لـــە دووت بخولێمـــەوە
خـــۆم دەپـــارێزم هـــەموو وەختـــێ لـــە نەخەنناســـی نـــاس
خاکی غوربەت بوو، خەڵوزی جەرگی (پشکۆ)ی کەوتەســـەر
بێجگە شـــوعلەی کوڵمـــەکانت، کێم هەیـــە ســـا چاوەناس؟!

۱۹٤۸

(۳)

کەوتوومـــە تـــاوی عیـــشقەوە، زانـــراوە گـــەر نـــابم خـــەلاس
بەربوو لە دڵ ئـــاگر بـــە تـــاو، بـــێ دەردی ســـەر نـــابم خـــەلاس
مـــەجبووری دیـــدارم ســـەنەم، مـــەحوور گرفتـــارم ســـەنەم
ســـەرخۆش و بێـــزارم ســـەنەم، قـــەت سەربەســـەر نـــابم خـــەلاس
سەوداســـــەری گـــــوڵزارتم، موشـــــتاقی لێـــــوو زارتم
ناشـــوفتەی زوڵفـــی خـــارتم، ئـــەی جیلـــوەدەر نـــابم خـــەلاس

ئـەی شـاهنازی دڵبـەران، ئـەی مـوتربیی یـارانی جـان
خـستمتە بەنـدی بـێ ئـەمان، ڕۆژی قـەدەر ئـابم خـەلاس
مـن ڕووتو قـووتو عـاجزم، زەردو ڕەقو وشـکو کـزم
گـیاوی داوی پـایزم، خـاکم بەسـەر ئـابم خـەلاس
پەیوەسـتە وەحشو بێکەسـم، بـێ دەسو پـێو فریاڕەسـم
گیرۆدەیـی خـارو خەسـم، مـاڵم خەتـەر ئـابم خـەلاس
خاڵـت بـە کوشـتن حـازرە، ئـەبرۆت بـە غـەمزە دائـیرە
ڕووت بـۆ عـەزابم ئـاگرە، ئـەی لـەب شـەکەر ئـابم خـەلاس
هەر شەو بەغەم، جێگەم سەقەر، ژەهـرو زەقـوومم دێتەدەر
گیانو دڵو دینم لـە دەر، ئـەی خـۆش کەمـەر ئـابم خـەلاس
(ڕاجی)! لەیار شەکوا ئەکەم، کە کـەس ئەپرسـی ڕا ئەکـەم
مـاڵی خـودا ئـاوا ئەکـەم، بـووم دەربـەدەر ئـابم خـەلاس!!.

(٤)

کـە سـاوی دا، بـرۆی شمـشێری ئـەڵماس
بـرۆی شـەیدی، شـکاندی پـشتی قـەیاس
بـە خـوێنی چـاوی مـن، دنیـا ڕوانـدی
گـوڵو نەسـرینو سەوسـەن، مـۆردو نەسـناس
لـە دەردی هیجرەتـا وا قـوڕ دەپێـوم
بـە ئەشـکی گـەرمو ئـاهی سـەرد، سـەری کـاس
برینـی دڵ، لـە ڕازی کێـوی عیـشقت
دەری کـردن، هەلاڵـەو شـەنگو ڕێـواس
شـکارتەی[1] بـەختی بـەد، وشـکو خەسـارە
زیارەیـشم نییـە، وەك تالـەتی داس

١ شكارتە: كشتوكاڵ كردنێكی كەم. وەك چاندنی دوو سێ تەنەكە گەنم.

دیـــــاره قـــــووتی زســــتانم دەفــــەوتێ
لـــە هاوینـــا ، ئیلاهـــی نـــاس‌و ئـــەجناس
ئـەمـەك گـــیرت نـــەبێ (ڕاجـــی)، عەجیبـــە
وەهــا چــاكە، لــە تــۆ زەحمــەت بكــا پــاس!!.

(٥)

دەستی دوعا دەگرم دەمـێ، گـوێم پـڕ لـە گوفتـارە مەبـەس
چـاوی بـە كـوڵ هەڵـدێنم‌و، قوچـاوی دیـدارە مەبـەس
دەكوڵێنـمەوە زامـی بـە كـوڵ، كـە بـیری دیـدەم دێتـە دڵ
هــەردەم لــە ئــاوازی نەبــەز، دەردم گــەلێ زارە مەبــەس
كە مـانگی پڕ كوڵمـەی هـەڵێ، ئافـاقی جـان دەگـرێ بـەڵێ
ئــاوا دەبــێ ڕۆژی بتــان، لــەم چــەرخ‌و پــەرگارە مەبــەس
هەر كەس وەكو من رووتە بێ، ڕیشەی گیـانی سـووتە بێ
پڕداخـی ئـەبرۆیی كـەچ و، پـەرداخی ڕووی یـارە مەبـەس
دەردی دەروونــە، ســەر نییــە، لــە ئیشـی مـوو بـەدەر نییـە
لـە چـاوو غـەمزە دەرنەچـێ، جاسووسـی ئەسـرارە مەبـەس
ســەوزە بــە گــوڵ چــنینەوە، خونــچە بــە پێكەنینــەوە
هەرچـی بـە بولبـولان دەكـا، خـوێنینی گـوڵزارە مەبـەس
پشـكوونی(پشـكۆ)یـە لـەبی، بۆیـە دەسـووتێ غەبغـەبی
سفرەیی سینگ‌و مەمیـەتی، مەتعـەمی هوشـیارە مەبـەس.

(٦)

كە سووك سووك دێتـە پێش، سـەما دەكـا نەفـەس نەفـەس
خـەتی وەنەوشـە تـۆپ تـۆپ، ئەداتـە زوڵفـی دەس بـە دەس

خەریکی ڕیکە ڕیکە دڵ، نەسیری سیرە ڕوو
خەیاڵو خاڵە کێشە کێش، عوزارو زوڵفە کەس لە کەس
بەلەنجە نەختێ دای تەکان، سەوزە شەمامە هەڵتەکان
هەزار گیانی خۆشەویست، فیدای مەمانی نیوەڕەس
بادە وەکو حەیا ڕژا، لەسەر کراسی(نووریـیە)
دیدە بە دیمەنی پڕژا، لە ڕەنگو ڕوویی بەسکە بەس
ڕۆژی ویدادە دادی من، چ ڕۆژە ژانە سەریەتی
شەوی سەفا هەژان نەکا، (مەدیحە) سووری دەسکە بەس
واتەی کچانی (جۆرج)ە دێ، جەواهێری لە جۆری دڵ
تێکەڵ بە جەرگی من دەکا، چ باقە باقە خارو خەس
جەنابی ڕوویی کارەبا، کە با حیجابی لا نەبا
تریسکو تاوی سەربەسەر، نەخاتە چاوی خزمو کەس
پەنیرەگشتە ڕوویەتی، مەزمی سپی بازوویەتی
جەفا بە یاران خوویەتی، پێزانەگا فریادڕەس
دەستم لە تۆقەدا تەقی، گەیە وتاری نەستەقی
وەك منی زاری دەربەدەر، (ڕاجی)یە وشكو بێ هەوەس!!.

بەغدا - نەورۆزی/١٩٤٣

(٧)

ئەی سەراپایی قەدت، وەك کەو کەنارە بۆ عەسەس
وەی دڵئارامی لەبت، شیرین گەوارە بۆ هەوەس
هەر کەسێ عیشقی لەبت نەقشی لە دڵ کێشا ئیتر
بۆ خەرامی مەنزڵی، هەستی نییە دەنگی جەرەس
لێم حەرامە مەی لە بەزمی ئەو کە نێزیکە ڕەقیب
لێمگەڕێ جامێ بنۆشم من لە شەوقا ئەی تەرەس

نــازو عینوانــت، قــەدی شمــشادمی خــەم کــردووە
تــا کــە نێزیکــە جگــەر کــا بــەم ســەری بــەرزم هــەرەس
تــرش‌و شــیرینی زەمانــە، عیــشقی بــێ ســەرمایەیە
تــاڵ‌و تفتــی عاشــقانە، ســاف‌و شــیرینی مەگــەس
نــەوعی تەســخیرت، کــە قەیــدی خــاتری ئازوردەمــە
بــەم گرانبارییــە خــودا، حــەیبێ نــەبێ ســا هــیچ کــەس
وا لەگــەڵ گــوڵ بۆتــە هەمــسەر، (ڕاجیــا)، لــەم باخــەدا
خاری دوژمن، هەر وەکو تووتی لەگەڵ قەل، هەم قەفەس
دەشــتی دنیــاوو قیامــەت، عەنبــەرئامێزە هــەموو
گەر سەبا بێنێ لە نەفخەی زوڵفی موشکین یەك نەفەس
من وەکو مووسا، لە تووری عیشقی تۆ فەرخوندە بووم
لازمــە هەڵکــەم بــە یــادی ڕوویــی ڕەنگــین، یــەك قەبــەس.

(٨)

لەســـەر مـــولکی دڵا، ســـەیرو ســـەفا بـــەس
بـــە میـــدراجی ڕجـــا، جـــەنگ‌و جـــەفا بـــەس
بـــە گـــوێزەی عاشـــقان، دەســـتی تـــەڕەحوم
لـــە گـــەردن، قەیـــدی نـــازارو خـــەتا بـــەس
برینـــدارە دڵـــی پـــڕ ئـــاهـ و گریـــان
بـــە یـــەك مـــەیلی تەداویکـــە، دەوا بـــەس
مەکـــەن لۆمـــەی هـــەواداران بـــە تەعنـــە
لـــە زانینـــی خەبـــەر، یـــەك ماجـــەرا بـــەس
کـــە مـــن غـــەرقم لـــە نـــاو دەریـــای غـــەریبی
بـــە پـــاپۆڕی تـــەوەتتون، ئیلتیجـــا بـــەس

نیشانەی دەوڵەتی عوزما، لە نەبرۆت
سەرەوبن بوو بە تیری کیمیا، بەس
لەبەر زنجیری زوڵفت، شێری دڵ چوو
بە ئیزهاری مەزەب، کوفرو بەلاّ بەس
عەجەب بێ دینە خاڵت، ئەی پەری ڕوو
لەسەر ئەم کیشوەرەی دڵ، ئیستیلا بەس
کە لوتفێکی نەبێ یارت، بە کوللی
لە قاپی حورمەتا، (ڕاجی)، ڕجا بەس.

(٩)

ڕۆحم لە بەرابەر ئەزەری سەفایی ڕەقس
دەتوێتەوە وەك شەونمی پڕ سەبایی ڕەقس
ساقی! هەوەسی مەیکەدەوو وەفایە، بێ
بگێڕە، بەسەر کۆمەڵی پڕ هەوایی ڕەقس
گێراوە، دڵەی بێکەسەکەی هەژاری من
بەو سیلسیلەیی عوشرەتی نەوایی ڕەقس
ڕابوردووە، خنکاوە، بە ڕووی بەححاری غەم
هەر کەس، کە نەبێ ڕاگوزەری لیوایی ڕەقس
مەعلومە مەحەببەت لە دڵو دەماغی خەڵك
بۆیە کە دەبن مەستی مەی‌و نومایی ڕەقس
ڕۆحێ کە لە رووی دەردەوە پڕ شەرارە بێ
خێرا بکەوێ، بێ لە دەری دەوایی ڕەقس
ڕشتەی دڵی (ڕاجی) موە، ئەی غەزالجان
وەك تارێ، لەسەر تاری ڕوخی خۆش لیقایی ڕەقس.

(١٠)

چاوم لە دەس و جودی تۆوە لەم دەرە، یا غەوس[1]
بێ سەبرە دڵ و، سووتە هەناوم، وەرە یا غەوس
عومرێکە، بە پیرانەوە دەگریم و گراوم
فرمێسکی قەڵەم هێشتا پڕی دەفتەرە، یا غەوس
کەس نایەتە هانای دڵ و، ناگاتە هەناسەم
ئەم دەربەدەرە، بێکەس و بێ هەمسەرە، یا غەوس
هیوام دووە، دڵ ماندووە، هاوارە بە هاوار
یەک واریسە، یەک بۆ شەوی دڵ ڕەهبەرە، یا غەوس
بیستوومە کە پێڵاوی تۆوە، تاجی ویلایەت
سەییارەیی من لەم دەرەدا پەنچەرە، یا غەوس
کەوتوومە قوڕی ڕەنجبەرییەو، تێکەڵی بەدکار
پێمڕابگە، بارمکە لە ئەم مەحشەرە، یا غەوس
چەند جارە لە بەغداوە، نەهاتوومە دەری تۆ
لەم دوورەوە هەڵپەی منی سەوداسەرە، یا غەوس
گەر تۆش وەکو یاران لەوەفا کورتی بهێنی
قەت ناگەمە ناو باوەشی ئەو دڵبەرە، یا غەوس
لەم ئاهی جیهانسووزە، کە (پشکۆ)یە دەسووتێ
وا غەرقی تەمی ماتەم و خاکستەرە، یا غەوس.

(١١)

قەترەیی چاو و حەیا ڕژیی تکاوە بە عەبەس
عەرەقی عاریزی جانان ئەرژاوە بە عەبەس

---

١ غەوس ( غوث)، مەبەست لە (شێخ عەبدولقادری گەیلانی)یە، کە مەزاری پیرۆزی لە گەڕەکی (بابولشێخ) ی شاری بەغدایە.

گیان لەسەر تەختی گولاً، تێکەڵی زێیی ئەمەلە
خێوەتی زوڵفی سەنەم هەڵئەدراوە بە عەبەس
شەوی خاڵو خەتە، تالآنی خەیالآتی منە
دڵ بە ئەم بێکەسییە تێوەگلاوە، بە عەبەس
بە بڕین کاری کرا، عاشقی غەمگین جانا
تیغی پڕ جەوهەری تۆ، تازە سواوە بە عەبەس
باغی شەمشادو گوڵو لالەوو نەسرین ڕسکا
بولبولی خەستەجگەر باڵی شکاوە بە عەبەس
کونجی ئەو لێوە کە جێی ئاوی ژیانی[1] وەتەنە
کۆمەڵی خاڵی[2]، بەڵێ، تێ ئەخزاوە بە عەبەس
سەربەسەر، ماچی دەمی، جەننەتو دنیا دێنێ
بۆیە خاوەن وەتەنێ، لەم دووە ماوە بە عەبەس
پیری سەر لەوحەیی ڕەندانی خەراباتم ئەمن
قامەتی شۆخو لەتیفم نەچەماوە بە عەبەس
قەدەحێکی بە جگەرگۆشەیی، (ڕاجی)، ئادا
یاری بێدعەت هەوەسم، خاوەنی ئاوە بەعەبەس.

(١٢)

ئەی دڵ لە زەهادەت بەسە، تێکۆشە لە تەقدیس
ڕاکێشە بە پەرگاری تەرەب، عیشق لە تەدریس
ئەفسەت بە خەفەت بکوژە لە مەیخانەیی ڕێکیی
ڕابووره لە خەخانەیی ئەهرامنو ئیبلیس

---

١ لەشوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (کونجی ئەو لێوە، کە جێی ئاوی حەیاتی وەتەنە).
٢ لەشوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (کۆمەڵی خەتتی، بەڵێ، تێ ئەخزاوە بە عەبەس).

گەر مووری سولەیمان بە سەفا بێنییە بەردەس
زوو حازرو ژێردەستە، سوپاو جەننەتی بەڵقیس
خۆت غەرقی خەجالەت مەکە، ئەی یاری گوڵەندام
هەر فێری شەجاعەت بە، وەکو حەزرەتی ئیدریس
جارجارە لە حوسنا، ڕوحی یوسف بکە مەنزەر
یەعقوب سیفەت، مەستی تەحەممول بە لە تەعریس
تا نەقدی دڵو دیدە نەدەی، مەگرە قەدەح قەت
ئەو وەختە تەماشا مەکە بەدکاری بەدو پیس
وا بەخششی کۆمەڵ بووە خۆڕا، لە عێراقا
بۆیە لە شەش ئەترافەوە دایگرتووە ئینگلیس
دڵ بۆتە غولامێکی هەراسان، لە دەرو ژوور
تێکەڵ بە پرۆتۆنی بکە، بیکەرە تەکلیس
ڕۆژو مەحی فەرمانبەرە هەرکەس، وەکو (ڕاجی)
تێراوە لە یەکڕەنگیی و، وەستاوە بە تەئسیس.



-ش-

(١)

ئارەزووی ئازادییە چاوم بە تاوی ئەشکباش
چونکە هەقبینی قەدی تۆیە، ئەبینێ پێش و پاش
گەر ئەپشکوێ گوڵ، لە سایەی قەترەیی فرمێسکی من
سووزەیی ئاهم بەشێکی پێوەیە، ئەمجا هەواش
زەردە ڕووم، خوێنبارە دڵ، چاوم ئەڕێژێ باری کوڵ
تا خەجاڵەت بم لە ناز و بازی ئەو کۆترەی قەلاش
وەك بەلا، ئەشکی بەلالووك ئالووبالووم پێ ئەکا
بلقی گچکەم گەورە بوو، وەك مەوجی بەحری پڕ لە داش
وا بەدارم خستووە، ئەم سووکە تەونەی وەسڵی ئەو
بەمن کەمە، بۆم ناتەنێ ئەم ڕایەڵەی وا شاش و واش
سینەمایێکە دوو چاوی، سەد فلیمی پێوەیە
نیوە غەمزێکی هەزاران سیحرە، سەر شاشەی بەشاش
چاوی ئەو دەرچوو لە چاوبڕکێ، کە چاوی من هەڵات
تارمایی کەوتە سەر، هەڵنایە ئەمجا بۆ سەماش
ئەسپی ئاواتم گەلێ لاك و بنیاوە لە دووی
ئێسکی وا ڕەش بوو، سپی ناکاتەوە ئاوەنیاش
کاتی خۆمە، ئای دەبووم پڕ چەك بە بیر وەك پاڵەوان!
زەوتی کەم، بوومە نیشان، ئەمزانی دامییە بەر ڕەشاش
خاتری چاوی ڕەشی، هەرچی کە پێیکردم خەتی
ئێستە بۆ ئەمکاتە خەندەك، خوێنەکەم ئەخوا بەلاش؟
بۆ دەخالەت، من کە کەوتم لەم بەرو دەرگانەدا
تێك ئەچێ چاوت بزانی من تەڕاحم یا تەڕاش؟

سونبول و، مێلاق و، خونچەو، لەعل و، یاقووت و گوهەر
تێکەڵاوی ڕەونەقێکن، مەیکە باراشی مەزاش
بولبولی پڕ ناخی دڵ، وا چاوەنووسی خونچەیە
کێ هەیە گەر ئیستیفادەی لێ بکا، حەتتا سەباش؟!
دڵ، جگەر خواردیەوە، هاتە چاوی پڕ زام و گرین
تازە ناگونجێ بە تیغی موژگە بکرێ قاش قاش
تا دەریکرد گردەڵەی پڕ کێم و خوێن، هێنایەدەر
نەك ئیتر هەڵداتەوە ئەم عیللەتەی ناکێشەخاش
هێندە دڵخۆشم لە ڕێی وەسڵت، بە ناهەق بمکوژن
نارزم، وەك مەیتەکەی مەزڵوومی دوکان ئەرقەداش
بۆ دیەو ئەرسی دەم و لێوت، کە ماچێکم دزی
چیم هەیە غەیری دڵم، سا لەت لەتیکەو خاش خاش
هەر دەمە یەك سورەتی لێ دائەتاشم، ئەو گوڵە
سەیری من ناکا، کە بوومە ئازەری پەیکەرتراش
سەیری ئەم دنیایەکەو، باسی وەفای تێدا مەکە
هەر کەسێکی بێپەرستی، فەرزە هارێنت بە ئاش
تۆ، کە خۆت خستە پەناو بەختی گوڵێکی بەختیار
وا دەزانی ئاگری، دەستی دەسووتێنی و، مەقاش
ڕووت و قووتم، بێ کراس و بێ کەوا، برسیمە من
چاو لە دیداری گوڵی سوورم، وەزیفەی بێ مەعاش
کۆمەڵی فیکرم فڕی، غەمزەی دوو تاپڕ بوو، تەقی
ساچمەی خاڵی نەتیجەی عومری کوشت، ئیشم چەواش
چاندم و، تامم نەکرد کونجی و برنجی لێو دەم
گێرەشی پێکردم و دووری نیشاندام نیسك و ماش

گـەر نـەزانی حاڵـەتو بـەختم لەگـەڵ یـاران چـییە؟
بـاخی شـادیم تـازە سـاوا، دەوڵـەتی مـەرگم هـەراش
بـیرو بـازاڕو موغـازەم، پـڕ لـە ڕەنگـاوڕەنگی هـەق
تـا قیامـەت بیفرۆشـم، نـاکرێ (ژیکـۆ) قومـاش!!.

(٢)

عـەجایب! غەمزەکـەی چـاوی، لـە دڵ وەسـتاوە ئـەمجارەش
بـە سـیحرو نـازو عینـوانی، لـە دەر خـەملاوە ئـەمجارەش
سـەبا بـۆی زوڵفـی گـەر بێنـێ، مەشـامی دڵ بکـا ئـاوا
ئـەزانم یـار لـە قـاپی مەیکـەدە هەسـتاوە ئـەمجارەش
لـە هـەر فەسـڵێ کـە تووشـی هـاتبم، پۆشـیویە تەلعەت
لـە بەختی بـەد غەڵـەت بوومو، بـە خـۆی داداوە ئـەمجارەش
سروشـکم هێنـد بـەخوڕ دەڕژێ، وەکـو تۆفانەکـەی پێـرار
هـەموو عـەمری بـەدەن غـەرقی قـوڕو لـێلاوە ئـەمجارەش
بـە پـێچو تـابی ئەگریجـەی، دڵـی خـەڵکی لـە بـن هێنـا
ئـەمای کوشـتاری مەخلوقـە، کـە تێـک ئـاڵاوە ئـەمجارەش
لە دەر دانیشتبوو دلبەر، بـە سـەد عیشـوە لـە جێ هەسـتا
مەزەننــە وا ئەبــەم یــاران، ڕقــی هەســتاوە ئــەمجارەش
ھەتاکەی بێ خەمی (ڕاجی)، لە عیشقی ئەو پەری ڕوویـە؟
لـە بـەحری خۆشەویسـتیدا، دڵـی خنکـاوە ئـەمجارەش !!.

(٣)

ئـەی زەمـان، بۆچـی منـت کردۆتـە قۆچـی مـاری ڕەش؟
دوور لـە نـازو نیعمـەتو، نێزیـک لـە دەردو زامو غـەمش
ڕێکوپێنـک نایـەم لەگـەڵ کـەس، هاوتـام نـابن لـەبار
چـونکە نیـزیکم لـە هـەق، دوورم لـە خـەڵکو ڕزقو بـەش

پێکەنینم دێ بە گریانی سەرۆکو بەگلەران
چاو بەگریانم لە خەندەی ڕووتو قووتی سەر بەھەش
ھەر قوڕی مەرگە کە نەیپەستم بەسەر، تا پێ بە پێ
ئەم قوڕاوی نادەمە، بژێنمەوە وەك ڕەنگی گەش
دڵبەری ژینە، کە دینی تاڵان ئەکاو دڵ ئەبا
دینو دڵ گەرچی لەگەڵ یەك دوژمنن وەك پێنجو شەش
تاکو ڕووم ڕەش بوو، لە عالەمدا چ ناوم کردبوو
ئێستە ناوچاوان سپیمو، بوومەتە گاجووتی قەش
جۆکییو لۆتیتە یا شێخ، وەك دەمو قوونت بە گوون
خۆت جنۆکەی عالەمی، بۆچیتە جندو دێوی ڕەش؟
ھێندە بەد ئەسڵن لەگەڵ خەڵکی، مەلاو شێخەکان
چی ئەوان ئەیکەن، پەنا بەخوا ئیتر نایکەن فەلەش!
ھێندە ما (پشکۆ) لەناگردانی بەر لووتی جەمات
نێرگەلەو قەڵنەو سەبیلی، گشتی خستە کەشمەکەش.

(٤)

لە دەری مەیکەدە دیتم، سەنەمی بادەفرۆش
زوڵفی ڕەنگینی لەسەر کووپەوە پێچابوو لە دۆش
باخەڵی، وەك یەدی بەیزا ئەدرەوشاوە لە دوور
دڵی پڕ حەسرەتی پڕ کردبوو، ھەرلاوە لە جۆش
نازکو، خاوەنی دوڕدانەیەکی ناسوفتە
کە بە پڕنیشکێ ھەموو ئەونی ئەنی، دێتە خرۆش
چ سەفا سینەو پوستانی ھەواخوازی ھەیە؟!
کە لەبەر شێوەیی ئەو شۆخە، نە دڵ ماوە نەگۆش

لـــە هـــەموولا نەیـــەوێ، دڵ هـــەدەفی تـــیری بـــێ
کـەس نـەبێ بێتـەوە نـاو مەملەکـەتی نـاوەزو هـۆش
سـەیری نـەوتوولی قـەدی، چـەندە خـەرامان ئـەڕوا!
شـەنگەبی حـەددی چییە؟ بێتـە نـەزەر ئـەو بـە دڕۆش
سـۆزی جانـانی وەتـەن، ئـاگری دوو کـوڵمی ئـەوە
هەرچـی فانۆسـی دڵو دیدەیـە کردوویـە خـەمۆش
سمتو سـێ بەنـدە وەکـو گۆیـێ، بـە چـاپ دابـڕەژێ
بەلـەکی هـەروەکو مۆمـێ، کـە بسووتێ شـەوی خـۆش
دەمو لێـوی شـەکەرین، لـەعلو دوڕو یاقووتـە
سەروچاوی لـە جینـان، کەوسـەرە، سـا هەسـتە بنـۆش
پەنجـە زیوینــە، چ نەخـشێکو بـەهایێکی هەیـە
بۆ سەرەی مامڵەتی ناخۆ، چەند دەبی شـێتو پـەرۆش؟
گـەردەنی، شووشـە شـەرابێکە لـە پوڕتـەو داپۆشـراو
کـاکۆڵی وەك شـەوی دەیجـوورە، پەشـێوو مـەدهۆش
ئیـددیعای دینـی هەیـە، بێـچووە موسـڵمانە، دەڵـێ:
بۆچـەمە تـاجی سـەلاتین، چ دەکـا نـۆتو قـرۆش؟
شـاهیدم گێـسووە، سـا ئەرمەنییـە، کـوردی مەیـە
خـاوەنی جامـە، لـە هـەرلاوە ببینـە قـەرەپۆش
چ لـە تیفـە، چ گوڵئەنـدامو لەبیبـەو، شـیرین
ڕۆژی خـاوەر بوەتـە نۆکـەرو سـەججادە بـە دۆش
(ڕاجـی)، ئیمڕۆکـە چ ڕەندانەیـە تـەبیاتو وتـەی
یا لەگوێی شێتو نەزانان، ئەگوشـێنێ بـە سـرۆش[1]؟!.

---

١ لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (ڕاجی، ئیمڕۆکە چ ڕەندانەیە تەبعی شیعری یا لە ڕەغمی جوهەلا.

(٥)

ئیتتیلاعیم زۆرە مـن، نوسـخەی ریـسالَت بێتـە پـێش
حوببی خولـدم زۆرە مـن، چـاوەی زولاَلـت بێتـە پـێش
مـن نەسـیمێکم لـە سـوبحو نیـوەڕۆژو نیوەشـەو
تـا لـە زەردەی ڕوومـەتم، بـاغی جـەمالَت بێتـە پـێش
عاشقو ڕەنـدم، لـە دەرگانـەی خـەمت کەوتوومـە کـار
خۆش، لە مەیخانەی دەمت، جامی حەلاَلت بێتـە پـێش
سـینە پـڕ ئـاگر، گەڕیـدەی سۆزشـی ئـەتواری تـۆم
تـا ئەمـە خوایـە فـوارەی چـاوی کالَـت بێتـە پـێش
عـەزمی دیـدارم لـە دڵ ناچـێ، بـە مـەرگو زینـدەگی
تا لەسـر تەختەی بەشم، لوتـفو کـەمالَت بێتـە پـێش
دەردی بێـدادم، بـە سـەرگەرمی فڕێـداوم لـە جـێ
با لە موستەشفای لەبت، دەرمـانی حالَـت بێتـە پـێش
دائیمـا ئومێـدەواری وەصـلَی یـارم، (ڕاجیـا)
بـا لەسـەر سـینی ڕجا، لـەعلو لوئالـت بێتـە پـێش.

❊❊

---

هاتووە دیوانی سرۆش).

- ۆ -

(١)

تا لە کوڵمەیدا تەماشاکەم بە دڵ ئەنواری حەز[١]
دێمە گوڵبانگ و شکۆفەی بولبول و گوڵزاری حەز
سیلسیلەی کاکۆڵی پڕ پێچت بە جۆرێ هاتە ڕوو
وا لە ژێر پێی ناوە باخ و مێرگوزاری شاری حەز
شەرتە تا من بەختی بەد، هەمیارو یاریدەم بدا
نەیخەمە بەر دەستی کەس، خەرمانی شیرینکاری حەز
بێکەس و سەوداپەرستی وەك منی شەیدا نییە
ناهومێدی قیبلەگاهی دڵبەری عەیاری حەز
بەسیە بێ مروەت، هەتاکەی تەفرەدان و دەردو خەم؟
بەم هەموو ڕوتبەو نیشانەو تاجی هیممەتداری حەز
بیدعەتی چاوت بە شۆخی، ماڵی کاڵی پوختە بێ
بەڵکە نەمکێشێتە تاق و کۆشك و دیواری حەز
تیغی دڵبەر مەرهەمی ئازارە (پشکۆ) گەش بەوە
هەستە دایڕێژەو بپۆشە جەوشەن و زوننادی حەز.



١ سەرواى دێڕەکانی ئەم هۆنراوەیە بریتیە لە وشەى (حظ) کە بە واتاى (بەخت) دێ، وامان بە باش زانی بە ڕێنووسی کوردی بینووسین.

-ع-

(١)

دڵ لــه بەنــدی جەژنــە گێــژەنباره یــاران، ئەلویــداع
ڕۆح لــه داوی غــەم كــرا ئــەی غــەمخواران، ئەلویــداع
هەر كەســێ مەشــغوولی كوشــتو عوشــرەتو قوربانییــە
من بە قوربان، بوومە فیتنەی جێژنی قوربـان، ئەلویـداع
لێمگــەڕێن تـاوێ بــه گریــان، ئـاگرێ هەلكـەم لـه خـۆم
جەننــەتم نــاوێ بــە ســەیرانی ڕەقیبــان، ئەلویــداع
نــازكو بــاڵا بڵنــدو، ســەوزە پــۆشو، خونــچەدەم
ئێسته لـێم تـۆراوه چـبكەم؟! سـەد هـەزاران ئەلویـداع
دەردەدارم، بێقــەرارم، خەســتەیی شــاری غــەمم
لەشكری زەحـمەت فـەنای دا جیـسمو ئیـسقان، ئەلویـداع
ئەلویـداع، ئـەی مـەنزڵی جانـانی قامـەت عەرعـەریی
ئـەی شـەكەر لـەفزانی بـاخی دیـنو ئیمـان، ئەلویـداع
ئەلویـداع، ئـەی جـەمعی سـەییادانی عـەقڵی عاشـقان
ئـەی گوهەرســەنجانی جـانی حـوورو غیلمـان، ئەلویـداع
ئەلویـداع، ئـەی سـاقییانی مەیكـەدەی پـڕ میحنـەتان
ئـەی عـەزیزان، موتربـانی شـاه و ئـەركان، ئەلویـداع
ئەلویداع، ئـەی قـووتی ڕووحو قـەلبو گیـانی (ڕاجیـان)
وا لە هیجـرانم حـەزین، ئـەی پـیری كـەنعان، ئەلویـداع!!.

(٢)

ئەیغەمــە باوەشــی تكـا، دڵبــەری ژیــن بــە ســەد ســەعی
اَطـــوفُ خَـــدِّهِ كَمـــا حـــاوَلَني بِمَـــضْجَعِ
ڕۆحێك لە دوو بـەدەن دەكـا، دڵبـەری لــێ بەگـەن دەكـا

لـــهُ الكَمـــالُ و البهـــاء، فَهـــوَ عَجيـــبُ المُــصْنَع
یارێکـــه وا یاریدەمـــه، دەردو بـــرینو مەرهەمـــه
بِقَـــــدِّهِ المُلَمَّـــــع ، بِخَـــــدِّهِ المُقَنَّـــــع
بکێـشە چـەرخی غەبغـەبی، دڵـی فیداکـه وەك لـەبی
بِجـــــذرِهِ المُكَعَّـــــب، بِـــــصَدرِهِ المُرَبَّـــــع
شـــێوەو ڕەوشـــتی کوردیـیـــه، دلێـــری دەســـتوبردیه
وَلاَ يَخـــافُ مِـــنْ دِيَـــة، يَقْتُـــلُني بِالأُصْـــبُع
بـه پەنجەدەسـتی نـەرمو شـل، بەخۆشـەویـستیم کاتـه مـل
أَلْـــفٌ خَـــيرٌ مـــا يَـــدُلّ، عَلـــى نِظـــامٍ مُرتَـــع
خـستمییە بەنـدی چاوەکەی، بـه دەسـته زوڵفـه خاوەکـەی
بوفْقِـــــهِ المُـــــسَبَّع، و سَـــــجْعِهِ المُتَّـــــسع
بـه نـازی نۆبـەمینی ئـەو، دڵـم فـڕی لـه چەشـنی کـەو
عِنْـــدَ غُـــروبِ عَقْـــرَبٍ، شَـــمسٌ بَـــدَتْ بِمَطْلَـــع
(پـشکۆ) کـه هاتـه سـۆزەوە، لـه ڕووی ژیـانی هـۆزەوە
يُـــنظِّمُ البُنـــودَ عَـــنْ مَرامِـــهِ المُنَـــوَّع.

* *

-غ-

(١)

لەم قاپییەیی دڵبەرە ڕاخستوە یاتاغ
تاکو هەڵیدەم قامەتی ڕەنگین وەکو بەیداغ
ناڕژم بە هەموو لەشکری خاڵو خەتو پەرچەم
تاکو نەگرم شوورەیی باغو گوڵی یاساغ
فەرمووی بەدەمی نازەوە: خۆت مەکوژەو ڕاکە
کوشتن لەسەر ئەو خۆشە، ئەوەك ببمەوە قاچاغ
هەردەم لە دووای چارەیێ، هەردەم لە هەواری
گیژدەیی بێ دەوڵەتییو دڵ پڕو ناساغ
گەر کاری پەراگەندە بە زنجیرەوە چەسپان
نۆرەی گوزەرو گەشتە، لە مێرگو ڕەزو ساناغ
بۆم بێنە لەسەر سەوزەوە، دڵدار بە دڵدار
بۆم تێکە بە ئەو نازەوە، پەرداغ بە پەرداغ
ڕۆژی گەیینو، پێگەیینو، شادی یو جەژنە
لێدەن چەقەنەو عودو دەفەو بەستەو بەرماغ
بگرن دەس‌و باوەش، بەرەڵا، تێکەڵی ئارەق
بگوشن مەمو، بمژن دەمو، دەرکەن چەقەڵی باغ
(پشکۆ) چییە؟ سووزندە نەبێ بۆ سەرو پەرچەم
پەرچەم چییە؟ گەر هەڵنەکرووزاوە بە دوا داغ.

(٢)

پڕە دەریایی سووروشکم، چ لە دامەن، چ قەراغ
لە دوڕو گەوهەری شاهی، لە سکەی گیان‌و دەماغ

وەرەوە دڵبەرەکەی باوەشی خواهش، کە ئەمن
کێم هەیە بێجگە لە تۆ، بێتەوە ماڵم بە چراغ
هەروەکو خونچە ئەپشکوم، لە بەرودۆشی تووا
بە پیاسەی دەمی بولبول، بە هەناسەی ڕەزو باغ
بێ تۆ ئەی غارەتی دینم، بە خودا چۆڵە وڵات
بێ تۆ ئەی مایەیی ژینم، بە خودا کوێرە وەجاغ
لە تەرازووی ئەدەبا، هێشتە بەرابەر نابن
عارەبی سیبەری میسری‌و، کچە کوردی قەرەداغ
پرسیارم کە دەکا، ئەو گوڵە ناسک بەدەنە
ئەبیە یەك تکە ئاوو، ئەچمە دەشتی موغاغ[1]
بە نەسیمی سەحەریی، مردووە، زیندووی بکەوە
باوەشێنێکی بە زوڵفان بکە، (پشکۆ)یە نەساغ!!.

(٣)

دڵ لە سایەی زوڵف‌و خاڵت، بۆتە خەزنەی دەردو داغ
هەر خەیاڵی خۆی ئەباتە سەر گوڵی ڕووت وەك نەساغ
چاوچڕ کوێر بوو، لە چەرخی عیشوەتا چاوچڕکەمە
چاوی دڵ باڵاتە، بەسمە بۆ عیبەر یەك چاوی ساغ
نێرگسی زەردو سپیم، فەرمانی دڵتەنگیم ئەدا
تا کراسی گوڵ بەشارەت هەڵئەکا بۆ پیر وەجاغ
چەند لە بیری خۆشی تۆدا، ڕاپەڕاندم بیرەخەو
یەعنی سەربەستە دڵم، وەك قامەتی سەروت لە باغ
عیشقی تۆ مەیخانەمە، هەر سۆزو سازێکم هەبێ
هەردوو قۆناغم بەوی ئەبڕم، لە سێ، ئەکرم وەتاغ

---

١ موغاغ، گوندێکە لە نێوان سوسن‌و گوندی کانی میران لە سەر ڕێگای گشتی دوکان   سلێمانی.

سەدای سەمتووران، خۆش هاتنە گوشەم
هۆزێـك نـە مەرگـەن، وان تێنەکۆشـەن
بـۆ نیـە (پـشکۆ)، سـەرجەم کوژیـاوە؟
بـە زامـانی گـەل، خـەیلێ پەرۆشـەن.

(٢٢)

مەستی کردم بێ خەبەر، ساقی لە جامی مەی دەهەن
بەندی کردم موتریبی خۆش لەهجە، شیرین، سیم تەن
بـۆم بلـێ شـوورو بـەیات و، چـوارگاو ڕۆم و حیجـاز
شەرقیو قـەززو نـەوا، سێگا، سـەبا، دەشـتی، چـەمەن
بیخـە ڕاسـتی حەنجـەرە، بەنـدو، عێـراق و، دەسـتگاه
لاوك و حـەیران و لامـی، نـەرم و شـل، پـڕ سـۆزو فـەن
دەم لـە مەنـسووری بـدە، ڕوویـی دلارا بێنـە جـۆش
خۆش بچێژە مەسنەوی، گوڵ گـوڵ، لەباسـی یاسـەمەن
خـاڵی ڕێـوارو قـەتارو، ئـای ئـای و نیوەشـەو
تـا لـە هـەوری لارەوە، نـەشمیل بـە ئاغـا دا میحـەن
لێو لە نەی ڕەختی شەم و، ڕەقس و، شەپۆل و، ماە و زەر
پـەردەوو، بـالۆرەوو، بووکانـە، بـۆ هـاواری تـەن
(ڕاجیـا)! ئێمـشەو عەجـەب مـەیلت کـە مۆسـیقارییە
یانـە زانیوتـە لـە گـوفتی موستەشـاری موئتەمـەن؟!

(٢٣)

ئـاهووانی چـاوی دڵـداران، شـکاری شـێر ئەکـەن
هـەر لـە منـداڵیوە خۆیـان پەنجـەبازیی فێـر ئەکـەن
ئەمکوژن هەردەم بە ناهەق، شـۆخەکانی دیـدە مەسـت[1]
دڵ دەسـووتێنن لـە ڕووی خۆیـان و گۆیـا خێـر ئەکـەن

١ لەشوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (دەمکوژن هەردەم بەناهەق، شۆخەکانی چاو هەڵۆ).

هــەروەکو پــیرۆزە دەشــکێنن دڵــی ئێــسقانی مــن
خۆ لــە مــەغزی مــن عــەزیزم، جــارە جــارە تێر ئەکــەن
هــەی بــە قوربــانی ســوپاهی خاڵــەکانتان بم، کــەوا
هــەروەکو بتپــەرەوەران، تــەقوا لــە تــاقی دێــر ئەکــەن
وەختە دڵ دەرچێ لە تەن، دەرچم لە دین، بمرم لــە تــاو
ئــەو نیگارانــە، کــە بــازی ڕاســتو ژوورو ژێــر ئەکــەن
هێندە بێ ڕەحمن لەگەڵ خەڵکی، دوو چاوی مەهوەشــان
وا لــە کــونجی بێکەســیدا، گیــانو دڵ بــێ خێــر ئەکــەن
(ڕاجیــا)، چــونکە عەجــەب کارێکــە ســا هــەردەم بڵــێ
ئــاهوانی چــاوی دڵــداران، شــکاری شــێر ئەکــەن.

(٢٤)

نیگــاران گــەر بــە مــن ڕۆژی هــەزار جێگــا نەکــەن چــبکەن؟
لــە ڕاوی بێکەســان ســەد تــیر لــە دڵ ئــاوا نەکــەن چــبکەن؟
بــە دەم ئەگریجــەدا، گیــانو دڵــی عالــەم ئەجۆشــێنن
بــە ئــەم زنجیرەیــی مــوو، عالــەمێ شــەیدا نەکــەن چــبکەن؟
لــە چــاوانا ئەڕێــژن بــادەیی مەســتی بــەناو دونیــا
بــەڵێ، گــەر جوســتوجۆیی عالــەمی بــاڵا نەکــەن چــبکەن؟
ئەچن وا جــون بــە جــون، تــاڵان بکــەن ئیمــانو دیــنو ژیــن
لــەلای خۆیــان وەهایــە، ڕوو لــە ڕێــی تــەقوا نەکــەن چــبکەن؟
لەســەر مــوڵکی دڵو ســەر، ئــەو شەهەنــشایانە تــا مــاون
ئەگــەر دەســتی تەســەڕروف دائیمــەن والا نەکــەن چــبکەن؟
کــە یــارو موتریبــو ســاقی، بــە بــەزمو ڕەزمــی دڵ وەســتان
سەرانسەر دەفتەری مەستیی، بەمەی ئینــشا نەکــەن چــبکەن؟[1]

---

١ لەشوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (سەرانسەر دەفتەری مەستیی، لە سۆز ئینشا نەکەن چبکەن).

لــە داغێکــی دڵــی (ڕاجــی)، شــکاون نەشــتەرو خەنجــەر[1]
تــەبیان گــەر بــەهای موژگــان لــەمن داوا نەکــەن، چــبکەن؟

(٢٥)

بە چەرخی عیشوە، نازگــان، زەمانــە عەنبــەرین ئەکــەن
بە پێچ و تورڕە، دڵبەران، جینن و بەشەر لــە دیــن ئەکــەن
لە کوچەگاهی دڵبەریی، بە نــاوی شــاهیدیی کــە دێــن
لە ڕوویی قــەتڵ و عامــەوە، عالــەمی دڵ ئــەمین ئەکــەن
بەدەنگ و ڕەنگی هاموشۆ، ســەرایی چەشمەســاری مــەی
بە سەد فــسوون و ســاحیری، لەســایەبانی چــین ئەکــەن
دەمێ بەکام و شەرمەوە، تەڵــەب ئەکــەن نوقــودی جــان
دەمێ بەلێوی گەرمــەوە، غــەزەب پــڕی جــەبین ئەکــەن
نومــایی گــوڵ دەدەن دەمــێ، لــە ڕوومــەتانی ئافتــاو
کــە قومریــانی تۆقەچــی، لــە تــۆقی یاســەمین ئەکــەن
لە میوەجاتی خــاڵ و خــەت، دەدەن بــەراتی نیــوە شــەو
خــەڵاتی بــێ دڵانــی غــەم، لــە بــاغی نــازەنین ئەکــەن
بخــوری مەجمــەری ڕوخــە، بوخــاری زوڵفــی هەڵئــەدا
ڕقومی ڕەنگ و بۆیی مەی، لــە جــامی ئــاگرین ئەکــەن
چ تاقمێکــە دەم بــەدەم، بــە نــازو نــازکی ئەچــن؟
جگــەربراوی عیــشقیان، لەشــاری ئــاه و شــین ئەکــەن
دڵۆپــەزارە چــاوی مــن، لــە کارخانــەیی فــیراق
کە دڵبەرانی فیتنەچی، لە سۆزی (ڕاجی) کین ئەکەن!!.

(٢٦)

لــەعل و گوهــەرو لالــە، بــە خەنــدەی تــۆ لــە بــاون
کــوردو عــەرەب و شــیعە، لــە زوڵفــی تــۆ بــەداون

---

٢ لەشوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (لە داغێکی دڵی (ڕاجی)، شکا نەشتەر بەسەد ملیار).

تا جامی دەمت دەم بە دەمە، ئەی دەمی عیسا
ئەم کۆمەڵەیی عیشقە هەموو زیندە کراون
گەر حاکمی دوو چاوی سیاهت، سەری کێشا
وا دیارە دڵ و عەقڵ و سەرو سەبر شکاون
زوڵف و خەت وخاڵ و، کەمەرو گەردن و باڵا
هەر شەش لە عەزابی منی دڵ خەستە بەتاون
یەك عیشوە لە مەیدانی تەمەن بگرە، بەهیوا
موفتی و عەسەس و عاشق و پاشا، لە بەراون
رازانەوەیی مەملەکەتی زوڵف و روخی تۆ
ئەم رۆژو شەوە، چونکە سەرو سیرری لەناون
ئەی شانەزەنی پەرچەمی چین چین، وەرە سەیران
پەروانەوو دڵ، بولبول و (راجی) کە کوژاون.

(٢٧)

خۆی لەمن پەنهان دەکا، ئەو دڵبەرەی رەنگین جەبین
ئەی هەلە، شۆخی زەمانم بۆتە شێخی سەر زەمین
راحەتلحەلقوومی قەترەی ناو زەنەخدانت هەبێ
تك بە تك دەتوێتەوە شەککەر لە ژاری ئەنگەبین
ئەی دڵی بێ رەحم و لوتفی تۆ، حەکیمی حاڵ زان
وەی دووچاوی پڕ فسوون، عالی تەبیبی رەنگ بین
چونکە خاڵی روومەتی، میعیاری ئەهلی حیکمەتن
وا لە جەننەت بوونە جێگەی مەرحەباوو ئافەرین
گوایا من کافرم، ماچی دەمی داوا ئەکەم!
ناوی زوڵفی ناوە هەژدەر، بۆ گوناهکارانی دین
تا بە ریسوایی نەرۆم، سا شەرتە نەچمە دەر لە شار
تا بە کوژراوی نەچم، لەم چاوە بەر نادەم کەمین
من کە رازی بم لە دڵبەر، ئەو دەبێ عەفووم بکا
بەم دڵی پڕ ئاه و جەرگی لەت لەت و چاوی گرین

پەرچەمی گەشکەی بە عالەم دا، لە ڕێگەی چاوەزار
بۆیە چاوی بێ حیجابانە، لە چاوی نین ئەمین
هەر بناڵە تۆ بە تیماوی لە کوورەی میحنەتا
(ڕاجیا)، تا مل دەهاڵێنی لە بەندی یاسەمین.

(٢٨)

ئەی سەمەن بۆ، غونچە دەم، قامەت سنەوبەر، زوڵف چین
لاحَ لي العَيشُ مِنَ الوَصلِ بفِيكَ بالْيقين
چاوی ئاویی، جیسمی خاکیی، جان هەوایی، قەلبی نار
مُستَدیمونَ لَدَیكَ للوَفاء ناظرين
خانەقای بەزم و نەوای قەد شۆخی یار، وا تێگەم
هذه جَنّاتُ عَدنٍ فَادخلوها خالدين
سەلسەبیلی لێوی ئاڵ و، شەهدی لوتف و، ڕەمزی چاو
هذه آلاء خُلدٍ، فَاشْرَبُوها دائمين
بێ دڵان، قوربانتان بم، بێ ئەدەب قەت مەچنە پێش
خَيرُكُم عِندَ الحَبيبِ، أن تقوموا قانتين
مائیدەی سینەت، لە هەنگوینی موسەففاو شیری ساف
إنْ هيَ في العِشقِ إلّا لَذّةٌ للشاربين
(خالید)و (حەللاج)و (سەعدی)، بەم تەریقەی عەشقیە
قالوا آمَنّا، وكانوا في العُلومِ راسخين
عابیدی کونجی غەمی تۆ بووم، بە تیری کوشتمت
قَدْ شَهِدتُ، فَالجِنانُ أُزلِفَتْ للمُتَّقين
(ڕاجیا)! ئەم سەوزە خەتتە، مووجیبی دڵخۆشییە
فَاعتَصِمْ في العِشقِ حَتّى مُتَّ بِالحَبلِ المَتين.

(٢٩)

لە ناچاری لە چاوا ئاوە گەردین
لە ژێر پێی عالەما مردین و پەردین

کــــه دڵبــــەر هاتــــە کووچــــەی عیــــشقبازی
بــــە تــــاڵان ڕووح و مــــاڵ و دینــــی بــــردین
چ هاوارێکــــــە وا کەوتۆتــــــە ســــــینەم؟
لەگــــەڵ بــــەختی ڕەشــــا، بــــێ دەســــتوبردین
بــــە دەم چــــەوگانی دوو زوڵفــــی ســــیاهی
لــــە مەیــــدانی مەشــــەققەت، گوایــــە گــــەردین
لــــە بــــیرت چــــوو نیگــــارا وەختــــی تیفلــــی
کــــە ســــەیرو ڕاوو ڕووتــــت پــــێ ئــــەکردین؟!
ئــــەتۆ مــــەه بــــووی و ئێمــــە هالــــە دائــــیم
کەچــــی ئیمــــڕۆ لــــە دەورا، وێڵــــی هــــەردین
مــــەڵێ (ڕاجــــی)، گــــەلێ زارو نــــەزارین
ئەگەرچــــی پــــڕ عەبــــەس، لــــەم ڕێگــــە مــــردین.

(٣٠)

ئەم دڵبـەرە، چـەند دڵبـەرە، چـەند دینبـەرە، شـیرین؟!
ئەم نەی لەبە، چەند مەی لەبە، سەد مەرتەبە، ڕەنگـین؟!
غـارەتگرە، ڕوو ئـاگرە، جـان هەڵـگرە، هـاوار!
خاوەن خووە، پڕ جـادووە، خـەت هینـدووە، موشـکین
چـەند نازکـە، چەند چاپکە، چـەند نـازە لـە دەمیـا؟!
ڕەنگ ئەسمەرە، قەد عەرعـەرە، سیمینبەرە، گـوڵ چـین
تالیـب کــوژە، عاشـق دژە، کەوسـەر مـژە، شـاهم
خوێنڕێـژە، نیهـان بێـژە، جینـان چـێژە، خـودا بـین
هەر عوشرەتە، هەر شەوکەتە، هـەر ڕەحمەتـە، هـەر نـاز
هەر میحنەتە، هەر زیللەتـە، هـەر حەسـرەتە، هـەر کـین
دڵبـازە، خـۆش ئـاوازە، سـەرئەفرازە، سـەفاخواز
نـەو ڕەستەیە، گـوڵ دەسـتەیە، شایـستەیە، نەسـرین

ناگاتــه مولاقــاتی لـــه بەدبەختییـــه، (ڕاجـــی)
بێـزاره لـه خـۆی، خەستەیە، دوعـا بكـه: ئـامین!!.

(٣١)

خنجیلـــه! وەره پێكـــەوه بـــا نەشـــئونما كـــەین
بۆ عیشقی ئەزەل، شوكری ئەبەد، زیكـری خـوا كـەین
گەوهــەر كــه بــەمۆنراوی ئــەدا ڕەونــەقی دوكــان
بـا ڕوویـی یـەكیی، هـەردوو، لـه دیـوانی وەفـا كـەین
ڕەحمــێ بكــه، مــن كوشـتەیی یـەك چـاوه تەماشـام
سـاتێ بـه هـەوەس، پێكـەوه بـا سـەیرو سـەفا كـەین
لـەم دووریـیـه مــن عـاجزو، تـۆ خـوڕڕەمو خەنــدان
بـا تـەركی ڕەقیـبو، عەمــەلی زوهــدو ڕیـا كـەین
عیـشقت كـه لـه مـن باخـچەوو مەیـدانی قومـاره
چەند خۆشـه ئەگـەر پێكـەوه لـەم دەشـته هـەرا كـەین
تـۆش تـیری مەحەبـەت لـه دڵـی داوی، كـەوابێ
مەفرۆشـه بـەناز ئـەم قـەدە، بـا یەكـدی دەوا كـەین
ڕەحمــێ بكــه، چـیتر بـه جـەفا مەمخـەره غوربـەت
وا چــاكه سـەری عیـشق بــه بـالیفی ڕەزا كــەین
عالــەم، كــه هــەموو غەرقــه لــه دەریـایی مەلامـەت
قوربـان وەره بـا دەم لـه دەمـا، حەمـدو سـەنا كـەین
(ڕاجـــی)! مـــن و یـــارم لـــه فـــیراقو لـــه ویـــسالا
گەر ڕێـك بكـەوین ڕەنگـه كراسـان بـه كـەوا كـەین.

(٣٢)

ئەی پەرچەمت گرێ چین، وەستاوه چـین لەسـەر چـین
بەسـتووته ڕۆحـی مـسكین، گرتووتـه دیـدە، بـێ دیـن
بەم دەستو پەنجـه ئاڵـەت، بـەم چـاوه شـۆخو كاڵـەت
بـەم لـەبو كـوڵمو خاڵـەت، تـۆ ئـاگر، ئێمـه بـەنزین

**هەر تۆی کە پڕ کـەمالی، هـەر تـۆی بـە سـەد جـەمالی**
**جـووتیّ بـرۆی هـیلالی، ئەیکـەی بـە بـازو شـاهین**
**هـەرجیّ ئەچـی بـەهارە، ڕووت ڕۆژی دەشـتو شـارە**
**حوسـنی تـۆ هـەر دیـارە، بۆچـیمە چـینو ماچـین**
**موتریـب بڵـێ هـەوایێ، سـاقی دەتێکـە چـایێ**
**یـار هاتـەدەر لـە لایـێ، دڵ کەوتـە فیکـرو تـەخمین**
**ئاپێتـەدەر هەناسـەم، دڵـزاری ئـەم هەیاسـەم**
**کوشتەی ئـەو سـەر بـە تاسـەم، تـاڵان دەکـا سـەلاتین**
**ڕازاوە دەشـتو سـەحرا، یـارم حیجـابی لادا**
**دنیـا چـووە تەماشـا، ئـەی دڵ ئەمـەش دەبابـچین**
**بـردی عـەقڵو کـەماڵم، سـەودایی زوڵـفو خـاڵم**
**دەگـریمو هـەر دەنـاڵم، دڵ سـەردو سـینە هـاوین**
**(ڕاجـی) کەسـت نـەماوە، بـە خـوا دڵـت شـکاوە**
**ئـەم لێـوو کـوڵمو چـاوە، لـە تـۆ دەکاتـە پـەرژین!!.**

**

-هـ-

(١)

## ڕەوشی خراپی بینای مزگەوت

مزگەوتە تەویلەی کەرو گۆلك، چ خەرابە
بۆ مێش و مەگەس بۆتە موقەددەس وەکو کابە
تەعتیرو بخووری هەمەدەم قشپل و ڕیخە
پێویستە (مەلا)ش بێتە جەماعەت بە ئینابە
مەنزڵگەهی منداڵ و قومارە، بە جگ و فلس
بۆ سەربەسەری، پڕ عەرەق و دەوری شەرابە
دیوارو حەساری هەموو وێرانە بە ڕووخان
وەك عاسیمەیی کۆمەڵی بێ دایك و بابە
ئەو نوێژە چ نوێژێکە، کە ئەکرێت لەوێدا
هۆزێکە، پەرستێنەری مەولایی عیقابە
ئەو هەڵهەڵەو زیکرە، کە ئەڕوا بە سەمادا
لەو مەزبەلەدا گشتی دوعای فیتنە موجابە
شوانێکی وەکو من، دەرەقەت گۆلکێ نایا
کابان، چ هەویێزێکی دەماڵێ؟ بە تەمابە
کەر، حەزرەتی ئەسکەندەرو من بوومە ئەرستۆی
گەر دین ئەپەرستی، بە هەموو ڕێگە ڕەزا بە
پێویستە لەسەر شانی مەلا خزمەتی مزگەوت
ئەم دێیە سوتالی هەموو بێ قەیدو جەوابە
پێستیشی نییە، مەغزی ئەوێ میری موبارەك
وا دیارە هەموو کاری ئەمرازوو، بە قولابە

بەو بۆنو بوخارە، کە مەلا کاسە هەناسەی
وەك مەستی هەوای ڕەشبەڵەكو دەنگی ڕوبابە
چونکە بە هەموو شێوە، زمان دێتە سفارش
بێ عەیبە بڵێن، خاڵەمەلا تۆخی شەرابە
ئەم وەعزو ئەحادیسە، کە ئەڕوا بە هەوادا
وەك بایەکی ناوەختو، وەکو فوو لە جەڕابە
من خاوەنی زانستو هونەر، بوومە قومارچی
بەو پووچەڵی سەرفیترە، مەلا، حاجی شەهابە
ڕەببی! بە خەی بگرە، بەڵام دوور لە کەنیشتە
دووربە لە مەلا، یەعنی بڕۆ مالی چا بە
خۆزیا ڕەبەنی دێرە ئەبووم، عائیلە وازی
نەك هەڵگری ئەم غەیبەتو بوختانو عیتابە
گشتی بە قسە خزمە، بە یەزدانی تەعالا
گشتی بە عەمەل، هەمسەری شەیتانو دەوابە
بڕوانە موسڵمانییو، بڕوانە موحەمەد
ئەم هۆزە بڵێ چۆنە بەرامبەر بە سەحابە؟
فەرقێکی نییە، تۆ کەرو من عەینی مەلا بم
تۆش هەروەکو من مونتەزیری ڕۆژی جەزا بە
گوێم هەردوو زرینگانەوە، بەم وەحیی سەماوی
(اللُّسنُ شرارٌ، عَمَلُ الخَيرِ كِتابَة)
نیشێکی بکەم، مامە، بەزانینەوە ئەیکەم
وەك تۆ بە کەریی نابێ بڵێم: دایکەنە، دابە
تابیع بە ئیمامێکو، ئیمام تابیعی قەومی
تا دوو سەرە بێ، ئێستە ئەڵێم: عەینی سەوابە

هەرچی بیەوێ کەشفی حەقایق، لە وتارم
بیخاتە سەری، تالیعی ئەنگوستی سەبابە
داوایی دوو کەس، ڕاستە یەکی‌و ئێکی درۆیە
خۆی پێچە، ئەڵێ: وەی لە مەلا پیاوی خەرابە
(ڕاجی) وەرە سا مەیخەرە ژێر پێ، ئەتەوەی بەخت
بیستێنە لە یەزدان‌و، بەڕووی ئەو گوڵە شا بە.

(٢)

ئەوەی من پێمەدوێ ساقی! پیاڵەی مەی نییە، کووبە
ئەوەی تۆ پێم ئەدەی باتمان نییە، مسقاڵە یا ڕووبە
لە خاکی مەیکەدەی تۆدا، سەری شادیە ئەنوێنم
موسڵمان نی، مەسیحی تۆ، مەسیحییش گەر نەبی، جوو بە
بتێکی وا لەسەر شانت، بە ناوی زوڵف داناوە
کەنیشتەی ماڵ‌و مریەم، پڕی غەوغاو ئاشووبە
تەماشای زەردەڵووی سینەت دەکەم، یا قۆخی بەر گەردن
ئەتۆش سەرخۆشی خاڵی، هەر خەریکی ئاڵوباڵوو بە
دڵم هاتە خەیاڵی وەسڵی چاوی کاڵی ئەو شۆخە
وتم: بۆچی ئەوەستی تۆ؟ لەڕێگەی شێریا ڕوو بە
تەماشاکردنی کوڵمەت، دڵی عالەم ئەپشکوێنێ
بە دوو زوڵفت، ئەسیمی جەننەتولمەئوایی دوو ڕوو بە
بە ناز ئێوارە تێپەڕبووی، کتوپڕ سینەمت پرواند
بە چاوی تۆ فەریکم، سا خەریکی داس‌و داسوو بە
چ باکم دوژمن‌و فێڵە، چ باکم عالەم‌و لۆمە؟
کە من هەر شێت‌و بێهۆش بم، ئەتۆش هەر ناز‌و جادوو بە

کە بڕیارێک ئەمدا دیدەت، لە خەودا بیێم و بتنۆشم ئەوێرم بێمە باوەشتا، بە من چی؟ هەر خەوالێو بە جەفاکاری دوو عالەم هەر ئەتۆی و، تۆ وەفاداری شەهەنشاهی سەرو بەختو، ئیرادەو دەستو بازوو بە کە (پشکۆ) بەختی ناپشکوێ، لە لێوی ئەو دلارامە خەڵووزێکە، لەبەر چاوی نیگاران بۆتە ئوعجووبە.

(٣)

ئەی دڵ وەرە بەس بەندو گرفتاری یەخەی بە سەرخۆشی دەم و لێوو گوڵاو، پاشی قسەی بە لەم کوورەیی دڵدارییە، هەر مای و ئەسووتای سووربوون و ئەسووتان و گرین، لۆمەو عەیبە جارێ بە وەفای وەعدەی و، مزگێنیی ماچێ زیندووبەوە، ئەمجارە بە مەرگی هەڕەشەی بە جارێ بە هەوای کوڵمە، لەبەر تاوی بەهاری جارێ بە تەمای زوڵفی، لە بن داری خەنەی بە لەم مێرگ و غوزارانەیی سینگ و مەم و کوڵمەی وەك بەرزەیی بێ کلك و گوێ، فێری جەنەی بە هەر ناشێ کە بینێیەوە، قازانجی ڕەچاوکەی دڵداریی ئەبێ، هەستە، لە بەستەو چەقەنەی بە بێجگە لە مەی و مەیکەدە، ئیشت هەیە؟! مەیکە هەر ئۆگری ساقی و تەرەب و ناڵەیی نەی بە تا ماوی ڕەمەوودەی قەدو، بەدناوی دەمی بە پێناوی زڕەی دەستو، تکەی زەردەخەنەی بە

گەر ببییە سەرەی جەورو جەفاو، چەرخی زەمانان
باکت نەبێ لەم گێرەیە، گاجووتی بنەی بە
چرنووکی خەفەت، بیکە شرینقەی سەرو بەختت
بۆ ڕۆژی هەوەس، قەبزە قەنەی ئەو زەقەنەی بە
(پشکۆ)! وەکو گوڵ پێکەنە، خێرابە بپشکوێ
وەك خاڵی ڕەشی لێوی، گەشەی ئەو بەدەنەی بە!!.

(٤)

ئەمساڵ بەناوی یاری، ساڵێکی توندو سەختە
بەفری خەفەت دەباری، دڵیش دەبوونە شەختە
پیرۆزگاری پێرور، تەرازووی دادی کێشا
ڕۆژیش لە ڕووی گەلاوێژ، هەڵاتو ڕاوە بەختە
بێدرخە چوو بە تاڵان، میرەم گەڕا لە ماڵان
تۆغەن کە دای لە باڵان، چاو دەرقوولێنێ وەختە
بێت، ڕەنگە ئیشی پێت بێ، گەر تۆزی شوێنو ڕێت بێ
وا مەگرە گێژو شێت بێ، بشلەرزێ ئەختە ئەختە
پاڵوزی خانە شێواو، لەبەر چۆڕاوگەیی چاو
ئەلیاسو خدری دەنگداو، بێ سەبرە حەز بە جەختە
دڵم چلەی بە سەرکەش، قۆناغی کردە سێ شەش
پشکۆی وەتاغی کرد گەش، خەریکی ڕەختو تەختە
لەمباز بەرانی نازە، نەورۆزی کوردی سازە
ئەگرێ هەموو موغازە، بە بێ هەراوو زەختە
دوژمن لە تۆی ڕووانی، کە چەند گەشو جوانی
بێ وەی بە خۆت بزانی، خەساندی بووی بە یەختە

ئینجا بەهارو هاوین، زستانو پایزت چین؟
بارت ئەکەن دەمی زین، بێ باسە، ئیشی ڕەختە
نرخو فەسالی مامڵەت، بازاڕی خستە دەرفەت
بێ قەرتو، سوودو، ئافەت، کوتالی پوختو نەختە
بەسەرچوو ساردو سوڵە، (پشکۆ)تە هاتە تۆڵە
نەماوە کەس لە بۆڵە، سۆزو گەشەی درەختە.

(٥)

ئەی وەتەن، داخی گرانم، ڕوتبەیی سەر شانتە
قرچەیی جەرگو هەناوم، فرچەیی چاوانتە
خرمەیی ناو زگمە دێ، بۆ تۆ لە خرپەو بیرەخەو
گرمەوو لرمەی دڵە، خۆراکی گولزارانتە
ئەم کەنیشکانو کوڕانەت، هەر هەزارو یێکەن
چەند زەمانێکە هەناسەو ئاهی وان ئاسمانتە
ئێستە بێگانە هەموویان، نۆتەبازو مۆسیقین
کانی مۆسیقا بزانە، لاوکو حەیرانتە
باوو بارانی هەناسەی سەردی ئێمە، تۆز ئەکا
جۆشە زستانی گەلاوێژم، سەری میزانتە
گشتی بۆ خەڵکە ئەوەی چاندووتە، وا خەرمانتە
بۆ خەزێنەو پارەکانت، دەستی وان گیرفانتە
ئەی وەتەن تاکەی لە کاری نالەباری ئامراد
بێوەژن کۆشی بکە، قازانجی زاڕۆڵانتە
کێوەکانت بورجی نەورۆزو، ڕەزو باخت بەهەشت
لاوی ئێرو مێ بە هەرلا، حۆری بۆ غیلمانتە

ئـەی وەتـەن، گـەر تـۆ هـەژارنامۆژی بـازاڕی شـەوی
ڕۆژی دوژمــن نێخـــەگیری گەردوشـــی دامانتـــە
ئـەی وەتـەن تاکـەی کـزو ئـاڵۆزی دەسـتی هـۆزی تـۆ
ناکـــەس و کـــەس، ڕیزەخـــۆری ســـفرەو دیوانتـــە
ئەی وەتەن سا کۆڕیەکەت، (ژیکۆ)، بەخێویکە بە خۆت
هـــەڵبلێ تـــا پێـــدەگا، ئـــەو هەڵـــگری نازانتـــە.

(٦)

دڵ لـــەناو پـــەردەی خـــەیالاّتا، خـــەریکی فرســـەتە
هـەروەکو مـەغزی گوڵەنـداماں، چ نـازك هیممەتـە!
تـا لـە سەرچـاوەی دڵ و جـانم نەنیشـێ تـۆزی غـەم
کەی بە چـاوی خـۆم دەبینـم، ئـەم سـەفاو سـەفوەتە؟!
دیـدە هەڵنایـە لەبـەر بـەرق و بریقـەی ڕوویـی تـۆ
ڕوو لەهـەر لایـێ دەکـەم، پـەردەی حـەیاو عیـــصمەتە
خستەخانەی عیشقی تۆ، ژەهـری بـە دڵ وەرکـردووە
وەك شریقەی زوڵـف و موژگانـت، خـەریکی سیحمەتە
سـینە پـڕ تـاب و تـەب و سـۆزو بڵێسـەو گریەیـە
هـەروەکو چـاوت کـە غـەمزەو نـازو مەسـتیی عادەتـە
نیعمـەتی دنیـاو قیامـەت، وا لـە چـاوت زاهـیرە
زینـەتی دنیـاو دینیـشم لـە هـەردوو کوڵمەتـە
خەنـدەوو گرژینـەوەت، شـەوقی بـە عالـەم گرتـووە
زوڵفـی تاتاشـت خـەریکی بـاری زەخـم و کولفەتـە
مەسـتی بـەنگ و، عـارەقی نـازو، گریـشمەو لەنجەکەت
تـاوەکو ڕۆژی بـەقا، نوسـتووی هـەوایی دەرگەتـە

(ڕاجیــا)! دێوانــەیی دانــێ لــە عیــشقی دڵبــەران
کێ نەسووتێنێ بە گوڕجی ڕۆحی خۆی، بێ غیرەتە!!.

(٧)

تــا لەبــەر یــاری عــەزیزم دڵ حــەزینم، ڕەحمەتــە
هــەم بــە زوڵــفو پەرچــەمی، دەردو بــرینم ڕەحمەتــە
دێمــە قــاپی دڵبــەری ڕەنگــینو شــۆخو ســەروەرم
چــونکە وەســڵی ئــەو لــە جیــسمو ڕۆحو ژینم ڕەحمەتە
ســەد کــە غــەمبارم لــە تــاوی پەرچــەمو ئەگریجەکــەی
جــەورو بــێ ڕەحمیــشی بــۆ ئیمــانو دیــنم ڕەحمەتــە
ڕۆژی ڕووت هەڵهاتــە چــاوم، پێــی بڵــێ ئــاوا نــەبێ
چــون بڵێــسەو تیــشکو تــاوی، بــۆ گەشــینم ڕەحمەتــە
ســۆزی عیــشقت کەوتــە دڵ، ڕۆحو دەمــاغم هاتــە گێــژ
خێــرو خۆشــم، هــۆشو نۆشــم، لوتــفو قیــنم، ڕەحمەتــە
تــۆ شەهەنــشاهی زەمــانی، مــن هــەژارو بێکەســم
چــاوەنۆڕیی مــن لــە دەرگــایی مــەتینم، ڕەحمەتــە
گــەر لــە تاقــەتما نــەبێ بتگرمــە بــاوەش، ڕۆحەکــەم
ئــەو دەمو لێــوە بــە خوێنیــشی ببیــنم، ڕەحمەتــە
کــارو پیــشەت، گەرچــی جــەورو قــەهرو فــەوتانی منــە
ژەهــری بــێ ڕەحمیــت لەســەر چــاوی گــرینم، ڕەحمەتــە
(ڕاجیا)! هەرچی بەسەر من دێ، لە دەستی عیشقی یــار
هــەروەکو ماچــی لــەبو کوڵمــو جــەبینم، ڕەحمەتــە.

(٨)

خاڵــت لــە دڵــی ئێمــە، دەڵێــی ســەلکەبزووتە
چــاوم لــە ســەرەی فینکــی دەمو، بــادەیی زووتــە

ماچـت بەسـەرو گیـانو دڵـە، نـرخو فرۆتـە
بـازاڕی سـەرو کولمەتـە، هێنـدە بـە بڕووتـە
دڵ بەستەیی ئەگریجەو، گەستەی سەری مووتە
جان خەستەیی سینەو مەمە، یا مەستی هەمووتە؟
ئەبرۆتـە لەسـەر تـاقی عـەرەق، تاقـەو جووتـە
گرتوویـە سـەرت ڕیـزە گـوڵو تاقـەو جووتـە
ئـەم ئـاگری خـەرمانی تـەنی ئێمـە، لـە ڕووتـە
سـووتانی منـی ڕووتـە، بـە بـێ قەیـدو شـرووتە
هیـوای دڵـی بێـچارە، بـە ماچـی یـەکو دووتـە
هـەر لایـێ ئەچـی، وەك توڵـە ئامـادە لـە دووتـە
(پشکۆ)، سەری زوڵفی قەبەسو دەستەیی شووتە
ئەو ساتە کە گەش دەبییەوە، تۆ کاری پشووتە.

(٩)

بـەم دەردی دڵـە، قامـەتی داوم لـە هەتیتـە
زوڵفـی لـە بـرین برژەیـی، دەرمـانو پلیتـە
وەختـی ئـەدەبو زەوق، شـەرابی لـە دوو چـاوە
وەختـی شـەڕو داوا، دەسو بـازوویی جلیتـە
وەك شـیعەیی عاشـوورە، تـەنم هێنـدە کوتـاوە
هێنـدێکی بـرین، ئیکـە ڕەشو، ڕەنگـی چـویتە
ئـەمزووتووە دڵ، لـەو دەمـەوە لاملـی گرتـووی
مـاڵ مـاڵی منالآنەیـە، بـەردی بنـە پیتـە
تـا بـانگم ئـەکا مـەرگو، ژمـارەی گەلـە ئـەکرێ
چـاوم لـە دوای ڕوومەتەکـەی سـوورو سـپیتە

ئەم کوردە وەکو من، کە شەپرزەی مەی و بەزمە
هۆزێکە، لە ژێر مەرحەمەتی بەرزو نەویتە
گوارەت وەکو مێلاقە، ترنجت مەمە، لێو مەی
ئەم تك تکەیی ئارەقی سەر سینە، جەویتە
بڕوانە قەدی، هەڵچووە وەك عەرعەرو شمشاد
ئەو جووتە مەمەی سەیرکە، قنج و خڕو قیتە
(ڕاجی)! بە خودا چەندی ئەڕێژم لە دڵم خوێن
ئەمن کەوتەیی باری خەمە، چاوم پڕە لیتە!!.

(١٠)

## نەورۆزی ساڵی ١٩٦١

جەژنی دڵە، جەژنی گوڵە، نەورۆزە، بەهارە
جەژنی نەتەوەی کوردە، چ لادێو چ شارە
دەرچوونە لە دەس جەورو هەواو، بەستن و سەرما
چی خاکە، چ ئینسانە، چ گیاوگوڵە چ دارە
ئەم ڕۆژە، سەری سێسەدو شەست ڕۆژە لە ژینا
ڕۆژی هونەرو بیرە، بەشی ڕاوو شکارە
گەر نورحە، ئەگەر هوودە، ئەگەر کاوەیە، تێکڕا
لەم ڕۆژە گەیشتوون بە ژیان، هەرچی لەبارە
ئەم عەردە کە هی تۆیە، دەبێ کێڵە بە گورجی
بیژێنەوە چی مردەڵەو ڕووت و هەژارە
بیکوڵێنەوە، دایڕێژە، ئەوی ڕێژەوی کانە
پێی لادە لە خۆت، چی دژە، دوژمن بە هەوارە
ڕازاوە ئەوەی مێرگ و کەژە، تێرکە تەماشا
پڕشنگی، هەموو ڕەنگی گوڵ و باخ و چنارە

بووکێکــــه لـــه نـــاو باوەشـــی زاوایـــی ژیانـــدا
شـــایی لــه هــەموو گۆشــەیی ســـاراوە دیـــارە
هــەر پنجــە گــوڵو دارە، کــه جــێگیرە لــه ڕیـــزا
دوو ڕوو نییـــه، لــەم یەکیەتییــــه پاڵــەیی کـــارە
چـــاوت نـــەفرێ، مژدەیـــه بــۆ هــۆزی قەڵەنــدەر
گــەر نــاگری ئەمــساڵو، ئەگــەر ســووزەیی پـــارە
بێگانــه! ئــەتۆ چـــاکی بزانــه کــه گــەلی کـــورد
نـــامرێ، کــه لەشــی گــشتی لــه پــۆڵاوو دەمـــارە
مێژووی سەرەتای ئاریو هیندۆسه، له پێش خەڵك
پێـــشەو هونـــەری ڕاســـته، بـــه میلیـــارو قـــەتارە
نەتبیـــستووە، چـەرخو فەلـەكو ســیحری مەجەســکار؟
پـــیلانو تەلیـــسماتی حیکایـــەت، بـــه هـــەزارە
نیـــساپاتی ئـــەکا عیلمـــی ئەســـەر، کردەوەیـــی کـــورد
وەك (سێر کـساندەر)کـه ئـەڵێ، بیکـه بـه گـوارە
زینـدووبـەوە، نـەورۆزە، لـه ڕەگ شـین بـەوە ئـەمجا
گــوێ بگـــرە، مەدۆزێنـــه بەشـــت، بـــەخت لـــەکارە
چـــاوێك بخـــشێنه تـــۆ بـــه خـــاكو دەرو دەشـــتا
چەشـــنی وەتـــەنی تـــۆ، لـــه چ لایێکـــی دیـــارە؟
پاشـــی تەمـــەڵیو کـــەوتنو، دامـــانو هـــەژاری
نـــــۆرەی تەمـــەنو یەکیـــەتییو گشـــتوگوزارە

مەفرۆشە شەڕو، وەرگرە هەق، هاتووە کاتت
خاوێنی کەوە چاندەمەنیت، تۆخی بژارە.[1]

(١١)

ئەو لالە درەخشانە، ئەڵێی ڕۆژی بەهارە
وا دێتو دەچێ، ئوفقی دڵی گرتە کەنارە
ئەو گوڵشەنە ڕەنگینە، لە دەم بادی سەبادا
یا شەوکەتی ئەو، هەر لە لەبی خونچەیی پارە؟!
زوڵفو خەتو خاڵی، حەرەسی گەنجی جەماڵن
گەنجێکە بەکەس نایەتە نووسینو ژمارە
چاوی بە هەوای غەمزە، دەکا غارەتی جانان
چاوی چ؟ مەگەر هەڵمەتی شابازی شکارە
ئەی لێو شەکەرەی جیلوەگەرە، مەرحەمەتێ کە
یان لوتفی تۆ لەم خەستەیی دەرگانە خەسارە؟!
واعیز! تۆ مەدە پەندی ئەدیبانو لەبیبان
وا تێمەگە ئەم دەرسی پرووکانە قومارە
ئەم سێبەرە مەخرووتە لەناو جیسمی نەخۆشم
ئایا دڵە، یا سایەکەشی پەرچەمی یارە؟!
زانیومە، سوپەر نایەتە بەر تیغی جەفای تۆ
سا بیبە ئەگەر ڕووحە، وەگەر سەبرو قەرارە
(ڕاجی)! بە هەبا ماوی لەناو داوی ڕجادا
تۆ ڕووتو ڕەجاڵێکی، ئەویش خوسرەوی شارە.

١- ئەم هۆنراوەیە ماوەیەتی، بە هۆی تەڕبوونی دیوانەکەوە ڕەشبۆتەوە، بۆمان نەخوێندرایەوە.

(١٢)

ئەو خونچە دەمەی، مەم کەلەمەی، کوڵمە بەهارە
ئەو سیمی تەنەی، دەست بەخەنەی، لالە عوزارە
ئەو موشك مووەی گوڵ ڕووە، ئەو پێچووە غەزالە
کوشتوومی لەعەرلاوە، بەسەد بەندو قەنارە
ئەو باخە یەخەی، هالە ڕوخەی، تازە نیهالە
خستوومییە سەر ئاگری ئەم سەبرو قەرارە
بەم غەمزەیی چاوانە، وەکو سومبولی گێسووی
بەستوویە دڵی غەمزەدە، بەو قەددە چنارە
بای وەعدە هەناسەم، کە بپشکوێ لەبی خەندەی
بۆ باخی ئەوە، گریەمە ئەو حەوزو کوفارە
ئەمشەو چ دەکا هەوری غەمو ڕێژەنی گریەم؟!
وەك بورجی دەلوو ماسییە، ئەم بلّق و بوخارە
جانا! بەخوا سوێندت ئەدەم، بۆچی هەموو دەم
(ڕاجی) لەدەری وەسڵی تۆ، پەرپووت و هەژارە؟[1]

(١٣)

مەسئەلەی عیشقی حەبیبەم، گەر بە ملیۆن دەفتەرە
ناگەیە باسی ڕیسالەم، یەك بە یەك پێدا وەرە

١ جێی سەرنجە ئەم غەزەلە کە مامۆستا ئەحمەد دڵزاری شاعیر کردوویەتی بە پێنج خشتەکی، لە دیوانە دەستنووسەکەی ڕاجی دا نییە، لە (دیوانی دڵزار)ەوە وەرمان گرتووە. دیوانی دڵزار، ئامادەکردنی: دڵزار، پێداچوونەوەی، ئازاد دڵزار، چاپی دووەم، بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی ڕۆشنبیری هەولێر، ساڵی ٢٠٠٦، لا ١٨٤.

خەم لە دەرگانەی دڵمدا، پاسەوانە ڕۆژو شەو
کۆمەڵی بەزمو خەیاڵو شاسواری دڵبەرە
دەم لە شێوەی بادە تەڕناکەم، لە کۆگەی دووریا
تەشکی خوێنینم لە ڕوودا، جۆیەباری کەوسەرە
وا لە دەوری دڵ ئەسووڕێم، هەروەکو سەوداگەران
ناڵەیی هەمدەم لە دڵما، چونکە عەینی میحوەرە
بۆچ ئەناڵم ڕۆژو شەو، نەماوە ئارامو قەرار؟
دڵ ئەسیری بەندوباوی ساحیری ئەسکەندەرە
گەر ئەزانی چاوەکەم، ڕۆحم بە لای کێدا چووە؟
وا هەڵاوسراوی بوتخانەو مەقامی ئازەرە
کووچە کووچە، هەروەکو دێوانە تۆ خۆت بەد مەکە
هاتوچۆی یارانی ئێستا، (ڕاجیا)! دەردی سەرە.

(١٤)

دیسان لەدووای قامەتو ڕەفتاری عەزیزە
پامالمو سەودازەدە، بێ پوولو پەشیزە
بۆ چۆڵی ئەڕۆم، غەم سەری خۆشیم ئەشکێنێ
بۆ شار ئەچم، ئەگەنە بەر بەردو ستیزە
هەرچەندە شوێنێ نییە بیکەم بە نشیمەن
سەرڕای هەموو ئەم حاڵە، نیگارم دزۆ زیزە
پێچراوە لە پەرچەم، دڵەکەی بەو ڕووە برژاو
نیمڕۆکە حەزت چۆتە کەبابو تەرەتیزە
باڵای کە ئەڵێی قاڵبە، نوورێکە لە یەزدان
شایانە هەموو حووروو پەری ببنە کەنیزە

بــۆ بــەزمی مــەی و بــادەوو گۆرینــدەوو بلــوێر
وەك هەڵقــەیی نــاو کابەیــە، گرتوومــە زریــزە
سەر بۆچییە، گەر دانـەنرێ بۆ گـوڵی کوڵـمەت؟
نــاڕۆم لــە دەرت، تــا نــەکرێم ڕیــزە بــە ڕیــزە
گرتوویـە قـەدت، سـەد دڵ و سـەد جۆرە گـوڵ و بـەر
ســێو دوڕو یــاقووت و، گــوڵی بــاغ و گــەزیزە
(ڕاجــی)! تــۆ بڵــێ تەمبــەڵی هــۆزە، کــەرەدێزە
نەرمیکــە ســەری چــەوتی، بەقەمــچی و بــە نــەقیزە.

(١٥)

ئەچــم میــوانی دڵبــەر بم، ئــەڵێن ســەردارو قۆناغــە
کە بــاغی ڕوومــەتی هــەردەم، لــە چاوەی چــاوی مــا زاغــە
غەزالــەی خاڵەکــەی کوڵمــەی، چ گــەنجوورێکی ڕەنگینــە
پیاڵــەی لێوەکــەی ئــاڵی، چ پــەرداغێکی پەرداغــە
لەبــەر قــاپی ئــەناڵێ دڵ، لــە لــەب لــوتفێکی بــۆ ناکــا
خــودا! یــا بیــدە یــا بیبــە، کــە ناســاغێکی پــڕ داغــە
بە گوڵزاری ویــساڵی ئــەو، هــەموو زاغ و ڕەغــەن خۆش بــوون
لەبــەزمی عەنــدەلیبی مــن، عەجــەب ئــەو باغــە یاســاغە!!
ئــەزانی بــۆ تــەپیوم، بــۆ ڕزیــوم، بۆچــی ســووتاوم؟
لــە لای یــاری جیهــانگیرە، دڵــم شــەش ســاڵە قاچــاغە
چ غەددارێکــە؟ هــاواری، ڕەقیــب خــستۆتە نــاو دنیــا
تــۆ پێــی بــاوەڕ مەکــە گیانــا، قورمــساغێکی ناســاغە
لــە دیــوانی کــەماڵت دا، ئەگــەر دڵ بــازە، بــێ نــازە
لــە بــازاڕی جــەماڵت دا، ئەگــەر ســەر ســاغە، ئاپاغــە

ڕوخت بۆ ڕووحی پڕ زیکرم، چ فیردەوسێکی فەرِ دەوسە
قەدت بۆ لەشکری فیکرم، چ بەیداغێکی بەیداغە
ئەوەی زولفت نواندوویە، مەگەر هەر خوێنی (ڕاجی) بێ
بەڵێ یەك ڕەنگی مەعنایە، ئەوەك سەد ڕەنگی بۆیاغە!!.

(١٦)

لە کوردیدا هەموو گیانم، بەکوردی، خاسە خۆراکە
لە مەیدانا کە کوردێکی تیابوو، سەربەخۆ ڕاکە
سەراوردی زەمانو گۆڕە، گۆڕی کارەساتی کار
گوڵو گەرِ، وەك شەلو کوێری، هەموو ئازاوو چالاکە
شەپۆلی بای خەفەت بەحری موحیتی سەربەسەر واژاند
زەمین وەك کانی ئەسماكو سەما، وەك عەینی خاشاکە
جیهانی هانە هانای دڵ بە هیچکس ڕانەگا، چبووە؟
درۆ بارانە، پیلانبازییە، کوێربوونی ئیدراکە
سەراپەردەو تەلارو کاخ، سەرەوبن بوونو تێکڕووخان
قورت دەستاکەوێ، خێرا، تەمی دونیا بەسەرداکە
لە چاخی زەوڕەوو تۆکسیدە، بێ سەر کەرِ ئەبن یەکسەر
چ ببیەی، چی ببینی، چی خەیاڵ کەی، ماکی ئیهلاکە
لە خاوەن خانو خانانا، کە دەستاو دەستی خەرمانە
لە بابەت ڕاوەڕاوی خاکە، ئیستیملاكو ئەملاکە
ئەڵێن ئەم چەرخو ئەفلاکە، قەدیم وتراوە (لولاكَ)
کە ئەم تۆپیوە، کرمێیە، دە ڕووت لەو لاکە، لەولا کە!!
هەموو هاوینو زستانی بەسەرچوو، هێشتە نەمزانی
چ خۆشە، چی نەخۆشە، بەختو تەختی لێ بەرەڵلاکە

عەداڵەت وەك تەرازوو ناسراوە، سەر بەرامبەر سەر
بەهەشت هەشتە، جەهەندەم حەوتە، گاور زۆرو کەم پاکە
چ سەرسامم کە بنیادەم، هەموو تیتاڵ و فیشاڵە
ئەوی کردت بە مێشکی تێگەیشتن، پۆخی لوولاکە
لە گوشتەو بڕیە دەرناچی، بە خاکا چی و بە ئاوا چی
کە خۆ دەرخستن و مان بەستنت، بۆ مەرگ و پێتاکە
برا لێکبوونە دوژمن، من، ئەما جێگەم کون و قوژبن
بە ناهەق بردیان ڕەنجم، چ سیواکە، چ تەنباکە
لە موڵکی شاکە شاکی غەم، لکی خەڵکی تەماشاکە
چلۆن ژاکاوە، میوەی هەڵوەریوە دارە ساواکە!!
چ ڕزگاری بکا ئەم هۆزە داماوە، لە دامانی
کە (ژێکاف) پڕ بە دونیا، دڵ بەبارو، گیانی خەمناکە.

(١٧)

بەس دەربەدەری هۆزو، ئەمی خەم بە سەرم کە
بەس تیغی مەوژە، جۆشی وەلاتان لەبەرم کە
چیتر بە هەوەس مەمەدەرە بەر خەنجەری دوژمن
هەر خۆت و خوا، لەم دەرە لەتلەت جگەرم کە
مەستمکە لە چاوی وەتەن و، بخەرە زیندان
زنجیرو گرفتاری کەرەستەی قەدەرم کە
چێشتوومە هەموو تامی دڵ و، زاری غەریبی
لەم خاکە، بەسە بکوژە، بەس دەربەدەرم کە
دەست هەڵگرە، هەڵبێنە تۆ ئەم چاوە، ببینە
خەڵکی لە چ بارێکە؟ ئیتر خۆش خەبەرم کە

عالــەم لــە چ ڕاوتــژو، چ ڕاوتــکو چ ڕازتــک؟
یــا دڵ بــە دڵــم دادە، وەیــا ســەر بەســەرم کــە
وا گــوڵ نەگەشــن، پێنەکــەنن خونــچەیی لێــوان
تــۆش ڕاهــەژە ســا مەســتی پیاڵــەی ســەحەرم کــە
ســەر داوەمــە بــەر پێــتو، لەشــم پــردە لــە ڕێتــا
بــەو تــۆزو تــەمی دامەنەکــەت، بــەهرەوەرم کــە
باســی ســەرو زولفــت کــە دەکــەم، ڕۆژی بەڵامــە
ســاتێ بــە دەمو کوڵمــەو مــەم، جیلوەگــەرم کــە
ئامادەیــە (ژیکــۆ)، بەهــەمەو ســوودو زیانێــک
ســا هەســتە لــە دوو چاوی بەڵــەک، چارەســەرم کــە.

(١٨)

نامــە! بــۆ جــەرگت بریــوەو هەڵگوشــیوم، نامەکــە؟
نامــە! بــۆ گیــانو دڵو بــیرت دزیــوم، نامەکــە؟
پــێم بڵــێ ســا کــەی بــچێژم تــامو بۆنــە خۆشــەکەت؟
کــەی ئەنیــشێ پــێم بڵــێ، هۆشــی فریــوم، نامەکــە؟
چــاوە تیرەندازەکــەت، وا بۆتــە موقناتیــسی ڕۆح
کاربــات خــستۆتە جــەرگی ڕاهــەژیوم، نامەکــە
لــوولی زولفــت خــستە مــل زەوقــی خــەیاڵو بــیری مــن
وا وەکــو میــوەی بــڵو پێکداتــەپیوم، نامەکــە
ڕەنگــی ئــاڵی ڕوومــەتت، تێکــەڵ برووســکەو تاریــە
ڕیوەڵــەو، ڕوو زەردو، لێوقرچــاو، هــەتیوم، نامەکــە
تــو خــودا، بۆچــی لــە باســی ماچــەکانت نــادوێی؟
سۆزی ڕووت پەردەی حەیاو شەرمی دڕیوم، نامەکە

سەر، بەگێژی ماتەمو سەوداتە وا ئەخولێتەوە
وەك ڕەوەز، بورکان زەدەی ڕووتم، خزیوم، نامەکە
زولفی ڕەشمارت کە گەستی لامەلی وەك زەردە بێت
من بە ژەهرو زامی گەستەی دارزیوم، نامەکە
تێر نەبووم لەو باوەشو بۆنەت، چریکاندی وەلات
شێتو هار بووم، تازە نیتر تێپەڕیوم، نامەکە
وردە خاڵت کردە تەمغەی مەرگو بێ هۆشیمو دڵ
تۆ بە مۆری شا سەرو ماڵت کڕیوم، نامەکە
کوشتەی ئەو سوورە بەندە، ئەو گوڵەی ناسك بەدەن
ڕەحمی پێم دادێ هەموو دیوو نەدیوم، نامەکە
سیسو لاوازی خەمی ڕووتم، جەفاخوردەی زەمان
وەك گوڵی باخت لە داخت هەڵوەریم، نامەکە
هەروەکو (ژیکۆ) بەرامبەر وردە زولفو، خاڵو خەت
بۆ هەموو دەردو بەلای عیشقت چەقیوم، نامەکە!!.

(١٩)

شاعیر کە ئەهۆنن پەند، هەر ئێکە مەبەستێکە
دونیا لەبەرابەر هەق، هەروەك لەپە دەستێکە
یاریکە بە هێزی یار، یاریدەیی کۆمەڵ دە
یا ڕاکە لەڕووی دیدار، بڕوا بە هەرەستێکە
هەر جەوهەری ئاتۆمێك، بازاڕو بزووتێکە
هەر کاری گەلو هۆزێك، گێژدە بە قەستێکە
هۆشی بەشەرو زانین، بیزانە چ هۆشێکە!
دەستی هونەرو توانین، بیناسە چ دەستێکە!
دیدە ئەوی بیبینی، ڕامە لە پەلاماری
هەر بۆیە هەموو گیانێك، سەرمەستی ئەلەستێکە

هەر کەس بیەوێ چاوی هۆش‌و دڵی خۆی گەشکا
بێژە وەرە جامی ژین، پڕ بیری هەوەستێکە
ئەو کاتە لە بیرم چوو، بیرەم بە عەرەقدا ڕشت
ئێستا کە کراس پیسم، ڕووتیم لەمە قەستێکە
هەڵنایەم‌و هەڵبێنم، سەد جووجەڵە غەمباری
بەرم لە کون‌و کۆڵێت، ماوەم چڵ‌و شەستێکە
سەرکردەیی ڕۆژی بوون، گێڕای سەری پڕ کاری
پەرگاری نەوەستاوە، گێژیم لە چ هەستێکە؟
سەوداسەری زەردوویم، هەروەك شەکە گێژی ماڵ
هەرچی کە سەرم ببڕێ، هەر بۆ کوتە گەستێکە
هەر کەس بیەوێ بژیا، پیاوانە لەهەر خاکێک
دامێنی خوا بگرێ، چی ساغە چی خەستێکە
لەم کۆمەڵە ئینسانە، خاوەندی دەماغی بۆش
گەرچی بەشەرە ناوی، عەینی قورەپەستێکە
هۆنیم کەژۆر ناوریشمی بیرو لەسەری تۆم بەست
ئەم خانووە ڕامبەستووە، هەر بەردی لە بەستێکە
هۆ کاکی گەلی کوردم، مەعرە بە منداڵی تۆ
هەر باوەت‌و باپیرێك، مێشکوژ لە چ ڕەستێکە؟
مێژوو نییە گوفتارم، هەر دەسك‌و پەرێزێکە
ڕێژە کە بنێژم من، سەد میوە لە ڕستێکە
ئەم دایکە ئەخۆشەی خاك، ئێمڕۆکە ئەزۆکێکە
ئەم کارە چرووکانەت، (ژیکۆ) چ کەرەستێکە؟!.

(٢٠)

ساقی! قەدەحت وەك دەمەكەت دلكەش‌و تەنگە
مەیلت وەكو زولفی سیەهت مائیل‌و لەنگە
لەو كولمەیی پڕ نوورە، بە خاڵ‌و خەت‌و پەرچەم
ئیمڕۆ تەمەنی لوتفە، تەماشایی فەڕەنگە
تا پەنجەیی زیوینی تۆ ڕەنگینە بە خوێنم
بۆ نەخشی سەرو زولف، چ هیوایی بە ڕەنگە
دەردت لە دڵم، زەهری هەلاو زەخمی سینانە
عیشقت لەسەرم، شۆڕشی تیمساح‌و نەهەنگە
ماچی دەمەكەت، بۆ قەدەغەت كردووە ئێستا؟
خۆ ماچی دەمت وەك مەسەلەی سائیرە، دەنگە
هەر ئێشی هەیە خاڵی ڕووان، بۆ منی بێزار
هەنگوینی نییە، هەر بە خەتا ناوی بە هەنگە
ئاسراوی هەموو عالەمە، ئەو یاری بەڵەك چاو
وا ئەرم‌و تەڕو ناسك‌و چالاك‌و چەلەنگە
بەو بەندەقەیی زولفەو‌و خاڵی خەتەراوی
گوێم هەردوو پڕی گوللەیی بێدەنگی تفەنگە
بۆ ڕەسمی وەفادارییە، دێ یاری گوڵەندام
خێرابە وەرە حازرە مەی، (ڕاجی)! درەنگە.

(٢١)

ڕێگەیی عیشقم درێژو، هەردوو قاچیشم شەلە
بۆ خەبەر وەرگرتنیش، ڕێ، بێ تەلیفۆن‌و تەلە
هێند ئەڕێژم ئەشكی پڕ سۆزو بەكوڵ، لەم چۆڵەدا
بۆتە دەریا دەورەم‌و ناخاتە وشكی، پێ مەلە

ناگمــه بــالای نیگــارو، بــاوەش‌و بـۆس‌و کــەنار
گـەر بەخـەونیش بێتـە بەرچـاوی خـەیالم، هـەر حەلـە
نازەنینـەی سـەرکەشـەی بێباکـە، بـێ خـوێن کوشتمی
هـەر بـە چـاو نیـشم نـەبینێ، هێنـدە عـەییارو دەلـە
کاتــەکی دێ، دامــەنی هــەلکات‌و زینــدووم کاتــەوە
پێی بگەم، دەستی لە مل کەم، نیــتە هیچ ناکەم پەلـە
نرخــی ژیــن‌و دیمەنــە، دلــداری پاشــاوو گــەدا
بــیری پــاراوی دلــە، هیــوای ســەروکاری گەلــە
وەختێ ڕاوی دابەشـی، خۆی تێکـەلی سەد لەنجە کـرد
چــاوەکەی بــازو هەلۆیــە، عاشــقی بێکــەس مەلــە
لاکــەلی زولفــی، تراقــەی خــالی وا هــات‌و تەقانـد
ئەیکوژێ هـەر کـەس لـە دەشـت‌و ڕێنگـەور چۆم‌و کەلـە
چـاوی (ڕاجـی) بـوو بـە چـوارو، چـاوی بیمـاری نـەدیت
بابزانین چەرخی چـەپ، هـەولی بـە کێیـە ئـەم هەلـە؟!!.

(٢٢)

هـۆ(کـا حەســەن) شـەوقم بـزووت، بـە قاقـەزی تـۆ ئـەم هەلـە
ســولتانە زاوە تــۆی غەلــەت، ڕاکێــشە بــانگ‌و هەلهەلــە
بوختانــە تووشــی تــۆ بــووە، بێبــەش بــە گـژ مــەلا چــووە
وا خانــــەمی پــــڕ کــــردووە، لــــە لۆدەکــــاوو مەزبەلــــە
دەســتت لـە گیرفـان بێنـەدەر، تـامی نـەما سـەبرو سـەفەر
کـوڕی ســولتانە بـوو بـە کـەر، لـە پێـشی دانـێ خەرتەلـە
ســەراوو نافــەکی دڕی، ســەری هــات‌و لــە بــەر پــڕی
جاشـک بـە بێچووە سـەگ وەڕی، لـە چـۆکی داکـی کـەن جەلـە

(حەسەن، حەسەن) هەسان مەسوو، جاسوسە لێت کچ و خەسوو
پێچ و پەناوو لاپەسوو، هەرچی گەیشتێ هەر حەلە
نایێتەدەر کچی قەرەج، بۆی بانگ ئەدەم، (فَرَجٌ فَرَج)
میتکەی لەرێی بێ بە حەج، ئیحرام ببەستێ بەچکەلە
بەزم و هەراوو هەلهەلە، بە سازو بازو سەوزەڵە
بە چووزەکی و بە زەلزەلە، بە چەنگ و تارو تووزەلە
بڵێنە سەر مامانەکەی، وریا بێ جاشکدانەکەی
ئەدرێ لەگەڵ نقدانەکەی، پێیدا پەڵوولە، زوو لەلە
خانم دەزێ فیدای ئەمە، بە دەشت و هەردو وەردەوە
بە هەولێرو بە پردەوە، هەتا دەگاتە بەرتەلە
سوڵتانە، وتیان ئاوسە، هەلاوەساوی چوار دەسە
دەڕی وەك مەشکە گاوسە، لە دۆو کەرە مەکەن پەلە
ئێستە شەوارەی ناغەیە، بۆ دان ئەڵێی بناغەیە
لەبەر ئەو دەردو داغەیە، سوڵتان کۆمی بە گێچەڵە!!.

(٢٣)

دونیا بە هەموو شێوە، ئەگەر شیرن و تاڵە
چاوی لە نموونەی دەم و لێو و خەت و خاڵە
وەك من، بە ئەدەب نایەتە سەر ئەمونی تەماشا
کەلکیتی مەوژەی نێزەوو، کاکۆڵی مەتاڵە
گۆگردی نیگای، شوورەیی گیانم ئەگرێنێ
من دێم و بە کوشتن چم و، ئەو شۆخە لە ماڵە
کوردە لە سولەیمانییو، کۆیەی بە هەوا خەت
داوێنکە تکای ماچیی و، سەد سێلکی لە پاڵە

بەو خاڵو خەتو گەوهەرە، سەرپاڤو عەتارە
بەو شیرینیو مێشاوییە، قەصصابو بەقاڵە
ئەستێرەوو ڕۆژیش، وەکو ڕووی کونجرو پۆشن
بنیادەمی بێ ناوەڵە، وەك سەوزەیی کاڵە
سایەی لەسەرم بۆتە حەساری دڵی زارم
شەوقی لەدڵم، وەك لە شەوا ڕۆستەمی زاڵە
ئەمجارە ئەگەر بێمەوە کەعبەی شەرەفی کورد
ئەو سوورە گوڵە، مامڵەتی بێ نرخو فسالە
(ڕاجی)، بە هەوای سینگو بەرو دۆشی مەلیحە
گۆیی دڵ و تۆپی مەمی کردۆتە گەلاڵە.

(٢٤)

بولبول لە شکۆفەی گوڵەکەت، جەژنی حەلالە
بۆ چەهچەهەوو خوێندنی، گوڵ گوێگرو لالە
مەشقی هەوەسو مەستییە، لەو چەنبەری زولفە
غەیری تەرەبو جیلوە، هەموو ئیشی بەتالە
ئەو وەختە گەیشتم، کە بەخزمەت گوڵو بولبول
زانیم دڵەکەی سەرکەشم، ئەو ساتە لە ماڵە
گیانم، بەخودا، هاتە هەواو بەزمی مەحەببەت
فەرمووی: بە لیقا خۆش بە، وەربگرە حەوالە
گەر سۆسەنو نەسرینە، ئەگەر نێرگسی شەهلا
یادی نەفەسی بادی سەباو، خۆشیی سالە
بۆنێکە لە ڕۆژانی وریسالی دڵو دلدار
گەر عەنبەری سارایە، وەگەر سونبولی کاڵە

چۆن نایەتە بەر شوعلەیی تەنواری هیدایەت؟
گەر حەزرەتی ئەسکەندەرو، گەر ڕۆستەمی زاڵە
جانا! لە فیراقت بە خودا تەنگە دڵی من
گەر شەککەرو هەنگوینە، لەناو زارمە تاڵە
(ڕاجی) لەهەمەو ڕێوە، مەگەر عوزری قبوڵە
بۆ تۆقەیی جەژنانە، خوا شاهیدی حاڵە!!.

(۲۵)

دڵ لە ڕێی ئەو شۆخەدا، وێنەی سەمەندو دوڵدوڵە
گەرچی ئەو شۆخە لەگەڵ نیمە، هەموو دەم دوو دڵە
چاو لەبەر لێشاوی فرمێسک‌و تنۆکی نارەقە
لێڵ‌و سوێرو کول بووە، بێ سوودە پونگ‌و قلقڵە
هێندە هەوڵمدا کە پێك شا بێن‌و، باوەش دەم لە تۆ
کۆریسنجاقم فرێدا، گەیمە خاکی (قوڵقوڵە)[1]
وەك قەلی باڵ‌و دەماخ‌و دڵ ڕەشە، ئیمڕۆ ڕەقیب
کلکی سەربالێك درێژە، وا دەزانێ هەر قوڵە
هێندە ناسك سینەیە، لامل زەرە، زێوین تەنە
وەك وەرەی لۆکەو حەریرە، ناسک‌و لووس‌و مڵە
وەختێ ئەمتۆقێنێ بەو تۆقەی سەرو ئەگریجەکەی
وەختێ من پەل پەل ئەکەن مێخەکبەن‌و ئەو پلپلە
چاوی سەرخۆشی تووە، گیانی نەخۆشی ئیمەیە
کولمەیی سوورو سپیتە، ڕووی منی زەردو بڵە

---

۱ قولقولە، یەکێکە لە گوندەکانی دەشتی کۆیە.

بوومە بەحری گریەوو زاری، دڵیش گۆزەی گڵە
ئەم شکا، ئەو هەڵچووە، بەشکم بڕسکێ ئەو گوڵە
گەر دووای مەرگیش، دراوسێ بین لە گۆڕستانەکان
بەینی گۆڕی هەردوولامان، ئەیسەم وێنەی وڵە
دڵ لە ڕێگای چاوەکانت، چەشنی دێوی سەرچڵە
هەروەکو ئەو ڕوومەتە لاسوورە، سێوی سەرچڵە
هەستە بیبینە قەدی شۆخی، بە سینەو مەمیەوە
(ڕاجیا)، هەر بیچنە، بیشکێنە مەغزو کاکڵە.

(٢٦)

ئەو ماچی دەمو لێوە، کە شیرینو بەتامە
نەمزانی، نە زانینە، نەمراوێژە، نە وامە
من، هەردەمە لەم چاوو دڵەم ئەشک دەڕێژم
ئامینە دوعای ڕۆژو شەوم، نامەمە، نامە
نارنجی مەمت، بۆتە مەزەی سۆزی دڕێژم
ئاهی دڵی سەرخۆشە، لەو سینە بەکامە
کوڵمەت گوڵی ئاواتی گەلەو، زینەتی ژینە
بالآت قەدەغەی ئەشکو غەمەو، تازە نەمامە
بیرت لە دڵو مێشکو دەماغم، کە چەقیوە
گیانێکە لە لەشداوو، شەرابێکە لە جامە
ئەی سوورە گوڵی ڕۆژی جوانی لە بەهارا
تاکەی دڵەکەم لەو گوڵی دیدارە نەکامە؟
ڕووت، قوروتی جگەر، باخەڵی ئاواتی ژیانە
بۆ پەروەرشی هۆزی بەشەر، کارو وەرامە

ئەی نەرمو شلەی ناسکو تەرزەی تەڕو پاراو
بەس بمکوژە بەم دەردەسەریو دوورە پەیامە
ئەی شاهیدی بازاڕی هەموو کوێرەوەری دڵ
بۆچ وایە بەشی ئێمە، هەموو زارییو زامە؟
ئەنجامی نەبوو، گریەو هاوارو هەناسەم
چۆن گەورە بە ئەجۆرە، لە ئازاری خوڵامە؟!
(ژیکۆ) بە هەوایێکی دەمی تۆیە، ئەپشکوێ
خەندەو هەوەست مایەیی ژین، پشتو پەنامە.

(٢٧)

نیشانەی بێ نیازیمو، فوغانی ڕۆژی مردنمە
هەوای نازو ڕەشبەختی، جەزایی چاکە کردنمە
لەبێدادی ئەوا پێشام، برشتم، چاوی دڵ کز بوو
لەڕێی ئاوەکوڵی بوونو نەبوون، هێنانو بردنمە
گوڵم کزبوو لە گوڵشەن، ئاگری تێ بەردرا گوڵزار
ئەبولبول ما نە قەل، هەرچی کە ئۆبالی لە گەردنمە
جەهەنەدەم داخراوە بۆ خواناسان لەدونیادا
ژمارەی پیسو پاکە، یانی ڕۆژی هەڵبژاردنمە
دەرمکەن، ڕام ڕفێنن، بمکوژن، بێجگە هەقم ناوێ
بەیارم بۆچییە؟ کاتی درەختو میوە چاندنمە
چ هێزێکە لەڕووی هەق دانەمێنێو، سەرنخوون نەکرێ؟!
چ کاتێکی پشێلەو گورگو شێرو مار خواردنمە؟!
بگونجێم، ڕێز ڕابگرم، لەهەر شت چاکترە، ئیمڕۆ
لە ڕێکوپێکی دەرناچم، چ تۆ تۆوو، چ من منمە؟!

درێژی هیچ کارێکی، وەکو دەوری فەلەك نابێ
لە لایێ ئاگرو دووکەڵ، لە لایێ بەفرو بارێمە
کە هەر بمرم، هەتا ئەمرم، لە ڕاستی زیندە ناناسم
ئەگەرچی ڕاوە ڕێویمەو، لە کێوو دەشت کون کونمە
گەلێ کۆمەڵ کرانو، هیچ، نەیانبوو سوودو قازانجێك
بە بۆشی چوونە دەر ئاخیر، وەکو ئەم بەرگە چڵکنمە
گەلێ مێشکی منالان پڕ کران، بیری منالانە
لە کیسم چوو کوڕو کچ، ئەی خوا، ئەم عەصرە دوژمنمە
کەخۆم خۆمم نەوێ بۆچی لە خەلکم چاوە، چرکەی چاك؟
زەویمو کانو ئاوم چوو، کونو کاو جێگە نووستنمە
نە پارەو پوولو نانم بوو، کە جارێ بچمە ناو عالەم
نەخۆشی سیلو سەودایی، کە خۆشیو ڕابواردنمە
نەمەندە بۆ چەندەرێژو هەراشی، ماڵ خەراپ (ژیکۆ)؟
بەڵێ دەروەستی خۆم نایەم، ئەگینا حەققی بەستنمە!!.

(٢٨)

سەرنخوون کەوتووم‌و بەختی بەد لە ناوی چاوەمە
مەشقی بێگانان شەپۆلی دیدەیی گریاوەمە
قاقمەی هۆدەم شکا، سەربانی ڕاستیشم تەپی
هەرچی دوژمن پێم ئەکا، سوێندو درۆی بێ ناوەمە
بیرو مەستی، کوێرو فانۆس، عەقڵو عاشق، چۆن ئەبێ؟
قەحپە، ناموسی لەبەر پێی پوولو پارەی لاوەمە
تۆ بە کێ باوەڕ ئەکەی؟ لەو کارخانەی دوژمنان
هەر کەسێ هەستێ بلێ، سەد جارە بۆ خۆم گاوەمە

سوێندو پەیمانێك بە ڕووتی کێرو کوس بێ‌و، مێزی پڕ
هەر مەزەی میزو گووە، دۆشاوی جەرگو ناوەمە
کوردی دامەنپاکو ڕەوشەن چاوو دڵ سافو ڕەوان
وا ئەزانم تەفرەخواریت، وەك خەیاڵی خاوەمە
ئەم کەژو کێوانە نابینی؟! بە چەند ڕەنگ دایەسێن
دیمەنی خوێنی دڵو، سینەی بە غەم سووتاوەمە
ئەم هەموو مێلاقو نیسانەو، چەقیلەو بووکی سوور
تەشکی دیدەی ئاگرینو، گۆشتی زۆر برژاوەمە
ئاخە بۆ کوێستانەکانو، داخە بۆ گەرمێنەکان
دەستی خۆی بردۆتەوە بێگانە، من دۆڕاوەمە
یەکدگیریمان نەبوو، بەم سوێندە بەدرۆیانەوە
خۆشی خۆشی دوژمنان، لەم هۆزی تێکئالاوەمە
بەم هەموو کانگەی وەڵاتو، بەم هەموو ماوەی دروست
دەستگیری هیچ نەبووم‌و، ئێستە چاوو ڕاوەمە
دەستەڵاتت گەر هەبێ، دوژمن بە گژ مارا بکە
من لە ترسانو هەڵاتن، یەك شریت شاقاوەمە
دامرامو بوومە (پشکۆ)، تا نەبوومە خۆڵەمێش
کوردەکان! پێم دابخەن تەندووری هیوا، باوەمە.

(٢٩)

هەوری بەهارو گرمەگرم، لە ئاهی ناو هەناوەمە
تاوو بروسکەو خرمە خرم، بارانی هەردوو چاوەمە
لەسەر هەوارە بەرزەکەم، ڕژاوە تاوە تەرزەکەم
بە لەرزە بێ بلەرزەکەم، خرپەی دڵی بە تاوەمە

کە خونچە هاتو پێکەنی، تەنو گیانم ڕاچەنی
کە ئاشکرایە دیمەنی، خوێنی دڵی پژاوەیە
بە لەنجە چوست تێپەڕی، بە عەردو بەردی دا تەڕی
داگیری کرد زەریەو بەڕی، منیش تەمای خوناوەیە
نەسیمی نیوە شەو وەزی، چوومە کەلێن باڵاو کەزی
سنووقی سەر سینەم دزی، ئەوەش دەسی براوەیە
لە عیشقی تۆم پەنا نەما، غەزریەو چوومە لانەما
لەم دەشتو مێرگە پانەما، سەلاّ لە نەنگو ناوەیە
چەندم چەشی قەلەندەری، هیوامە هەر سکەندەری
جادووی نەسیمی میهتەری، هەمووی لە بن کڵاوەیە
شێخو مەلا مەگرن یەخەم، ترسم نییە لە پێچو خەم
نیازی خۆم کە سەرنەخەم، بە ئابرووی ڕژاوەیە
بێ پەلو پۆیە کوردی من، درشتە بیری وردی من
کەس با نەبێتە پەردی من، گەر خزمو دایکو باوەیە
هەر کارەساتێ بێتە ڕوو، دووپشکە، ژاری پڕ چزوو
ئەمن پەرۆشی تۆمە تۆ، چاوت لە مەرگو جاوەیە
(پشکۆ) بەسە سۆزی جگەر، خرامە کوورەو دەردی سەر
کارم نەوەستا سەربەسەر، خۆمو بەشی خوراوەیە!!.

(٣٠)

وتم: پشتی وجوودم تێکشکاوە، ئێستە ڕۆڕۆمە
وتی: مردن لە عیشقا، خەسڵەتێکی چاکە بێ لۆمە
وتم: تاکەی لەسەر گۆنەم، بڕێژم تاوی فرمێسکم
وتی: ئەو بەردەلانە گەر نەبێ، تاوی عەبەس جۆمە

وتم: وا دڵ لەلاتە، زامنی ماچێکی لێوی کە
وتی: هەی شێتە باسی چی دەکەی، ڕووحیشتە هی خۆمە!
وتم: لاکەی سەرم دێ، لەو مەقاماتی سەرو زوڵفە
وتی: ئەسراری ئەم چەرخە، لە خانەی زوڵفی لۆلۆمە
وتم: بوومە خەراباتێ، لە نەشئەی چاوی بە خومارت
وتی: ئیشت ڕەوا نابێ، بڕۆ دەر لێرە بۆ تۆمە
وتم: شاهی حەبەش گیانا، دەخالاتم قبووڵ کا دێم
وتی: کارت لە ڕووما هەر درۆیە، مائیلی ڕۆمە
وتم: خاڵت بە بەختم شاهیدە، زوڵفت بە بالاّی من
وتی: لەو کاتەوە شانەی دڵت فەوتاوە، ئەو کۆمە
وتم: گەر من بکوژرێم، خوا ڕەوا نادا ڕەقیب مابێ
وتی: بۆچ وا نەفامی؟ خۆم ئەزانم سیرمەخۆر دۆمە!!
وتم: شیرین وتارم، نوختەیێکی ماوە عومری من[1]
وتی: (ڕاجی) بڕۆ، لەم نوختەدا ئیشت گەلێ گۆمە!!.

((٣١))

بێ خونچە، نییە ڕاحەتی زاغو زەغەنی مە
بێ پەردە موهەییایە، گوڵو یاسەمەنی مە
مەعشووقە کە دای حوکمی، بە کوشتنمو بە کوفرم
خۆی سەیری ئەکا، بولبولی خوێنین کەفەنی مە

١ ئەگەر نوختەیەك لە سەر پیتی (ع) ی وشەی (عومر) دابنێین ئەوا وشەکە دەبێت بە (غومر غُمْر). ئەو کاتەیش دوو واتا دەبەخشێ، یەکەمیان بە واتای (نقوم بوون و شەلاّڵ بوون) دێت. دووەمیشیان بە واتای کەسێك دێ کە هێشتا کاروبارەکانی تاقی نەکردبێتەوە. مەبەستی (ڕاجی) پێش لە دانانی ئەو نوختەیەدا ئەوەیە کە یارەکەی نقوم و شەلاّڵی ناو خۆشی و چێژی بکات، یان بە یارەکەی بڵێ کە ئەو تاکو ئێستا کەسێکە نقومبوون و شەلاّڵبوونی لەناو چێژو خۆشییەکاندا تاقی نەکردۆتەوە.

هەر لالە غوبارێکی ئەگەر نیشتنە سەرو ڕووی
تەلتیفی دەکا قەترەیی ئاونگی غەنیمە[1]
هەر لەشکری سیمایە، لە سەد لاوە کە بشکێ
گەر بێتە سەفا، دڵبەری ناسک بەدەنی مە
تێراوە لە نازاوی قسە، لەعلی لەبی تۆ
ناسوفتەیە فیکری، وەکو دوڕڕی عەدەنی مە
وەك نەیشەکەرە قامەتی مە، بۆ قسەڵی خەڵك
جانا! چ دەکا وەختێ تۆ هاتی، جەگەنی[2] مە
(ڕاجی)! چ غەریبن قسەکانم لە هەموو جێ؟!
ئایا لە جیهان کەس هەیە تەعلی سوخەنی مە؟!

(٣٢)

ئەو زوڵفە کوێتانە دەکا شێ، بە دوو شانە
بۆیە دڵەکەم پڕ لە هەوای لامەڵو شانە
مەیخانەیی دوو چاوی، ئەڵێی کانی ژیانە
کێشانی شەمێنێکی تەرازووی، بە گیانە
ئەی شێخی ڕیا، بۆچی ئەڵێی کورتە زەمانە؟
ئۆبالی منی عیشق زەدە، بەو ملە پانە
وێردی تووە تەسخیری بەشەر، بۆیە شەبانە
من ڕۆژو شەوم ناوێ یەکێ، وێردی زوبانە

١ غەنیمە: دەستکەوت. دەشێ بە (غەنی مە) یش بنووسرێ ئەو کاتەش واتای ئاونگی دەوڵەمەندی ئێمە دەبەخشێ، کە مەبەست لێی ئەشکی سوورو خوێناوییە. بەمەیش جۆرێك لە تەناسوب لەگەڵ وشەی (لالە)دا چێ دەبێ.

٢ جەگەن: گیایەکی لاسك سێ سووچەو لە زۆنگاودا دەڕوێ. جاران چیغو حەسیریان لێ دروست دەکرد.

گیـــانی منـــە، نـــاوی منـــە، نـــاوی دڵو نانـــە
مـــن قـــومریی پابەســـتەوو ئـــەو ســـەرووی ڕەوانـــە
عەشـــقی منـــە، مەشـــقی منـــە، تەشـــقی ڕەمزو بانـــە
مـــن بولبـــولی پـــڕ زارمەو، ئـــەو شـــاهی گوڵانـــە
پیرێکـــی قەلەنـــدەر، وەکـــو (ڕاجـــی) بەکەوانـــە
صـــەییادی جـــەفای داوی گـــوڵو، ڕاوی کەوانـــە.

(٣٣)

یـــاری پـــارم تـــووڕە بـــوو، ئیمڕۆکـــە میـــوانی منـــە
چـــونکە تـــۆرا بـــووم لـــە ئـــەو، بۆیـــە لـــە دیـــوانی منـــە
شوکری ئەســـتێرەم بکـــەم، چەند جارە ئـەو تـۆرا بـوو لـێم
ئێـــستە بەردناوزـــژی پـــشتی، ڕەمـــزو هاوشـــانی منـــە
چـاوی، پڕگریـانی نـاز بـوو، ئـەو دەمـەی لێـوم دەگەسـت
ئێـــستە ئـــەو نـــازەی لەســـەر دوو لێـــوی خەنـــدانی منـــە
لۆمـــەکاری مـــن دەکـــاتو، نایەتـــە مـــاڵم دەمـــێ
تانـــەگۆی دەعیـــەو دەمـــارو لافو عینـــوانی منـــە
قۆڵی چەپ ماچ کردنو[1]، نووسانی سـینگو مەمییـەتی
نـەرمو شـل بـۆ چاکوخۆشـی، دەسـتو دامـانی منـە
هەستی شـەش مانگـەی بـە چـاوا دامـەوە، سـەربازی چـاو
بۆیـــە وا ســـورمەی حـــەیا، پـــڕ هـــەردوو چـــاوانی منـــە
بـۆ گلـەو ڕاسـتی، دەمـێ دانیـشتو مەسـتی بـردەوە
مـاڵـەوایی خواســـتو، ڕۆیـــشتو، دوعـــاخوانی منـــە

١ جاران کچانو ژنان تۆقەیان لەگەڵ پیاواندا نەدەکرد. بەڵکو قۆڵی چەپی پیاوانیان ماچ دەکرد، بە تایبەتی لە کاتی سەردانو جەژنە پیرۆزەدا. ئەم دیاردەیە تاکو ئێستاش لە هەندێك شوێندا هەر ماوە.

حوججەتی حەجکردن و تەسحیفی هەردوو لایە بۆم
ئەو کە میوانی منە، سا جەژنی قوربانی منە
وەك نەتیجەی دامەنی خستۆتە کۆششی ناوکی
بۆ گرانباری لە ڕێی عیشقا دەڵێی شانی منە
ئەو دەمەی چاوی دەهێشاو، من دەمێ ماچم دەکرد
بیری دڵمی خستەوە، زوڵفی سەناخوانی منە
یەك دوو ڕۆژی تر، ئەچم بۆ لای و تاقیکردنەوە
تابزانم خۆشەویستیی ئەو لە گیرفانی منە!!
تا خەجندەی ئێمە بێ، ئەندازەکاری هەڵکشێ
کۆمەڵی جوغزی لەماڵی ناوەڕاستانی منە
جەختی پاشەوپێشی من، هەر شەشسەدو سێ[1] دێتە ڕوو
بێ ژمارەی نوختە عومری فەخری ئینسانی منە
ئەو حەجە، یاخو خەجە، یا حوججەتی ژینی منە؟!!
یا وەکو (پشکۆ) بە دایم، ڕووی لە سووتانی منە؟!!.

(٣٤)

ئاگر لەدڵی بێ زەوەرم، هەڵمەگیرێنە
جارێ بە سەری لێوی گوڵێنم بدوێنە
بۆ مردن و ژین، شانەور هێلانەمە نیشتمان
بۆ جێیەکی تر، هەنگی دڵم هەڵمەفڕێنە

١/ أ شەشسەدو سێ، بە حیسابی پیتەکانی ئەبجەد دەبێتە (جخ ). ئەگەر پاشەوپێشی بکەین (هەڵیگێڕینەوە) دەبێتە (خج ، واتە خەج). لە دێڕی پێش و دێڕی دوای ئەم دێڕەشدا ئاماژەیەکی ئاشکرا بۆ ناوی (خەج) هەیە.
ب ئەگەر نوختە (سفر)ی ژمارە (٦٠٣) یش لاببەین. ئەوا دەبێتە (٦٣)، کە تەمەنی پەیامبەری ئیسلامە (د. خ).

بڕوانــە وەکــو خولــخولە لــەم دەشــتی گەیــشتن
بــۆ هەوڵــە کــە نەخولێتــەوە، وەك بــازو شــەهێنە
هــەنگوین نــەڕژێ، لــەم دڵــی هێلانــەیی وێــران
ســــا نــــاوەکولێ گریــــەتی پێــــدا مەڕژێنــــە
نــەی تــازە بــە گــەنجی، وەکــو عەرعــەر شــڵەژاوی
دەســـتێ لــــە ســــەرو کوڵـــەوو پەرچــەم بخــشێنە
تــۆزو تــــەمی ناشــــادییو نــــاڕێکی بــــە بــــادە
یــەك بــادە، لەســـەر پەنجــەیی زیـــوین بنوێنـــە
نـەی کـوردی سـەراوردەیی غـەم، مـەمکوژە جارێ
ســـاتێ لـــە ســـەراپەردەیی شـــاهیم بنوێنـــە
بــۆ پێکــەوە نووســـانو، بــڵاوەی چــەپەڵو پــاك
ئــەم زنێــرە لــە بۆتــەی تەقــەلادا وەتوێنــە
وا حــەل بــوو هــەوێنی دڵو ســەر، بــەس بکوڵێنە
چــیدیکە لــەناو بۆگــەنو زبڵــی مەخزێنــە
نــەی ســـەروەیی لاچــاوی سەروچــاوەیی کــوردان
پێــستم بگــووڕو، ڕیــشەیی جــەرگم مەپــسێنە
(ڕاجــی) وەرە بینێــژە، لــە هێلانــەیی خۆتــا
لــەم بــوورو بەیارانــە، نــەمامت مەچــەقێنە.

(٣٥)

چــەنگم چــەنەگەی چــەندە چــنی، هــەر نەچــناوە
مێــژووی هونــەرو هێــزی مــەژیم، ئــەو نەمــژاوە
پــــەرژینی ژەمو ژینــــــە، پــــەڕی ژانو هەژانــــە
وەك پەرچــەمی پــڕ چــیمو چــەماوی، کــە چــەماوە

ئاوارە بە هاواری هەواری دڵی نایا
ئەو یارە دیاریمە، بە یاریی ئەڕواوە
هاتم بە نەهاتیمەوە، ئاوم بە هەتاوە
تا تاوی دڵو دیدە، لە تاوی خەڵەتاوە
جارێ ئەبوو، جاری بەو، جاڕدەم لەوی لێوم
خاڵی منو، ئەو خاڵی، دەمی خاڵی ئەماوە
هەرچەندە، بە هەرچەندێ کە لەم چەندەمە ئەمچەند
هێشتا ئەمەلی ئەو کچە گچکەم ئەبڕاوە
هەر ڕاوە سەلەم[1] بوو، نە ڕیبای ماچی دڵم دا
وەك گیانو سەرم، دەوری دراوم ئەدراوە
پاڕاوی ڕەوەی ڕاوم ئەکا، ڕاوی ڕەوای ڕووی
بیماری بە تیماری خەتی ماری مراوە
دوپشکی کە پشکی منە، دوو شك لە بەشێکە
بێبەش لە شكو پشکە، دوپشکی کە شکاوە
ڕەفتاری کە هەر تارە، بڵێ تارە لە گوفتار
دیوانی لە دێوانە، پڕژو پێوەدراوە
تاوانی چبوو؟ ئەونی هەناوم کە لەناوچوو
ناوچەی ئەچەتای عیشقی، بە مەشقم نەچەتاوە
با لەو کەژو کێوانە، کوژابێتەوە کێشەم
سووزەو گڕی ئاگر، لە کەژاوەم ئەکوژاوە

١ جاران، جوتیارە هەژارەکان لە سەرەتای وەرزی کشتوکاڵ کردنی خۆیاندا، بڕێك پارەیان لە دەوڵەمەندەکان بە قەرز وەردەگرت، دوایش لە جیاتی بڕە پارەکە بەروبوومی کشتوکاڵییان دەدایەوە دەوڵەمەندەکان. ئەم پرۆسەیەش پێی دەگوترا (سەلەم).

تــا ئــۆگری بم، خــوێنی گــرینیش کەمــە گەوهــەر
هــەر داوی شــەداوی، لــە شــەتاوم نەشــەتاوە
ئیــشم کەچــە، ڕیــشم کەچــەڵە، گێــچەڵە پیــشەم
ئیــشم نــەبڕو شــوومە، کــە تێــشوومە تــەواوە
هەرزانــــــە، بــــە لەرزانــــــە، ڕەزو ڕووزەوو ڕازم
لــــــەرزیوی بلــــــەرزەکەو، زراوەی لــــــە زراوە
تــاخر، لــە خــڕی خێــرە کــە خڕبۆتــەوە خرمــەی
یــــەعنی بەدرێــــژی نەمــــــەڵ دانــــەڕژاوە
بازێکــە بــە بــازیی، هــەمەو نــازێ نەبــەزێنێ
بــــــازاری هــــــەزار زاری، بــــــەزاری زرە ڕاوە
ئیمــشۆکە پەشــۆکاوە پــشووم، بــەو گــوڵی پــشکواو
نــــەبزووتووە، زاوا نییــــــە، نــــاوانی بــــەزاوە
ڕۆژێکــــی چ بــــێ ڕێــــژەوە، بیڕێــــژە دوو چــاوت
ســــارێژی بکــــە ڕێــــژەنی ئــــەم دیــــدە ڕژاوە
ڕووت، عەکــی لە کەس مەگرە، مەگەر هەر مــنو ئاهەم
ئاوێنــــە، وەهــــا وێنــــە، بــــە هــــاوێنی نــــەداوە
تــا مــاوی، لــە تامــاوی تــەمابڕ مەبــە، وەك لات
لاتــــێ بــــە بــــەڵاوە بگــــرە، مــــەگرە بــــەلاوە
کــارت، کــەرەتێ لــەم دڵــە ناکــا ڕەتــی ماتــەم
لــەو ڕووتەنــە، دووڕوو ڕەتــی داوە، کــە ڕەتــاوە

(ژیکۆ)! مژەکی مێشکو، ژەکی بیرەوو بیو بە
مایەت مەیەنە مەیکەدەوو، مەی بکە چاوە[1].

(٣٦)

## دەربارەی یەکێك لە خانمە قوتابییەکانی کۆیە نووسراوە

بەناوی خوایە هانام، دونیای هەموو داناوە
وەسفی یارێت بۆ دەکەم، لەسەر دنیا نەکراوە
گوێ ڕاگرن براینە، بۆتان بڵێم تەواوە
یارم بە لەنجە دەڕوا، خەریکی کانیو ئاوە
وا شینو شۆخو ناسك، پاوو پووزی هەڵداوە
کوشتاری عاشقانە، بەو زوڵفو خاڵو چاوە
دەڵێی شەهێنو بازە، لە تەیران بەردراوە
هەموان بە جارێ دەگرێ، جحێڵو پیرو لاوە
قوربانی ئەگریجەی بم، وا چین بە چین ڕسکاوە
هەر وەك ڕەشە ڕەیحانان، شەواوی تێکەڕاوە
وەك ئاورێشمی لە شاران، بە سەد جێگا چناوە
وەك بارێزەی لە ڕازان، ڕەشو گەشو بە ناوە
کە بای دێ دەبیزێوێ، بە دەم تکەو خوناوە
نازدارو شووشو باریك، گەوهەری پێ خراوە
کەزیەی سەرەو نشێوە، بە جینگڵ ناسراوە
دەڵێی ماری حەوسەرە، بە جەرگمییەوە داوە

---

١ دەشێ ئەم نیوەدێڕە بەم شێوەیەش بنووسرێ: (مایەت مەیە. نە مەیکەدەوو. مەی بکە چاوە).

باڵای گرتۆتە باوەش، خەزنێکە تێی هاڵاوە
خوایە بگەی بە هانام، پەنام بە تۆ هێناوە
سەری تاریکە شەوە، شەی زێری لێدراوە
دوو مانگی نوێ لەدامێن، بە برۆیان ناوی ناوە
پێشەمەر مانگی چواردە، بە خەرمانەی تەواوە
بڕۆ بۆ هەرجێ دەچی، ڕەنگەت نیشان دراوە
قوربانی گوارەکەت بم، ڕەنگ زەرد، هەڵاوەساوە
دەڵێی سەد کەسی کوشتووە، لە سێدارەی دراوە
بە چاو بەهەشتی خۆی دی، جێگەی پێ بەخشراوە
بە دەوری کوڵمەی خۆش بوو، تەمای بە کەس نەماوە
بە خولامی بم، بژانگی، وەك نەشتەری ساوە
بۆ جەرگی عاشقانە، ڕیزەی کە لێ گیراوە
چاوی شووشەی شەرابە، چەند مەستە، هێندە خاوە
پڕی مەزەو تارەقە، قەترێکە لێی تکاوە
دەڵێی دڵەی هەژارە، گلێنەی تێ گلاوە
هەر تیرێ پێی دەهاوێ، لە جەرگی من چەقاوە
بەرم بۆ سەر کوڵمانی، لە نووری پڕ کراوە
ئەلەتریکەو دەسووتێ، شەوقی بە عالەم داوە
ئاشق وەکو پەروانە، سووتا لە سێ سەد لاوە
دڵم تاساو کاسا، بغووری تێ ڕژاوە
عەجەب ناسك و نەرمە، دەڵێی بەفرو خوێناوە
شێن و تەڕو مەزەدار، بە هەنگوین تێکەڵاوە
بەر ماچەی دوێنێ کردم، هێندێکی داڕووشاوە
یاخوا عومرم نەمێنێ، ئاگرم لە خۆم بەرداوە

نەمزانی هێندە تورتە، وەمزانی قەندی خاوە
کەپووی دەڵێی فندەقە، لە زێڕی داڕژاوە
دەنکێکە گەوهەری ژیان، بە دوو جێگا سماوە
خەزنەکەی لە یاقووت، بە سەد لیرەی کڕاوە
دەمی دورجی مرواری، بە دانەی هێناوە
ددانی ڕیزە گەوهەر، لەلای خوای هۆندراوە
لێوی، بڵێم خونچەیە بازاڕم لێ شکاوە
یاقیق‌و لەعل‌و مەرجان، هەموو دەچنە پەناوە
لێوی لەسەر کە دانێم، دەوەستێ گیان بە پاوە
دەست بەجێ دەردەپەڕێ، کە لێوم هەڵگیراوە
چەنەگەی گۆیی ئاڵتوون، بە قودرەت نەخشراوە
نیشانەی ڕێکوپێکی، چەرخێکی تێ خراوە
بڕوانە قۆڵتی ڕەنگین، پڕ شەهدو پڕ شەکراوە
ئاوی حەیاتی تێدا، تک بە تک ڕاوەستاوە
ئاگوتزێ بەرغەبابەی، بە کارەبا کراوە
تورت‌و تەڕو سپی‌و لووس، ڕەونەق دەخاتە چاوە
گەردەن دەڵێی قوڵینگە، باریک‌و بەرزو لاوە
ئالآی لەشکری بەهەشت، لەسەر شان ڕۆندراوە
شەرابی حەوزی گەرنێی، جەوازی پێدراوە
بینۆشە ساخێرابە، هەتا نەبووی تەراوە
قوربانی شانەکان بم، دەسمالی تێ شەتاوە
دوو لقەی داری بانە، ڕەگی خۆی داکوتاوە
زیوینە قۆڵی نەرمی، کافووری بەر هەتاوە
نانیشکی تیشکی ڕۆژە، لە چاوی کول دراوە

باسکی دەڵێی خەیارە، وا ناسکو بەناوە
بە شووشەواتو بازن، دەڵێی خەڵات کراوە
بڕوانە پشتی دەستی، وەك تاوێنەی سڕاوە
دەڵێی مۆنجەی سەرابە، بە بریقەی ڕۆژ سەراوە
ئەنگوستەکانی بلوور، پڕ هەیتو هووتو هاوە
ئەنگوستیلەو عەزامات، بە سەد جێی تێکراوە
هەموو شەقاری بەفرن، بە چەرخی ڕوح گەڕاوە
هیلالو بەدری دایم، هەڵاتووەو لەباوە
بانی نینۆکەکانی، خوا زینەتی پێداوە
ئینجا بۆ سینەی بەرم، سفرێکە لێی نەخوراوە
فنجانەکانی یاقووت، سەرەوخوون کراوە
ژیانی دڵ دەبەخشن، بەو تەرزە دانراوە
هەر یەك گۆڕێکی پێوە، عالەمی پێ کوژاوە
پێم ناگوترێ هەواڵی، وا دیارە ڕێزەی[1] ناوە
چت پێ بڵێم؟ کە سینەی، تەبەقی ئافتاوە
لەبەر عەجایەباتی، دەماغم ئاسیاوە
بڕوانە قاشی ناوکی، بە هەڵماسێ سماوە
هەزار ڕەحمەتی لێ بێ، بە دەستی کێ بڕاوە؟
لەسەر گومبەتی زگی، جێی خاڵە هێشتراوە
پەنیری تەڕ قەڵاتە، بە دەستان نەگوشراوە
لەسەر دوو تەختەیی عاج، چلۆن بینا کراوە؟
لەلای عەردی موقەددەس، دەرگێکی تێ خراوە

1 ڕێزە: ڕەنگە کورتکراوەی ناوی (ڕێزان) بێ.

بـه لەشـکری خـەیاڵات، هێـشتا فـەتح نـەکراوە
قـوفڵێکی بـێ کلیلـە، جـەرگم لـەبۆی سـووتاوە
خـەوم لـە چـاو ناکـەوێ، حـاڵم لـێ پەشـۆکاوە
دەنـدووکی بـاز لەسـەریە، تەلـەسمی بەسـتراوە
لـە بـەینی دوو قولـەی زیـو، بـە سمتیـان نـاوبراوە
ئێـشکەچێن خاڵـەکانی، ژیـانم پـێ نـەماوە
خـڕو پـڕو بەشووشـن، بـە خـەرتی خـوا گـەڕاوە
هـەتا کـڵاوەی چـۆکی، دەڵێـی قـەڵاتی ئـاوە
ئێـسکو دەمـاری دیـارە، دەڵێـی ماسـی سـەراوە
بەلـەکو قـاپو گـۆزینگ، کـافوورە تێکـسڕماوە
نـەرمو خـڕو پـڕو لـووس، بـە قالـب داڕژاوە
ئـاوم لـە چـاو دەهێنـێ، وەکـو زیـوی تـوواوە
ئەنگوسـتی شووشـەواتە، گـەورەو گـچکەو لـەناوە
دەچـو بـۆ کـوڵو قەسـاری، بـە نـازو فیـزو تـاوە
حـۆری بـە لەنجـە دەڕوا، پـەری دەبـوون بـڵاوە
ئـەو خەبـەرم هاتـە گـوێ، لـێم دادەبەشـی ڕاوە
پـەنا بـوو خـۆم گەیانـدێ، لـەوم دەکـرد سـڵاوە
تەماشـای کـرد منـی دی، دەسـڕەی بـە خـۆ داداوە
تاقـە ماچـێکم لـێ خواسـت، گـوتی: بـڕۆ بـەولاوە
لـێم لادە ئـەی هـەتیوە، تـۆ چـیت بەسـەر مـن داوە؟
چـەندم کـرد نەهاتـە ڕا، دونیـام لـێ پەشـۆکاوە
پێمگـوت: قـولاپی زولڤـت لـە جـەرگم خـستراوە
وتـی: ئـەمجارە دەبـڕۆ، ئیـشێکی زۆر نکـاوە
شـەرت بـێ بەشـەرتی ڕاسـتی، ئـەمجارە بمخـە لاوە

جارێکی دی بە پێی خۆم، سەد ماچم بۆت هێناوە
وتم: ئەی گیانی شیرین، فرسەتم باز نەداوە
هەتاکو جارێکی دی، بەشکو عومرم تەواوە!!
چەندی وت گوێم نەدایە، دڵم بۆی پچڕاوە
وام ڕاگوشی لەباوەش، کە پێمەوە دووراوە
وەمزانی ڕۆحی خۆمە، زیندوواییەتیم تەواوە
لێوم مژی بە جارێ، دڵم هاتە سەماوە
لەناو دیوانی سینەم، مەجریسی لێ گیراوە
بە نایو سازو سەتوور، شایی لێ ڕاکشاوە
هێندەم گوشیو مژی ئەو، بێهۆش بووم چووم بەلاوە
مریدی غەوسی بەغدا، ئەمەم بۆ تۆ داناوە
باسی مەکەن لە کن کەس، ئەی یاری بەڵەک چاوە
ئەمنو ئەتۆ حەیامان، هەر پێکەوە ڕژاوە
ئیشمان بە ئاقڵی بێ، تا چی تێنەگلاوە
بە کوڵمو مەمکەکانت، کە عەترو پڕ گوڵاوە
مەنعم مەکە بە قوربان، جەرگم لە بۆت پساوە
چەند جارێ کە من هاتم، دەمێ بخە پەناوە
ماچ بکەم لێور کوڵمەت، دەڵێم ماندووم حساوە
ئۆخەی چەند خۆشە وەسڵت، بە چەندە تامو تاوە.

(٣٧)

**لە زمان برایەکی خۆشەویستەوە نووسراوە،**
**بەمەبەستی دڵداری لە شاری سلێمانی**

سەرم کەوتۆتە گێژاوی بەلاوە
هەموو دەرگەی ژیانم داخراوە

دڵـــێکم بـــوو، کــە کردتانـــە کـــەبابێك
لەشـــم بۆشـــە لـــە هـــۆش‌و، دانـــراوە
ئەمەنـــدەم کـــوورەیی مێـــشکم ئەجۆشـــاند
کــە فرمێـــسکیش بەســـەر ئـــاگر گـــەڕاوە
ئەگـــەر ســـێ ســـاڵە، ســـێـــسەد ســـاڵە لای مـــن
بـــە لێــــدانێکی دڵ، ســـــاڵم تــــەواوە
ڕەقیـــــبو، عــــەیبو عــــارو، تێکـــەڵاوی
بـــە هـــەر گۆشـــەی خـــەیاڵم تێکـــەڵاوە
لـــە قـــاپێلکم ئەگـــەر دەرچـــم لـــە ڕووتـــان
ئـــەڵێن پـــەردەی حـــەیاو شـــەرمی تکـــاوە
ئەگـــەر مـــات بم لەبـــەرگی خۆشەویـــستی
ئـــەڵێی پـــەیمانی یـــاری لـــێ پـــساوە
ئەگـــەر خـــۆم کـــەم بـــە شـــەیدایی لـــە شـــارا
ئـــەڵێی ناکـــەس بەچـــێك‌و نـــان بـــڕاوە
ئەگـــەر بـــێم، بـــادەگێڕیی کـــەم لـــە ماڵتـــان
ئـــەڵێی ســـەیری هـــەتیوەی نـــان‌و ئـــاوە
کـــە بولبـــول بم، هەمیـــشە بـــۆ گـــوڵی ڕووت
لـــــــە کـــــــاکۆڵ‌و قـــــــژانت، ڕاوە داوە
بـــە خـــۆم بـــاوەڕ ئەکـــەم، ئـــەی هـــۆش‌و ژیـــنم
دڵـــــت بـــــردوومو بـــــیرم لا نـــــەماوە
چ بڕیارێـــــك بـــــدەم، بـــــۆ ڕۆژی وەســـــڵت؟
کـــە دوو دەســـــتم، لـــــە شـــــانانڕا بـــــڕاوە
بـــە کـــێ کـــەم، ڕاوو تـــەگبیرێکی دیـــدار؟
کـــە وەســــتاوم بـــە تەقـــدیری خـــوداوە

دڵـــی، گیـــانی، ســـەری، ڕوونـــاکی چـــاوی
بـــە(کـــاک ئەحـــمـــەد) شـــکی تێـــدا نـــەماوە
بـــەری ئاخـــان، ئـــەزانی نـــاگرم مـــن!
دەمـــارم پـــس پـــس و، ئـــەژنۆم شـــکاوە
لـــە تـــۆزو ماتـــەمی عیـــشقت، هـــەموو دەم
لەشـــم وەك بەختەکـــەم، ڕەش داگـــەڕاوە
لـــە تـــاوت مێـــشکە لـــەق، چاویـــشە ئەبڵـــەق
ســـەرم لـــەرزەك، هـــەناوم داقوڕـــاوە
ئەگـــەر تـــۆ هەقپەرســـتو، یـــاری گیـــانی
لـــە لۆمـــەی خـــەڵكو یـــارانم مـــەهاوە
بزانـــە ئەمپـــەڕو ئەوپـــەڕ، لـــە عیـــشقا
بـــە دەســـتی خۆتـــە ئـــەم جـــاددە بـــڕاوە
بـــە خـــۆت ئـــەکرێ، بـــە حـــەققی ڕووی جوانـــت
کـــە نـــەرمی کـــەی، دڵـــی ئـــەم دایـــكو بـــاوە
عـــەزیزم، دڵبـــەرم، مایـــەی ژیـــانم
ئـــەوی ئـــیش تێـــك ئـــەدا لـــەم شـــارە، نـــاوە
فیـــداتم، بـــۆچ ئـــەبێ وا زوور هەراســـان
ئـــەتۆ چـــاکی، ئـــەمن کـــارم کـــراوە!
لـــە هـــەر فـــەقرە لـــە قـــانوونی مەحەببـــەت
ئـــەتۆ کارســـازو، هـــی مـــن چـــاوەڕاوە
بەرانبـــەر تـــۆ، ئـــەوی بیکـــەم عەیبـــدار
کەواتـــە هـــەر قبـــووڵم کـــەی، تـــەواوە
بـــە بـــەرزی و ڕەحـــم و لـــوتفی تـــۆ ئـــەنازم
کـــە ئاخەیتـــە جـــەفاو شـــۆڕو هـــەراوە

لـە مـن کـورتی، لـەتۆ بەخـشینو ویـژدان
نەتیجـەی دەورەتـان، زۆری نـەماوە
گوزیـدەکارو، سـۆزندە، بـەیانی
خـەریکی تـۆ، خـەریکی گیانـەلاوە.

١٩٥٥

(٣٨)

رووت بە تەنـیری هەناسـەی سـەردی ئێمـە، زەرد بـووە
یـا لـە شـەورۆی پەرچـەمت، بـاری غـەمی هـەلگرتووە؟
ئەم مەمەت بۆچ شل بووە؟ ئەم سێوە، یا دوور هـاتووە؟
یا گەیشتوو بـوو، بـە بـای پـایز لـە سـینەت کەوتووە؟
تـۆ یـەهودی، لەیلـەیی، نـەك ئەخیەلییـەو عـامری
تۆبـە مـەجنوونی شـکاند، مـن زاری تۆبـەم بەسـتووە
ژەهـری مـاری تێگـەرا، گیـانی نـەخۆشو زاری مـن
ئـەم دەمو لێـوەت، کـە ماتـەی داوە، وا شـیرین بـووە
خـاتو زیـنو کاکـە مـەم، یـا شـیرینو فـەرهادی کێـو
هیـچی نـاوترێ، وەکـو ئێمـە لـە عیـشقا پـیر بـووە
بولبولیش ناوێکی وای نـاوە لـە خـۆی، بـۆ دەردی گـوڵ
وەك منی بێکەس چریکەی، شەو بـە گـژ عەرشا چـووە
هەسـتە سـاقی نـەرمو شـل، پڕکـە پیاڵـەو بەدەرێ
سۆزی (ژیکۆ)، جەرگو ناوی بەختی مـەی سـووتاندووە.

(٣٩)

ئـاگری سـووری جـەزای ئۆباڵـە، لێـوی گرتـووە
جەنـەتی کوڵـەی، ئەجنـدەو نـەفسو دێـوی گرتـووە

عەرعەرە نارنجو لیمۆی خستە بەرهەم، یا قەدە
یا چنار ئەگرێ هەنار، یا سەروە سێوی گرتووە؟
خەتتی پڕ شانەی دڵە، یا چەنگ بەستەی حافیزە؟
خاڵی، مێشەنگوینە وا هەنگوینو مێوی گرتووە!!
بۆ نموونەی تەرزی ڕوخسارو، بەهەشتی سەرمەدی
قامەتی ئەو شۆخە چاوی بادەپێوی گرتووە
من لە دەس کورتیمە هەورازی بەهێزم دێتەپێش
دەسدرێژە دڵبەرم، ڕێگەی نشێوی گرتووە
چاوی پڕ سوورمەی، دووسەد نێچیری بەرداوە لە ڕاو
غەمزەکەی جادووی، بەڵام، دووسەد خدێوی گرتووە
بۆ ئەوەی (پشکۆ) کە نەیدۆزێتەوە تەرزی قەدی
پەرچەمی کردۆتە پەرژین، خۆی لە نێوی گرتووە!!.

(٤٠)

چەمەن هەموو گەشانەوە، لە ڕەنگو ڕووی بەهارەوە
گیان بە تەن بەشانەوە، لە گەشتی سەوزەزارەوە
هەوا هەناسە بەر ئەدا، هەناوە سیلی دەرئەدا
سەما بەسەر سوپەر ئەدا، ئەستێرە دێنە خوارەوە
دادو تەرازوو کۆ ئەکا، گەنجینەیی ژین ڕۆ ئەکا
جەماتی مەی مەکۆ ئەکا، لە چاوی پڕ خومارەوە
کەمەر ئەبەستێ خونچەدەم، لەسەر ئەوەستێ پێچو خەم
لە پەرچەم تاو ئەداتە چەم، بە عەرعەرو چنارەوە
دەمی گوڵان پڕاو ئەبێ، تەمی دڵان بڵاو ئەبێ
مەمی چڵان لە چاو ئەبێ، بە لێوی شیرەخوارەوە

وەنەوشە دەستی شلییەتی، دەسماڵی شین لە ملییەتی
بە چاوی هۆز کلیەتی، بە گیانی ئاوو دارەوە
بە ڕوویی بادە ڕەنگەوە، بە خونچە لێوی تەنگەوە
بە دوو مەمی قەشەنگەوە، چوومە کەناری یارەوە
یاری چی؟! شاهی دلبەرە، گیانبەخش و سەروەرە
ژیانی هۆزی بێ دەرە، لە تەونی نیشوکارەوە
سازندە چەرخی نۆیەمین، گەلی گەیاندە نرخی ژین
ئاوازی بەرزی (هەربژین)، وا کەوتە دەشت و شارەوە
پەردەی، سەحەر هەلدایەوە، بووکی وەتەن ڕازایەوە
کۆمەڵ بە خۆشی مایەوە، بە بەختی پایەدارەوە
زوهرە بە ڕوویی موشتەری، بە چاکە هاتە یاوەری
بە کوردی دا پەیامبەری، لە ڕۆژی کارزارەوە
ئارەقی نێوچەوانمە، هومێدی جاویدانمە
تکایی کوردستانمە، بە یاوەرو هەژارەوە
ژاوەی هەزارو قومرییە، کەژاوەی بووکی چەورییە
هیچ کەس لەگەڵ دووڕوو نییە، بە جەرگی پارە پارەوە
زانین پەرستە هۆزەکەم، لەسەر هەوای نەورۆزەکەم
جەژنی هەمووان پیرۆز ئەکەم، بە سۆزی دڵ وەبارەوە
(ڕاجی)و دڵی (پشکۆ)یەتی، قازانجی گەل بۆ خۆیەتی
بادەی لە هەشت و نۆیەتی، بە نەشکی سەد هەزارەوە.
١٩٤٩

(٤١)

سەیری لەبانی خونچە کەن، بە ڕوویی نەشکبارەوە
سەیری دەماغی گوڵ بکەن، بە چاوی ئیعتیزارەوە
فەسڵی سەفایی نێرگسە، لە مێرگو ئاوەزارەوە
چاوی سپی بە دەرئەخا، بە زەردەخەندەی پارەوە
سەیری چیاوو چۆڵی من، کوردیی نیشان ئەدا بە تۆ
بە سێوو بێوو خارەوە، لە سونعی کردگارەوە
لە گەنجی کونجی مەیکەدە، ساقی کە دێتە مەیکەشیی
بە نرخی میللیەت ئەچێ، بە بورجی پڕ نیگارەوە
کشاوە تەرحی تاجو پەڕ، لە ماچی لەعلو نۆشی دەڕ
بە خەددو خەتتو خاڵەوە، بە ڕەونەقی عوزارەوە
ئەقدی بەهەشتە گوڵشەنم، ڕەنگین لیوایە نیشتەنم
سایەی هومایە هەر تەرەف، لە ناوە یا کەنارەوە
ئەوڕەستە مۆردو سەوسەنە، شمشادو کاجو مۆزەنە
هەر یەک بە سۆزێ دێتە ڕوو، بە سازی ئیعتیبارەوە
هەریەک لە عاشقانی مەی، بە بەزمی جامو تاجی کەی
بە تەرزی مونتەزەم ئەچێ، بە پێی ئیشوکارەوە
وەتەن پەرستە میللەتم، لە ڕەوتو زەوتی سەنعەتم
هەموو خەریکی فرسەتن، لە ڕوویی کارزارەوە
مەی، ناوی ئیتتیفاقییە، سەنعەت نیزامی ساقییە
زوڵفی بەخەم نیفاقییە، لەسەر هەتاکو خوارەوە
دەف، شەوقی پڕ ئەژادییە، نەی، بانگی عەدلو شادییە
شاهید بە مەردی دێتە سەر ژیانو ئیختیارەوە

دڵبەر کە شاهی عادڵە، کامی لەبی دڵ حاسڵە
بە چاوی پڕ خومارەوە، بە تیغی ئاوداروە
خوڵاسە میللەت چیمەنە، وشکیو تەڕی لە دامەنە
بە نەشئەی لالەزارەوە، بە خاکو ئاوو دارەوە
لە بەختی سەختی بێ کەسی، لە تەوقی عەوقی موفلیسی
نایە بە ڕوویی کار، یار، بە دەستو جامو یارەوە
حاسڵ، وتاری (ڕاجی) یە، نەتیجە ئیندراجییە
لەهاتو قاتو زارەوە، لە قەلبو جانو زارەوە.

(٤٢)

ئەی برا! بگری لە دامەن باغی کوردستانەوە
ناژێەی بیخۆی بە کەیفو شەوکەتو سەیرانەوە
سەربەخۆیی مۆرەکەت، شۆرا بە بارانی نیفاق
خۆشیو زەوقو مورادت، وا بەدەم تۆفانەوە
هەرکەسێ هاتو بە نانێ، حاجەتی دینایە بەر
تاقیبەت خۆی کردە سوڵتان، هاتە ناو کوردانەوە
بیری خۆی سەرفی ژیانو غیرەتی هۆزی ئەکا
نووکی پەرگاری ئەسووڕێنێ بەسەر دەورانەوە
هێندە ناشادم لە چەرخی فیتنەگێڕی ئاسمان
هەر ئەبینم ناکەسە، ڕووی دێتە ناو دیوانەوە
نیشتمان پڕ مەعدەنو، میللەت لەبەر بێ جەوهەری
خاکی بێ قیمەت ئەخاتە باخەڵو گیرفانەوە
ئەم عێراقەی ئێمە چەشنی بەرخی ساوایە لە چۆڵ
گورگی هار بۆی دێتەدەر، هەردەم لە بن پەنچکانەوە

پــێ بزانــه ســا عــەزیزم، کــارو بــازاڕت چــییه؟
هــەم دڵــت پــێشا بــه ئــاگر، هــەم ســەرت تاوانــەوه
کورت وکەم بڕوانە خەڵکی، چی ئەکەن، چۆن ئەچنە پێش؟
گیانفیدابــە، ڕووکــە ســەنعەت، چــی ئــەکا پاڕانــەوە؟
کــوێر نــەبووی بڕوانــە خــەڵکی، چــۆن ئــەمنێرێ ســەوقیات؟
گــاه لــە لەنــدەن، گــاه لــە تــاران، گــاه لــە هیندســتانەوە
کــوردو عــارەب، هەڵــگرن، هەســتن بــەناوی ئیتتیفــاق
ســەددی میللــەت کــەن لــە گــوڕزی دوژمنــی ئیمانــەوە
تو خودا کەی چاوو ڕووت هەڵدێ، لە خــاکی پــاکی خۆت؟
تــۆ کــە ئــەم گەنجــەت بــە خــۆڕا، خــستە ژێــر پێیانــەوە
ئەی عێراق چاوی سپیم، چەند بێ کەسی، چەند بێ دەری
شــار بــەدەر بــووی، بــێ قەباحــەت، چــوویە نــاو زیندانــەوە
فیرقــە فیرقــەی کــوردو عــارەب، بوونــە جــەرگ‌دەی ڕووحــی تــۆ
جــەرگی مــن ســووتا لــە تــاوت، بــەم دڵــەی گریانــەوە
چــاوەنۆڕم هــەروەکو (ڕاجــی)، لــە بــیری میللــەتم
بێتــە ڕوو ڕۆژی ســەنایع، لــەم کــوڕەی میوانــەوە.

١٩٣٨

(٤٣)

زنجــیرەی گــەلی گــەورەو ســەروەران، کــە ڕازایــەوە
گیــانێکی نوێــێ بــە مــەردوو دڵان، بەخــشرایەوە
بــە تێکۆشــەری بــۆ پێگەیانــدن، گــشتی داوەری
هەربــژی ڕەتــەمن، هــۆزی تەهەمتــەن دڵــی دایــەوە
کزەی هەوڵ‌و هۆ، لە ژێریی مناڵ، کە هات لەسەرخۆ
دەم بەستە خونچەو، یەخەی پڕ خەیاڵ، دەمی دایەوە

لە تافو بافی ڕووی مێرخوزاران، تا کێوی قافی
بە ژینی سافی، گڕەی هەژاران، وا کوژایەوە
بە تیشکو تاوی ئەستێرەی مراز، کانیو چەماوی
کوردی بەناوی سەربەستو شاباز، هەڵقوڵایەوە
دڵەی پڕ لە سووی منی سەرگران، وەکو خاڵی ڕووی
بە یەك داوە مووی یاری نیشتمان، بەسترایەوە
سکەی ولاتی (ڕاجی) قەڵەندەر، زۆرە لەباتی
خێرو بەراتی کوردی هونەروەر، دارژایەوە[1].

(٤٤)

لە گفتوگۆیی خۆشدڵیی، دەمی وەتەن گەشایەوە
بەهارە مژدەهێنی هەر گوڵێکی ڕووی کرایەوە
سەبا هەناسەیی کچانە، ڕۆژو شەو کە خول ئەدا
بزانە لەشکری خەفەت شکایەوە، کشایەوە
ئەگەر بەهەشتەکەی بەرین، لە چاوی نیشتمانەکەت
بە شێخی دین فرۆش بڵێ، ژیانە ئاشی نایەوە
............................................ مەن شکا[2]
بە هەڵمەتی ڕەوشتو خوو، دەماخی دڵ حەسایەوە
کەناری جۆگەلەو شەتو، کەناری یاری دەر کەنار
خەتو تەمەن ئەکێشنو، شەوورە دارژایەوە
کچانی میوە نیوەرەس، لە باوەشی تکا، تەکان
تەکان ئەدەن بە نیشتمانو ژینی لێ تکایەوە

---

١ لە ڕووی شێوازو ڕوخسارەوە هۆنراوەیەکی دەگمەنو دانسقەیە. لە هەر دێڕێکدا (٤ ٦) سەروای تێدا بەکارهاتووە.

٢ بە هۆی تەڕبوونی دیوانەکە ڕەشبۆتەوە بۆمان نەخوێندرایەوە.

لە دەستو زاری دڵبەران، بریقەدار ئەبن هەوار
قەڵاو قونگرەی هەوەس، بناغەی داکوتایەوە
لە ژینی بێ بەراتو بەر مەپرسە قەت، خوا نەکا
کە کشتوکاڵی ئارەزووت، بە میزی خەڵك زایەوە
هەوێنی مێشكو خوێنمە، هەوای وڵاتی نازدار
ترێو هەنارو میوەجات، بە ڕوویی گەش ڕشایەوە
براوو بابو کوڕ، هەموو، ڕەها ئەبن لە بەندو پەت
کە خوێنی جەرگو چاو، لە دڵ، بە قوڵپ هەڵقوڵایەوە
کە تۆ هێلانەبەستی خۆت، بە دەستی خۆت بکەی خەراپ
بزانە سونبولو گوڵی وەرامەکەت وەرایەوە
وەتەن کچێکی تازە بوو، لە باوەشێکی پیرەزاڵ
وەکو ستارەیی سەعد، بە ناز ڕاکشایەوە
ڕاوەیی ڕوویی شیرینی، لەچاوی نەستەرەن ئەکا
گەوهەری تاجی دیمەنی، بە نازکی توایەوە
هێزی برایەتی بزووت، فیتنەگەری برایەوە
وەتەن هەتاوی لێهەڵات، ئاگری شەڕ کوژایەوە
گۆڕیمەوە (ڕاجی)ی هەژار، ئێستە بە (ژیکۆ) ناودار
بێژە کە هۆزی کوردی مەن، مردبوو، وا ژیایەوە.

(٤٥)

## داشۆرینی فەرمانگەی تەموینی کۆیە

دائیرەی تەموینی کۆیە، هەر خەریکی دانییە
کردەوەی مالۆسو مانگاو، گوێدرێژو گا نییە

هەر کەسێك بێتو سواریان بێ، جەنەی دەگرن هەموو
هەرکەسێ بیانگێ نیتر، هەر قوونی وانو (ڕان)یيە
بەردەری قەسری بیتاقان، هەروەکو مانگا بەکەڵ
هەرچی گانی دەسکەوێ، بۆچی خەریکی نانییە؟!
گاندەرو گانکەر، بە سەربەستی دەبا بێنو بچن
چونکە لەم کاول ولاتە، شك دەبەن پاشا نییە
گەر بلێی تێتان دەپەستم، خۆش، دەمت شیرین دەکەن
چانییە بۆ خاسو عامی خەڵك، شەکرو چا نییە!!
لێم مەپرسە بۆچی هێندێ شیرنو هێندێکە تاڵ؟
قوون درانیان بۆ دەمێنێ، گەر بلێن ئاوا نییە
پیاوی ئاقڵ تێدەگا، چیتر درێژەی نادەمێ
پارەدان لەم هۆدەدا، مەعنای لە گان ئاسانییە
نایەنێ زارم کە ناوی یەك بەیەك بیهێنمە ڕوو
زەمی کەس ناکەم، ئەمەش تاپۆیە یا خاقانییە
بۆچی هێندە بێ حەیای، (گویا[1])، سەری خۆت شۆڕ بکە
عالەمی ئیمرۆ ڕەهەندەی بێ کەسیو تاوانییە.

❁❁

١ ڕاجی، ناسناوی (گویا)ی لەم جۆرە هۆنراوانەدا بەکارهێناوە، کە بە واتای (قسەکەر، ئاخێوەر، وتەبێژ) دێ.

- و-

(١)

بروانە دەفەی سینەی، سینی و قەدەحی خەملاو
جا ئەو قەدە شیرینەی، کورتو خڕو تێك سەڕماو
پووزو بەلەکی زیوین، دەستو مەچەکی ڕەنگین
بەستەو لەچەکی نەخشین، باغی مەمو دەم پاراو
چاوی بە مە هەڵنایە، هەر جەنگی لەگەڵدایە
دڵ بشکوژی هەڵنایە، لەو چەنبەری ئاڵۆزاو
کوڵمەی جگەری ڕۆژە، ڕوونـاك و گەل ئامۆژە
بەم خاڵەو پشکۆژە، بەم لێوەوو قەندی خاو
ئەو پەرچەمە خارا بێ، پەردەی قەدو باڵا بێ
دڵ ڕەنگە کە خارابێ، هەمبانەیی هەڵکوتراو
ئەو لامل و لاجانگە، بۆ گوارە کە بەربانگە
ڕۆژووگری شەش مانگە، گیانی منە لێقەوماو
ئەو ئەبرووە کەچبازە، سەربازە لەسەر بازە
گرتی خەتو شیرازە، بردی سەری تێ سووڕماو
ئەو پەنجەو ئەنگوستە، بۆ دەورەیی مەی چوستە
هەردووکی ئەوا خستە، جەرگو دڵی هەڵگوشراو
(پشکۆ)کە گڕی دامرد، بەختیشی خەڵووزی کرد
یەکجاریە سا ڕابرد، بەسییە کە وتت سووتاو!!.

(٢)

تا لە سەرما بێ، هەوایی ڕەشبەڵەك
باخ و فرمێسکی گرینم دێتە چاو

**تاکو پەرژین کەم، ڕەزی سینگی بە چەك**
**باخەوان ئەیباو، ئەمێنم بەش بڕاو**
**وا ئەبێ تلیانە گوڵ بچنن مەچەك**
**واش ئەبێ پووزو بەلەك دەرکەونە ناو**
**بشەوێ گەر دابنیشین، تەك بە تەك**
**ناگەمە ناخیر هەواری ویستراو**
**گەر شەوێکیش ڕێکەوێ، کەوڵی وشەك**
**چەقڵی بێگانان بە ڕۆژ ئەگرێ هەناو**
**با بچێژم زامی زۆر کوچك‌و کوتەك**
**مردنم چاتر، لە دەرگەی داخراو**
**من کەسوکارم ئەتۆی مردوو مراو**
**من دەس‌و زارم ئەتۆی، بێ چاوڕاو.**
**ژینەوە چەند مێرگ‌و، نێرگس پێگەیین**
**ڕووی سپی‌و، چاوانی زەردو، بۆنی ساڵ**
**خۆش ئەبوو هێندەی ڕووانی‌و پێکەنین**
**زەردەخەنەدەی خونچەشی هێنایە پاڵ**
**ئابڕووی جوانی ڕژایە ناوو دین**
**ڕەنگ‌و بۆی شادی کرایە بەیتەماڵ**
**تا لە بێهۆشی مە دوژمن تێگەیین**
**هیچ میراتگر نەماون کوردو کاڵ**
**خاوەنی باخان، وەجاخ کوێرن لە ژین**
**ئەو بەرانبەر وەسییەتی خزمیشە لاڵ**
**دواکەون خوشکیش، بە بێ مارە بڕین**
**داکی سەرشینیش، کە زاوای کردە زاڵ**

من ئەوا تۆم چووی‌و، مام بێ ماڵ‌و حاڵ
بێ براو کوڕ، بێ کەس‌و بێ مام‌و خاڵ
من کەســــوکارم ئەتۆی مردوو مراو
من دڵ‌و زارم ئەتۆی، ئەی کوردی خاو.
ئاخ، بڵێم کێ بێ لە ئێمە هەڵکەوێ
دوژمنــی ژن هەڵــگرە، کێلای زەوی
وا ســـەرۆك مارە کران، بوونە هەوێ
حەز لە ئێکیشــیان بکەی، داناکەوی
ئەو ئەویتر ســوك ئەکا، تا ئەسرەوێ
جا کە باتــداوە، لەگەڵ ویش ناخەوی
ســا وەها چاکە بکەی بیرێــکی نوێ
بیــدە دوژمن، قوزفرۆشــانی کەوی
وەك کەری ناو ئێســتری جوو دانەوێ
تۆش بڵێ ئاخ سوێندەکەم خۆ هەر هەوی
بار بــە کۆڵ دادە، برۆ لێــرەو لەوێ
کۆکەوە زۆر کۆڵ بە شــانی پەل قەوی
ئەو حەلە، ئەی نــووری چاوم ناکەوی
ئەو دەمە، وەك خەو لە چــاوم نارەوی

من دڵ‌و دینم ئەتۆی، مەردی نکاو
من سەرو ژینم ئەتۆی، تیشکی هەتاو.
خونچەو میلاقی ئێمــەن، لەکتریك
ڕێوو ڕەز ڕووناك‌و، شـــارو دێ بلوور

کۆشک و یانەی مەن، چیاوو کاوو تیک
گیاووگژ پەرداخ و، ڕەنگی زەردو سوور
لەم سەری دونیات لەگەڵ کەم، زیکە زیک
لەو سەرت پێ ڕاگەیێنم، باسی دوور
گەر بەرەو ڕووی دوژمنانیش بووی خەریک
من هەوا ئەگرم بە باڵندەی جەسوور
کشتوکاڵی ئارەزووت، گەر بوو فەریک
داسی باڵامت ئەبەخشم، بێ قسوور
کۆکەوە، بیکێشەوە، مەگرە شەریک
مەرد بە، دانیشە، ببەستە سەر سنوور
هەر بخۆ، هەر بژیە، بێچوو بێنە ژوور
مێشک و دڵ پڕکە، لە زانین و لە نوور
هەر ئەتۆی بۆ من ژیانێکی تەواو
هەر ئەتۆی بۆ من دەوای جەرگی خوراو!.

(٣)

هێند لە عیشقی ئەو دڵارامەم بەسەر هات بەندو باو
گرتمی شەش ڕوو خەفەت، تا کەوتمە حاڵی گیانەڵاو
جەرگی دەرکێشام بە چنگ و، زوڵفی چەنگاڵی پڵینگ
هەر ئەگریەم زار زارو، هەر ئەناڵم تاو تاو
گەر لە جەنگی خۆشەویستیدا ئەپرژێ سەر، چییە؟
دڵ بە کەڵکی هیچ نایە، خوێن ئەڕێژێ ناو ناو
سەتڵ و جامی خستە دەست و، مەست و سەرکەش تێپەڕی
بیرو هۆشی دا بە شان و، نەرمە نەرمە چووە سەراو

باغی مەستی شادو پاراوە، لە چاوی گوڵعوزار
ماری زوڵفی وا لە مل هاڵاوە، ژانم چووە هەناو
یارمەتی گیانی نەدامو، لێی ستاندم ڕەنگو ڕوو
بۆیە ڕۆژو شەو کە ناوەستێ ڕژانی ئاوی چاو
سینە، ئاڵۆزی غەمو تاڵیو خەفەت بوو، پڕ برین
دیدە، پڕ تۆزو تەمی تاریکییە، جەرگم بڕاو
تێگەیشتم، پێگەیشتن قەت لە ڕێگەم ناکەوێ
هەر دەبێ زاری کەمو بشکێمە کاری ناتەواو
بەختی (پشکۆ)، گەر ئەزانی بۆچ پەرێشانو ڕەشە؟
زۆر لە دوو یاران گەڕاوە، چەشنی بازی ناشقەڕاو.

(٤)

سەر بەسەر ئەمشەو دەناڵم، پایەماڵو دڵشکاو
وا بەهتاو ڕۆحم دەگریێ، خوێنی ئاڵم دێ لە چاو
دوو برۆی دڵبەر، بە تەڕدی من کە شیربازی دەکەن
با بگریەم تا قیامەت، هەی لە خۆم جەرگی بڕاو
ئاگرێکم کەوتە دڵ، تا ڕۆژی مەحشەر دایەسێ
بەشکە ڕۆژی مەحشەریش، هەر وەك جەهەننەم دێ بەهتاو
گەر دەزانی بۆ دەڕێژم خوێنی جەرگم، بەم شەوە؟
تینووە باخی خەیاڵم، پێی دەوێ جانا! شەواو
جێگەیێکی تەنگە دڵ، تاریکە، بێ سوودو تەماع
بێیە سەیریشی دەبینی، عالەمێکی تێ خزاو
تێلی زوڵفت وەك تەلیفۆن، وا لە پێت ئاڵاوە سا
چاکە هەر بۆ مەرحەبا، جار جارە بێمە سەر هەلاو

ئــەی سوپاســالاری دڵــداری، لــە دەســتی عیــشقتا
عــەرزو حــاڵی مــن، هــەتا قــافی بــەقا نابــێ تــەواو
بۆچــی وا بــێ ئیلتیفــاتی، ئــەی ئــەمامی تازەبــەر
وا لــە ڕێــی تــۆدا، هــەمووم دانــا کــەماڵو ئــەنگو نــاو
کــاری (ڕاجــی) گــەر دەزانــی بۆچــی پــەرتی عالەمــە؟
وا لــە ڕووی تــۆدا دەســووتێ، غالیــەو موشــکو گــوڵاو.

(٥)

دڵ وەك دوەــەڵان پــڕ لــە خەفــەت، هەڵزەپــەتا بــوو
بایــەك لــە ســەراپەردەیی جانانــە پــەیا بــوو
چــاوی دڵو ڕۆژی ڕوخــی ئــەو، پێکــەوە ئــەنگوت
ئــەنگووتنو پــشکووتنو ســووتن، لــە پــەنا بــوو
هەرچی بــە خەبــەر هــاتو، ئەوی مــابوو لــە خــەودا
هــەر هێنــدە ئــەزانێ، بــە تەبــەق نــووری لــەلا بــوو
ئەو ســاتە کــە دیــم کــوڵمی، وەکــو تــافی ئەلــەتریك
دینــارو درەم گــشتی، لــەلام پەلکــە گــەڵا بــوو
چــاوم، کــە بــە چــەند ئایــەتی کوردانــە ئەنووســا
ســەد شــوکری خــوا، ڕوو بــە هــەڵێنانی ڕەوا بــوو
ڕەسمی خــەتو خــاڵی لەبەکــەی، لــەم دڵــی پــڕ شــۆڕ
هــەر ئێکــە، بــە پــەڕگاری بــرۆی مەرکــەزی نــابوو
(ڕاجــی)، کــە دڵــی پــڕ خــەمو فیکریــشی بەدیعــە
ڕادێ کــە کەســێ پەروەرشــی جــەورو جــەفا بــوو.

(٦)

وەختــێ لــە لــەبی یــارەوە، مــەیلی شــەکەرم بــوو
ئەمزانی لە هەر شەش جیهــەتا، هــەش بەســەرم بــوو

هەرچەندە کە ویستم لە تەمی عیشق خەلاسی
جاریّ لە دلاّ ئافەتو، جاریّ خەتەرم بوو
دانیشتووە مەحبووبە، لەناو سینەیی من دا
زانی کە بە ئەم قەسرە، لە دوژمن زەفەرم بوو
ئیمڕۆکە نەچووم بیکەمە سەد جێژنەیی قوربان
لەم بەندی جگەر، حیکمەتی سەرفی نەزەرم بوو
هەروەك هەدەفی جەبرییە بۆ تیری بەلاّ، دلّ
لایێ لە ڕوخا ئافەتو، لایێ شەرەرم بوو
تا زەوقی بەهەشتم هەبوو لەم مەیکەدە، یاران
نەقدی ثەمەرەبو شەوکەتو فەزلّو هونەرم بوو
ناوی هەبوو ئەو دلبەرە شیرینە، بەبێ شوێن
وەك من کە نەبوو ناومو شوێنو، حەزەرم بوو
نیوەی شەوی دوێنێ، شەوی مامم (حەمە قادر)
سۆزی لە هەموو ڕیشەوو بەندی جگەرم بوو
(ڕاجی) مەکە گریانو، لە خوّدانی نەسیریم
هێشتاکە نەبووم، ئەم خەتە نووسراوی سەرم بوو.

(٧)

دلّ لەبەر چینو خەتی سەر کولمە، ئاگرخوارە بوو
ڕووتو قووتی، هەروەکو مزراحی ڕەستۆن کارە بوو
کەوتە ناو چەرخی بە تاوی ڕوومەتی تابانی یار
بۆیە ڕەند ئاسا، لە قاپی عالەما ئاوارە بوو
سیپە کووری قاشی ئەبرۆی، بەو گولەی خالّو خەتی
وا لە جەرگمدا، عەزیزم، پەرتو پارەپارە بوو

دوو پەڕە ئەو مەسحەفی کوڵمەی نیگارم، سەربەسەر
بۆچی دڵ لەو دوو پەڕە، وا چل پەڕو سی پارە بوو؟
سینە پڕ دەردم لەبەر جەورو جەفای خاتوونەکان
بۆیە ڕووحی بێکەسیشم، تووشی ئەو ئازارە بوو
ئێستە پێم ناکرێ، هەناسەم، هاتوچۆکەی ساف بکەم
ئەو دەمەش وا دێتە بیرم، ڕوح لە دارە دارە بوو
(ڕاجیا) گەنجی خەمی تۆ، بەش دەکا تا ئاسمان
بەش دەکا، گەر عالەمی دونیا هەموو دووبارە بوو.

(٨)

دڵم سووتا بە جارێ، چلچرای سەر کوڵمەکەی هەڵبوو
بە دەم شاماری ئەگریجەی، شل و کول نێرگسی جادوو
چ خوسرەو کەوتە خانەی عیشقەوە؟ شیرین دڵی هێنا
چ فەرهادی قەوی پەیکەر، قولێنگی کەوتە سەر؟ دەرچوو
ئەڵێم: ئەی ئەونەمامی تازە چانراوی خەرامانم
بدە ماچێ، ئەڵێ: کافر بڕۆ لێرە مەوەستە توو
بە دەم سروەی سەبا، گوڵشەن بە سێسەد ئەنجومەن خەملی
دەسا ئەی بولبولی دڵ، تۆش بیابانی وەکو کووکوو
سەراپا هەڵقەیی زولفی لە مل هاڵاندو، دڵمی گرت
وتی: ئەم جۆرە ڕەفتارە نموونەی کارە، سا فەرموو
لە ژێر ئەم سایەبانەی پەرچەمە، وا ڕۆژی نیوڕۆیە
فیدای ڕۆژو شەوی تۆ بم، سیاخاڵەی کەوان ئەبروو
ئەوا پیشا لە ئاگرخانەیی عیشقا، دڵی (پشکۆ)
بە جامێ بێرە هانای، ساقیا! یا تارەکەی گێسوو.

(٩)

دڵ لــە دونیـــادا بــە دایــم، بێکــەس و دێوانــە بــوو
یــار لــە عالەمـــدا بــە کــام و خۆشـیـو نەفسانە بــوو
هەرچـی کــردم، ئاقیبــەت، بــردم پەشـیمانی لەســەر
بــەم نیـشانەی پیریــەم، ئیــشم هــەموو ڕەندانــە بــوو
خۆش، لە وەختـی ڕوومــەتت، ڕۆژو لـەبت چەشـنی مــەزە
نیـو گریـشمەت بـادەوو، دوو چـاوی ڕەش مەیخانــە بــوو
گــەر لــە یــادم چــێ، ئــەبێ کــافرم و دونیاپەرســت
ئــەو دەمــەی ڕۆحــم لــە لێــوا، حــەزرەتی پەروانــە بــوو
ئەم سبەینەی، دەس بەسەتڵ و جامی دڵ، چوو بۆ سەراو
ڕوح لەســەر ئــەوجی ســەری، تــاج و پــەری شـاهانە بــوو
نــەرم و شــیرین، لێــوی نــەختێ خــستە نــاز و هەمســەوە
دڵ بــە تــاوی تیـژی عیـشقی، سەربەسـەر دوندانــە بــوو
ئــاهی تــیرەی هــەوری مــن، کەوتۆتــە دەوری ڕوومــەتی[١]
دیــتم، هــەرلا، لەبــەر چــاوم مــەمە و خەرمانــە بــوو
جێگە مەشقم، گەرچـی دەشـت و شـار و زەریـەو بەر بووە
گــشتی بــۆ گیــانی حــەزینم، زەجــرو بەندیخانــە بــوو
کــەی ئەنۆشـم شــەربەتی لێــوی نیگــاران؟! چــونکە مــن
کــونجی خۆشـحاڵیم بــە دایــم، (ڕاجیــا)! وێرانــە بــوو.

(١٠)

دڵا! نایێتــەوە یـــادت کـــە یـــارت میهرەبـــانی بـــوو؟
لـــەلایێ بـــەزمی شـــاهانە، لـــەلایێ عەیـــشی جـــانی بـــوو؟

١- لەشوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (ئاهی تیرەی هەوری من، دەورەی لەڕووی ئەو دا بە هەم).

بە زوڵفی ساقییان قوببەی شوعاعی ڕوویی جانانە
بە تاری موتریبان دەستی بە خوێن ناڵو دەمانی بوو
لەلایێ پەردەداری بوو، لەلایێ بووکی زیباپۆش
لەلایێ تاوسی سەرخۆش، لەلایێ جان فشانی بوو
پیاڵە پڕ لە تارەقدا، بە نازی دڵبەران دەکشا
بە چاوی گوڵبەران دەخورا، نەعیمی ئاسمانی بوو
تەزیفەی جاریدانی بوو، حەسیبەی ئیمتینانی بوو
زەهییەی زیندەگانی بوو، بەدیعەی لامەکانی بوو[1]
لە نازو نیعمەتا جانی ڕەمیدەی بێکەسو زارم
لە پایەی کەمترین ژووری عەزیزی میسری سانی بوو
عەجەب زەوقی لە باوەشدا، دڵو دڵبەر کە بەسراون[2]
لە عالەم هەڵهەڵەی وەصڵو، لە(ڕاجی) هەم زوبانی بوو.

(١١)

خوایە بۆمان بنێری، ئاوی لە قوڕ نەنیشتوو
یا گەنجی پێگەیشتوو، یا پیری تێگەیشتوو
ئەم کۆمەڵە هەژارە، چەندیشە ئینتیزارە
بە چاوی خۆی ببینێ، بەردی بە بیر قەڵشتوو
هیوام لەم قەومە گشتی، دوورە، چونکە سەد پشتی
کەسێکی سەربەست نییە، دیلیو ستەم نەچێشتوو
کۆمەڵ بە تێکەڵاوی، لە کامی جێدەمێنێ
لە ساردو گەرمی ڕۆژان، قەسریوە یا برشتوو

١ لەشوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (سەفایی زیندەگانی بوو، بەدیعەی لامەکانی بوو).
٢ لەشوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (عەجەب زەوقی لە ئاغووشا، دڵو دڵبەر موقەییەد بوون).

خەلکی، لە ڕوو چ بەرزە؟ مشووری خۆی دەگێڕێ
ئێمەش هەموو خەوالووین، بە ئابڕوویی ڕشتوو
نێزیکە مەرگی کۆمەڵ، بەبێ دەرمان و دوختۆر
هەی کاکە تازە ناژی، بە شێخ و سیحرو نوشتوو
هەتیوی بێ براو باب، قەت نیشتمانی نابێ
حەزی لە مێردە دایکی، نایکا لە دوو شوو پشتوو
تەبیاتی هەر لە ژینە، بێ ڕەنی و داب و دەستوور
بیری جەماتی ناکا، هەتا نەچێ لە خشتوو
چەند خۆشە ڕۆژی ڕووناك، (ڕاجی) بڵێ " دلاوەر"
بروانە نیشتمان پڕ، لە قوربانی و لە کوشتوو.

(١٢)

عەزیزم، وەختی گوڵ هات و بەسەرچوو
منالی وەسڵ ناکام بوو، لەبەر چوو
سەبا نەیخستە دەستی بەندی شادی
بە لایا، بۆیە گیانی پڕ خەتەر چوو
ئەوی هات و، چرای تەعزیەی دیتی
بە تاریکی زەلالەت، بۆ سەقەر چوو
بڵێ بەو چاوە سا پەیمانە پڕکا
ئیتر خێرابە، وا گیانم هەدەر چوو
کە خۆی هاوێتە سەر کوڵمەت، دڵی من
لە شەرمی، بۆ تەمای سەرفی نەزار چوو
بە ئەو ماچەی کە کردم دوور بە دووری
بە خۆشی، بۆ هەموو مەستان خەبەر چوو

کــــە کەوتـــە چـــینی نەگریجـــەت، تـــرازا
دڵی من، ئەی عەجەب، چۆن بێ مەفەر چوو؟
نیگـــاری دڵـــڕەقم، چـــی لـــێ نەپرســـی
دڵــم گەرچـــی بـــە خوێنـــاوی جگـــەر چـــوو
بـــڕۆ (ڕاجـــی)، لـــە عیـــشقا دامەمێنـــە
لەســـەر مـــەولا، ئەگـــەر هـــاتو، ئەگـــەر چـــوو.

(١٣)

ئـەو دوژمنـــە ســـەگبابە، لـــە یـــارا بـــە نـــەزەر چـــوو
ئەو سەرکەشە مەحبووبە، لە دوژمـن بە سـەمەر چوو
ســەیریکە لەســـەر ســککەیی ڕووی، تـــوڕڕەیی زوڵفـــی
بۆ دەستی منـی خستە، لە لێوم بە هـەدەر چـوو
مـــەیلی کەمـــەرم چـــونکە لـــە دڵ پـــڕ جەوەلانـــە
هـەر مـوویی نیگـاتم لـە عەجەبدا، بـە کەمـەر چـوو
سەرکێشە لـە ئـەم دائـیرە، بـۆ مەرکـەزی ئیحـسان
یـارێ، کـە بـەلای عاشـقی مـسکین بـە سـەفەر چـوو
وەك شـوعلەیی ڕەخـشەندە، لـە سـیلابی ڕیفاقـەت
دڵ هاتـە نـەزەر وەســـڵتو نـەیزانی لەسـەر چـوو
ئیمـــڕۆ، کـــە زەدەی نەشـــتەری جـــەللادی بـــڕۆتم
خـوێنم بـە حەرەمخانـەیی موشـتـاقی جگـەر چـوو
لـەم حوجرە کـەوا کـەوتووی (ڕاجـی) بـە خـەیالات
تـووتی دڵەکـەت وایـە، لەبـەر مـەیلی شـەکەر چـوو.

(١٤)

جـێگیرە لـە بـاوەش، خەفـەتی دڵبـەری جـادوو
ڕامـم نییـە، ڕاکردویـە، هـەر وەك ڕەمـی ئـاهوو

وەختێ بە خەیاڵاتەوە، سینەم پڕی ژارە
وەختێکی لە دوو لێوی، لەسەر لێومە کاهوو
دیدەم پڕی لالەو سەمەن‌و خونچەوو باغە
پنجی گوڵە جۆریشە، بەناو کونجی دڵا چوو
چیدیکە مەڕەنجێنە منی بێکەس‌و ڕیسوا
پنجیکە دڵم، بەو مەیی سەر پەنجەوو بازوو
سەر، بێت‌و بە قوربانی تکەو شەونمی کوڵمەت
گیانم بە فیدای نێرگسی دوو چاوی خەواڵوو
نەوتوولی قەدی، کاتێ بە سەد لەنجە ئەڕسکێ
ئەشکێتەوە باڵام‌و، ئەترازێت پەراسوو
(ڕاجی)! سەرو ماڵ‌و، دڵ‌و دین‌و، ئەدەب‌و ژین
هەر قیمەتی ماچێکە، بە کێش‌و بە تەرازوو.

(١٥)

ئەی ئەسەف، بازاڕی من سەد ساڵە هەر نەیبوو برەو
تاقە ماچێکم نەبوو قازانجی ئاهی نیوەشەو
چونکە یاری دڵڕوبا، بۆ من‌و ڕەقیب مەیلی نییە
من ئەوا بووم غەرقی ئاه و ناڵەوو، ئەو بوو جدەو
هەی بە قوربانی مەمەو سینەی بلووورت بم، کەوا
کاژی سیمینی تەڕە، وا نازک‌و نەرم‌و پتەو
من بە بێداری ئەگێڕم خوێنی نابی جەرگی خۆم
تۆ ئەکێشی نێرگسی جادوو، کە چاوت کەوتە خەو
چۆن سەبا دەسگیری مەقسوودی نییە، بەو پەرچەمە؟
لەو نمایی تەلعەتە، نەختێ کە بۆی شل کا جلەو

شێخ، ئەگەر هەقناسە بۆ ڕێی عیففەتو حەققولیەقین
بۆچی وا بێباکی سۆفی ملهوڕو مەستو قەڵەمو؟
خاکو خۆڵە خەرمەنی (ڕاجی)، لە وەسڵی دڵبەرا
دانەیێکی تێ نییە، گەر بێتو بیبێژن بە کەمو.

(١٦)

دڵم، بێ یارو بێ قەرداشە ئەمشەو
وەکو چاووشی بێ شاباشە ئەمشەو
خەیاڵو تاوی چاوم، سەر دەگێڕن
چ سەر؟ تاشێکی پڕ باراشە ئەمشەو
ئەمن مەحرووم‌و، دوژمن شادی دڵدار
کە هەر جێژنی سەگو داڵاشە ئەمشەو
ئەگەرچی چاوەکەم پڕ خوێنی ئاڵە
لە تاوی یارە، بێ بیناشە ئەمشەو
غەرەز، پڕ بوونی دنیایە لە هاوار
هەتا ئاهی حەزین هەر باشە ئەمشەو
مەپرسن حاڵی دڵ، ئەی یارو ئەغیار
ئەخۆش‌و زارە، هەم ڕیسواشە ئەمشەو
سەعاتی بەختی سەختم، بێ عەمەل بوو
چ جێی میقاتو پێش‌و پاشە ئەمشەو؟
لەبەر زەهری هەلای دووری عەزیزان
دڵو سینەو تەنم خشخاشە ئەمشەو
بەری بێ تاقەتی بوو، ئاه و شیوەن
ئەگەرچی باغی من ساواشە ئەمشەو

لــه خانــەی دامــەو، شــەترەنجی وەســڵی
شــەهم بــێ بەیــدەق‌و، بــێ داشــه ئەمــشەو
بــه ڕەنگــی ئەشــك‌و ئــاهی نوكتەســەنجی
دڵا (ڕاجــی) عەجــەب نەققاشــه ئەمــشەو!!.

(۱۷)

ئــەنێرم بــۆ نیــسارت لــەعل‌و یــاقووت‌و گوهــەر، هــەر شــەو
ئەڕێــژم، یــەعنی فرمێــسکی دڵ‌و چــاوو جگــەر، هــەر شــەو
نیگــارم تــا بــه تەصــویری خــەیاڵی، بێتــه بــەر چــاوم
لــه ئاغوشــی ئەكێــشم، ئەیــژم وەك نەیــشەكەر، هــەر شــەو
منــی تــەن خەســته بێكــەس، دائیمــا زاری ئەكــەم، یــاران
ئەویش عوشرەت بەكامی خۆی دەكا تەوق‌و كەمەر، هەر شەو
دەروونم وەك جەهەننــەم داخــرا، دڵ چــونكە موســلیم بــوو
لەوێ دەرچوو، بە كۆی تۆدا دەكـا گەشـت‌و گـوزەر، هـەر شـەو
بــه دەردی بــێ دەوا گــیرم، بــه مەقــصەد ناگەمــه لوقمــان
منم حەیران‌و سەرگەشتە، لە ڕێــی خەوف‌و خەتـەر، هـەر شـەو
بــه گریــانم دەكــەم بــازی، كــه ئەشــكم شــوعلەبازی كــرد
لەگەڵ زوهرەو، سوورەییاو، موشتەری‌و دەوری قەمەر، هەر شـەو
عــەجایب عاشــقێكم، ســاعەتێ خــاڵی نییــه قــەلبم
وەكو(ڕاجی) ئەخوێنم شیعری پڕ شەككەر لەبەر، هـەر شـەو.

(۱۸)

لەسـەر گەنجی ژیـانی مـن، دوو زوڵفـت هـەژدەرە ئیـمشەو
بــه فــەوتانی دڵــی زارم، نیگاهــت یــاوەرە ئیــمشەو
دوبینــێ ڕووت  كــه نــووری خەسته نــاو فانۆســی چــاوانم
دەروونم ئــاگری ســەندو، لەشــەش لا ئــەنوەرە ئیــمشەو

لەسەر بورجی ستارەی پایە بەرزیتا، نیگاهێکت
لە ناو گەردوونی سینەمدا، قولاپ و میحوەرە ئێستەو
سەرم پڕ جۆشی دیدارە، دڵم پڕ دەردو بیمارە
بە نازێکی تەبیبانەم بکە دەرمان، وەرە ئێستەو
لە چاوم گەوهەرو یاقووت ئەبارن، چاخی گریانە
لە لێوت پێکەنینەو، هەر تریسکەی ئەختەرە ئێستەو
جەفاو نازەکەی ڕۆژت، چ قەوما، کوشتمی ئەی داد!!
بە هەرجێ دڵ ئەبینم، زەخمداری خەنجەرە ئێستەو
بڕۆ بە خوام سپاردی، هەرچی بۆ دڵ چاکە، بخوازە
سەری فەرمانبەری (ڕاجی)، لە قاپی دڵبەرە ئێستەو.

(١٩)

ڕۆحم لە بەرابەر نیگەهت بادەمە ئێستەو
گەر سەرفی بکەم ماڵ و دڵ و دین کەمە ئێستەو
هاتوویە تەنیشتم، بە هەموو نەشئەو شۆخیت
بروانە لە هەر لاوە، ڕەقیبم خەمە ئێستەو
ئەی سەروی بڵند قەددو لەتافەت لەبی دڵجۆت
هەرچەندە لە خزمەت بکەوم، هەر کەمە ئێستەو
دووری منی دڵ خستە لە دیدەت، کە دەمێ بوو
هەر قەدرو بەراتی منە، بۆ عالەمە ئێستەو
هەڵمەتە، بە چاوی بەڵەکت مەجلیسی زەوقە
مەستیو تەرەب و جیلوە، هەموو هەمدەمە ئێستەو
قەیدی چییە! هەر عادەتی جانانە نیازە
گەرچی لە دڵت خۆشە، کزەی ئەم دەمە ئێستەو

تا ئێستە لە سەر دڵ، سەری داغی ئەلەمت بوو
ئێستاکە لە سایەی چەمەنت جیلوەمە ئیمشەو
شایانە، دڵم ئێستە لە تەندا کە نەگونجێ
بۆ ئەو کە لەسەر خەڵق، ویصالت زەمە ئیمشەو
دەردو ئەلەمو قەسوەتو گریانو جەفا چوو
(ڕاجی) بکە شوکرانە، سەفای سینەمە ئیمشەو.

(٢٠)

ڕەونەقی حوسنی تکاند، نەرگسی دڵداری ئەو
قیمەتی پیری شکاند، شێوەیی بازاڕی ئەو
ڕاستە بەلافو گەزاف، هاتە دڵی عاشقان
لەشکری تاتاری یار، نێزەیی خونباری ئەو
بۆچی نەبا هۆشی من، بەم سیڕی مەجنوونییە؟
کونجی گوهەرباری ڕووی، زوڵفی سیەماری ئەو
داغی گوڵو گوڵشەنە، خەندەو گرژینەوەی
موقتەبسی نووری هەق، کوڵمەو ڕوخساری ئەو
جێگەخەوی دۆزەخە، ئەم دڵی دینداری من
جێی خەتەری جەننەتە، زوڵفی گونەهکاری ئەو
قامەتی دەگرێ گەلێ، میوەیی شیرین مەزاق
جگ لە شکۆفەی گوڵو، لالەیی بیماری ئەو
یار بە ئەلتافی خۆی، گوێ کە لە (ڕاجی) نەکا
دیارە لە عالەم چ کەس، نایەتە هاواری ئەو.

(٢١)

سەر لە دو یاران ئەکێشم، بەم دڵو جەرگی ڕزیو
ئەیکەمە شیرازەیی هەوزی بەزیوو دابەزیو

هەر گەلێك، هاتو لەگەڵ خزمی نەفامی تێكڤڕا
چارەیی ناكا لە ژین، فیڵو سیلاحو زێڕو زیو
ئاگری مەرگی گەلی كوردانە، هەر دانامرێ
وەك ڕقی ئەسفەندیارو، ڕۆستەمو زۆرابو گیو
ڕۆژو شەو ئەگریم لە تاوی قەومی بێ پێشچوونی خۆم
وا لە دەرگەی دوژمنو بێگانەدا، بوونە هەتیو
من هەناسەم بۆتە غازی موخنیقو، ئاهم تفەنگ
دڵ لەسەر ئەو لەشكرو ئاقارە، وەك بۆمبا تەقیو
تا ئەبوومە جەربەزەو، باری غەمی تۆم هەڵئەرشت
نەمئەزانی ئەی وەتەن، بۆ خەڵكە دۆخینت بەزیو
وەك حوبارا هەر دەسووڕێم، ناگەمە هێلانەكەم
جێ هەواری پارە چۆڵو، خانەیی بەختم تەپیو
خۆت بنانە ئەی گەلی ئاوارە، بێ شوێنو ڕەوشت
چاو لە دەس بێگانەكانو، دڵ بە خوێنخۆریت جەیو
سافە (پشكۆ) جیسمی پاكی، سەر بە پێ یەك ڕەنگییە
ڕۆژو شەو سووتانە كاری، بۆ گەلو كووڕەی دەفیو.



- ۆ -

(١)

ئەی خودا، بۆچی نەچوومە بنەبانی گوڵەبۆ؟[١]
بەشکە سا بێمەوە سەر دەورو قومارو پەلوپۆ
هەر کەسێ دەردی لە مل بەستووە، زنجیری خەفەت
پێی بڵێ: خاڵە! لە ئەم چاوەیە دانیشە بخۆ
ترش‌و تاڵە بەدەن‌و، شێوەیی شیرینی نەوێ[٢]
ئەی دوو لەب وشك‌و ڕەقا، هەستە زمانت کەڕەفۆ
کێیە گەر دەبدەبەیی دەردو بەلا نەیگێڕێ؟
گەر پیاوی لەسەر ئەم چەرخە ئەتۆ ماوی، ئەتۆ
مەشقی خاڵ‌و خەتی ئەو دڵبەرە، ئیمڕۆ چ دەکا؟
بادەیێکم کە بە دەس ناکەوێ، چیمە لە سەبۆ؟
من زەمانێکە لەگەڵ ئەو گوڵە بێباکە ئەڵێم
ماچێکم لێ ئەستاند، سا بە سوێندو بە درۆ[٣]
هەر نەپشکوتووە هێشتاکە گوڵووکی دڵەکەم
هەوەسم بەر ڕەشەبای پایزی داوە، بە خەڕۆ
شێخ، ئەگەر هاتو وەکو زاهیدی ڕیش لۆکە وتی:
لادە لەم ڕێگە، بڵێ: هەستە ئەتۆ چیتە تڕۆ؟
(ڕاجیا)! هەر مەسەلە حیکمەت‌و شانێکی هەیە
جاهیلی ئەحمەق‌و کەر، بەسییە ئیتر خەرمەنی جۆ[٤]!!.

١ لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (ئەی خودا، بۆچی نەچوومە بنەبانی دڵەڕۆ؟).
٢ لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (بەدەنی تاڵ‌و ترش، شێوەیی شیرینی نەوێ).
٣ لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (بۆسەیێ لێم ئەستاند. سا بە سوێندو بە درۆ).
٤ لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (ڕاستە گەر جاهیلەکان، چوونەتە سەر خەرمەنی جۆ).

(٢)

عەجەب هاتۆتە بەرچاو، شارەکەی کۆ
نواندی سەوزو سوور، گوڵزارەکەی کۆ
خەفەت جێگەی نەما، دڵ بەهرەوەر بوو
کە دانیشتم لەسەر ڕووبارەکەی کۆ
کە ڕێگەو بانو سارا، تون بە تون چوون
کەیف خۆشم، لەگەڵ تازارەکەی کۆ
سەرایی مردنیشمو، ژینەوەیشم
قوڕو کوڵانو مێرخوزارەکەی کۆ
ئیتر تا ڕۆژی مەحشەر بەردەبازم
سەبارەت چاوەکەی دڵدارەکەی کۆ
تەنم بێ هێزە، گیانیشی ستاندووم
سەرو زوڵفی، بە فەندی، یارەکەی کۆ
دەکەم گەردوش، لەناو باغو مەزاران
کە ماڵی هەقمە، نێرگسجاڕەکەی کۆ
بە تاجی (خوسرەو)ی نادەم، وە یا (کەی)
سەری یەك موو، لە باغو دارەکەی کۆ
وەرە (ڕاجی)، بە نەشئەو پێکەنینت
بە یادی نێرگسی خەمارەکەی کۆ[١].

(٣)

ئەی سەروی بڵند قەددو لەتافەت لەبی دڵجۆ
پاداشی گوناهی منە، گرتوویەتی ئەستۆ

---

١ لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ: ( وەرە (ڕاجی) بگرین هەم تەرەب کە لە مەیخانەی دەرو دیوارەکەی کۆ ).

تووبـا ، چ دەبـێ لـەو قـەدو باڵایـە بترسـێ؟
یا سەروی ڕەوان چی لە قەدە، بیخەرە سەر گۆ!!
ئیمڕۆکە تـەجللایی دوو چـاوە، لـە دوو عالـەم[1]
ئیمشۆکە پـڕی مەیکەدەیـە، جونبوشـی شـەوبۆ
بـێ مەرحەمـەتی بەسـییەتی، مـردم لـە فیراقـا
سا هەستە لەڕووی لوتفەوە، ماچێ دە لەسەرخۆ
بێ لەعلی لەبت، مەیلی بەهەشتم نییـە قوربـان
بۆ سووتنی دڵ، جگ لـە ڕوخت بۆچمە پشکۆ؟
تـا شـاهیدو سـاقی، لـە دزەی جـامی دڵانـن
هـەر جـۆرە زڕەی گیانـە، لـەژێر پاوەنـەیی تـۆ
تـا عیـشق زەدەی پەنجـەیی شـاهێنی دوو چـاوە
بێباکی شـەپۆلی غەمـە، (ڕاجـی)و دڵـی شـەتۆ.

(٤)

دەروون پـڕ دەردو، ئـاهم گەرمـە ئیمـڕۆ
جگـەر بـرژاوە، - تـا- یاوەرمـە ئیمـڕۆ
هیلاکـی هاتوچـۆی دەرگـەی حەبیبـەم
لـە بێـدادی، حـەیا، پـێم شـەرمە ئیمـڕۆ
سـەری سـووك هـەڵبڕە، پـڕ بێنـە جامێ
کـە دەردی بـادەیی ئەحمەرمـە ئیمـڕۆ
لـە سـووڕانا، بەچـەی زەنگـین خـەتو خـاڵ
خـەیاڵی مـن سـوپای سـۆجەرمە ئیمـڕۆ

---

٢ لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (ئیمڕۆکە تەجللایی شەرابە، بە دوو عالەم).

هەموارم کۆنە بوو، دەرکی ڕوانـدن
ئەمیش باعیس بە مووی دڵبەرمە ئیمڕۆ
کە ڕاوەستا بە شۆخی، یاری ڕەعنا
وتم: ئەی دڵ بڕۆ، مەحشەرمە ئیمڕۆ
بەدایع سەنعەت و غەمزەی دڵ ئەنداز
لە کونجی سینەدا میحوەرمە ئیمڕۆ
لەبەر غەمزەت، کەوانی ئەبرووانت
کەمینی دوژمنی سەر سەرمە ئیمڕۆ
چلۆن (ڕاجی)، ئەبم غەرقی هەلاکەت؟
فەلەک زڕ بابە، غەم مادەرمە ئیمڕۆ.

(٥)

جاریە ئاوی چاوی من، دیجلە بە دیجلە، جۆ بە جۆ
بەندی دڵی شکاوی من، گشتی پساوە لۆ بە لۆ
جان بە هەوایی سەر دەچێ، بۆ قەدی خۆش کەمەر دەچێ
بێ دڵ و بێ جگەر دەچێ، گەرچی گەڕاوە کۆ بە کۆ
سونبولی زوڵفی هاتە ڕوو، ئەژدەرە کەوتە هاتوچوو
مەعدەنی گرت و زوو بەزوو، حەلقەیی داوە هۆ بە هۆ
مەرهەمی لێوی شەکەرە، ئەم دڵە تا قوڕ بەسەرە
پڕ خەفەت و بێ مەفەرە، هەر کەفی خاوە شۆ بە شۆ
گەر دەسەڵاتی دڵبەرم، بێ لە لەبانی دڵبەرم
دەستی لەعل ئەکەم سەرم، بێتە جەفاوە گۆ بە گۆ
جانی عەزیزەکەم ئەتۆ، مەمکوژە بەسییە جوستوجۆ
نەرمییە کاری گفتوگۆ، شەڕ چییە؟ داوە خۆ بە خۆ

خاتری (ڕاجی) بکە جەمم، جامی لەبانی بخە دەم
چیکە لەدەستی مەبە ڕەم، کاوە بە کاوە، پۆ بە پۆ.

(٦)

ئەمدیوە لە مێژووی مەجەس‌و ئاریو هیندۆ
ئەم جۆرە گزەو دەبدەبەو کردەوەیی تۆ
زولفت چ بەلا، خەت چ خەتا، خاڵ چ خەیاڵە؟
چاو ڕەشبەڵەکی سیحرە، لە دوو یەکشەوە ئەبرۆ
ڕۆژێ، بووە هۆی کردن‌و، خەوتن لە شەو ڕۆژ
تۆ کردتە دوو ڕۆژو، خەوت بردەوە بۆ خۆ
گشتی خەڵەتن مارکس‌و، نیشتاین‌و، گۆرینگ
سوقرات‌و، دیموقرات‌و، فلاتوون‌و ئەرەستۆ
وتیان: فەلەکی خاک‌و ستارە کە لە ڕۆژن
کوزبوونە کە لەم خاکەیە دوو ڕۆژی ڕووناۆژ
بەم پورتەوی تۆ، هەرچی عەناصر هەیە سووتان
دونیا بووەتە کانی ئەلەکتریک‌و سپرتۆ
هەر باسی هەیوولاوو، شتی (لا یتجزأ)
دوو جوزئی بەیەک تێکەڵ‌و، نیسبەت بە کەم‌و کۆ
هەر یەک هەیە بیکاوو، بزانن بە هەموو لا
ئۆکسیدو پرۆتۆن‌و ئەلەکتر بە پیانۆ
من خۆم کە نەناسیوە، خوای خۆم چ بناسم؟
مردم بە جەفای عیشقت‌و، کەوتم لە پەل‌و پۆ
داماوی هەزار بیرە شەڕو ئاوە، ژیانم
نادانی بە تاوانە، لەگەڵ سۆزشی پشکۆ

ئەمبوو سەنەمو، یاسەمەنو، سونبولو، سەوسەن
ئەمدی هەوەسی چاوی ڕەشو، گەردوشی شەوبۆ
سیحرو هەڕەشەی ڕووسو فەڕەنسەو، ئەمەریکاو
ئینگلیە، لەگەڵ موسلیمو جوو، هەر کەسە بۆ خۆ
ئەم قاڕەیی ئاسیایە، کە ئاسیاوی بەڵایە
هەر کەس بە هەوایێکی ئەگێڕێ، بەسەری تۆ!
دونیا بە قومارخانەیی ئەم جانەوەرانە
دەستچێنی ئەوان: شێخو، بەگو، ئاغەوو، میرۆ
قوربانی قولینچکێکی وەتەن، لەندەنو تۆکیۆ
واشنتنو بەرلینو، نیویۆرکو مۆسکۆ.



- ی -

(١)

چەرخت لە منی غەمزەدە کردۆتە نەهاتی
جارێکی بەسەردانی دڵی خستە نەهاتی
وا تۆ دەسەڵاتت هەیە، بۆ شاھ و گەدایان
بۆچی لە هەواخوازیی من بێ دەسەڵاتی؟
جارێکی نەبوو پێکەوە بێن، مچ مچ و، دەم دەم
وا دیارە ئەمن دەشتیو تۆ بوویە قەڵاتی
دەستم کە نەگا دامەنی یاریست بتەکێنم
پێشکێشت نەکەم بیرو خەیاڵم، بە قەپاتی
هەڵدێن درو دەعبا، لە کەلوی گوڵ، کە تۆ هەڵدێی
وەك نانی هەڵاتەم ئەمنیش، تۆ کە هەڵاتی
چەند ساڵە لە ئەم دەرگە دەحەوکێتەوە دیدەم
نەمدی نە وەنەوزێکی، نەسەبری، نە سوباتی
یارم کچە کوردێکە، لەماڵم کە دەکا ڕاو
ڕاونانو جنێوانم ئەداتێ بە خەڵاتی
جارێ نەبوو، تێری بمژم لێوو دەمو مەم
جارێ نەبوو، باوەش کەمە مەیدانو مەزاتی
چەند خشتو خڕو ناسکو ئاودارو بەسۆزە
چەند خۆشە قسەو خەندەوو دیدارو جەماتی
خەڵکی، کە بە پارە دەگرن باخچە بە ساڵان
من ماچی زەمانگیرە گیانم بە سەعاتی
ئەڕوا بە هەوای، هەڵئەوەرێ گوڵ، بە هەموو ڕوو
پاسی سەفەرم بەستو، غەمم خواردو خەباتی

ئـەو دێـتو بـە مـن پێدەکـەنێ، دوڕ ئـەڕژێنێ
مـن لـەعلو گـوڵی ئەشـك ئەڕێـژم لـە جیـاتی
(پشکۆ) کە ئەڵێی سـووزی دڵـی، کوورەیی عیشقە
چـی داوە لـە تۆفـانو، لـە نـووحو لـە نـەجاتی؟!.

(۲)

خـوێن ڕژاوی دڵ لـە ڕێگـەی نیـشتمان، ڕۆژڕێـەتی
هەرچی شیوەن کـا لـە هاوخوێنـانی گـەل، بـۆ خۆیـەتی
خونـچە خەنـدەی دا بـە دەم، بێباکـە لێـوی هەڵـدڕا
هەرچـی دەم دووڕواوە چـاخی مـوزدو وەردو شـۆڕیەتی
مـەی بە ئـابووری ئەنۆشـێ، دیـدە تێکـەڵ ژیـن ئـەکا
دڵبـەری شـیرین گیـان، پـەرژینی ڕەنـگو بۆیـەتی
وا گەلاوێـژم هـەڵاتو، زوزەنـەب پـڕ پـێ هـەڵات
کـاری هەڵکێـشانی بـیرە، دوو تـەرازوو کۆیـەتی
بـۆ گـەلی ئـاوارە، ئـاوی گـوڵ گەشـیی ڕۆژو شـەوە
بـۆ گـەلئامۆژی لـە هـەر مەیـدان، ئـەوا هـۆ هۆیـەتی
مـەی، بـە بـەزمی کۆمـەڵو گۆینـدە زیکـەی سـەربکا
پاسـەوان ئەسـتێرە بـێ، دڵ خـاوەنی شـەوبۆیەتی
حـەوت ڕووبەنـدە کـە خـول دەن، نۆکـەری بـەزمی ئـەون
عونـسورو سـێ ڕۆڵـە بەخـشین، ئاسمـانیش گۆیـەتی
ئـەم گەلاوێـژە، بریقـەی خـستە ئافـاقی ژیـان
ڕۆژو شـەو بـۆ پـەروەرش، نوورێکـە هاموشـۆیەتی
هـەر برینێکـی جگـەر، زوخـاوی لـێ ئەتکێتـەوە
ڕۆژی مـەرگی بێکەسـیی، ئۆبـاڵی مـن بەسـتۆیەتی

هەر کەسێ سەرخۆشی جامی هۆزە، وازی ڕوویەتی
دانەیی سووررو سپی مەی، تاقەتی تەژنۆیەتی
تا بەسەر کاری هونەر، وەستاوە بۆ هۆزی بەکوڵ
ئاگری نەورۆزی بەختە، (ڕاجی) یو (پشکۆ) یەتی.

(٣)

باسی کوڕو کچ باری، وەك دانەیی مرواری
کوڕ مەرحەمەتی باری، کچ زینەتی ناو شاری
کوڕ خاوەنی دیوانە، وەك شاهی سولەیمانە
کچ مەرهەمی جانانە، بۆ یاری یو دڵداری
کوڕ مەردی شەڕو شۆڕە، کچ گەنجی دەق و مۆرە
کوڕ سەڵتەنەتی زۆرە، کچ بۆتە شەهریاری
کوڕ شێرە بە سەرمەستی، کچ بازە بە سەربەستی
کوڕ نەقدە لەسەر دەستی، کچ ڕەونەقی بازاڕی
کوڕ چاوی خودا بینە، کچ ئاینەیی ژینە
کوڕ دڵدەرو گوڵ چینە، کچ باغە لەبەر زاری
کوڕ عاشقی لەیلایە، مەیلی قەدو باڵایە
کچ نیعمەتی مەولایە، ڕەحمەت لە کەسوکاری
کچ شەمعی شەبوستانە، کوڕ بۆی بووە پەروانە
کچ کەیفی لە سووتانە، کوڕ بێتەوە دیداری
شیرین، کچە، شازادە، کوڕ خوسرەوو فەرهادە
کچ لەشکری بێدادە، کوڕ بۆتە عەلەمداری

تۆ شاعیری فەننانی، (ڕاجی) کوڕی مەیدانی
سەودای کچی کوردانی، سا بیدە پەلاماری.

(٤)

وەتەن! بۆچی لەگەڵما، هێندە بێ ڕەحمو جەفاکاری؟
ئەڵێی بۆ پێوەدانی جەرگی من، شەوگەردو ڕەشماری
دەمێ نەمدی خەرامان بێیە بەر چاوانی خوێناویم
پەلامارت بدا نەختێ، دەسی یارانە بۆ یاری
مەگەر مەیلت لەگەڵما هەر نەماوە، بۆیە تۆراوی
لە دەستو باوەشی خەڵکا هەژاری، بۆیە بێزاری
بە بۆی خونچەو گوڵو ڕەیحانو بەیبوونو بنەوشەکەت
مەگەر بووژاوەوە لەو ڕۆخی پەرژینەت، بە ڕێبواری
بە ئەم نازو گریشمەو لەنجەو لارەت، بە شۆخی، تۆ
لەگەڵ دوژمن تەڕو شیرین، لەگەڵ من وەحشو لاساری
تکای ڕۆژێ ئەکەم، بەم سۆزەوە، گەر بێیە باوەشما
لە دڵ بکوژێتەوە بەشکو بڵێسەی بانگو هاواری
وەتەن، دایکی بە شیرو شینو بێ شوو بوو، هەڵگیرا
برۆ بەدوای کەوە (ڕاجی)، ئەتۆش هەر بێ کەسوکاری!!.

(٥)

دینەمۆی دڵ کەوتە کارو، جەرگە بۆتە پاتری
بۆ مەکینەی جیسمی ئێمەن، زوڵفو پەرچەم، وایەری
کۆیلو دیلکۆی هەناوم، بەم هەناسانەی پلاک
ڕۆیوە تەقسیمیو هەردوو پلاتینی وەری
ئەم ترونبێلی خەیاڵەم، لەم دەرە پەنچەر بووە
بەو هەموو خاڵو خەتو ئالاتە، هەر تۆی فیتەری

گەر لە ڕێگای عیشقدا چا بێتەوە، پەیمان نەکا
جگ لە تۆ، هەڵنەگرێ جندو ئادەمیو حوورو پەری
ئاهی تیژم هۆڕنی دەبڵە، لە ڕێم لادەن ڕەقیب
نەیمژێ تا خوێنو خوڕتان، کارەبای ئەسکەندەری
خانەیی بەنزینو ڕۆنی، هەردوو سووتان دوور لە ناو
مەستی کرد ئەو سائیقەی چاوت، مەیو جادووگەری
شەفتو سپرینگی شکا، ڕینگی پسا، تایەی تەقی
وا لەبەر ئەم سوورەتاوی کوڵمە بوومە هەمشەری
بێ کلاچو، بێ جەلەو، بێ سلفو ئیستۆپو گلۆپ
کاری دڵ یەکدەم کرا، لەو سەیرو ڕاوە بووم بەری
کێ هەیە (پشکۆ) وەکو تۆ، سوورو سووتابێ لە عیشق؟
هەر وەکو ئیمڕۆ لەسەر خۆت کردە تاپۆ شایەری.

(٦)

جاحێڵییەکەم لەم خەفەتە، گەیوە بە پیری
هێشتا گوڵەکەم، جەورو جەفا نەچووە لە بیری
ڕەشتاڵەیە، شیرینە، چ خوێنگەرمە، چ دڵکێش؟!
بەو پەرچەمە، ڕۆحو دڵی بردم بە ئەسیری
خاڵی سەری لێوانی هەموو گەنجە لە ڕووما
خاکی دەری ئەو دڵبەرە نادەم بە وەزیری
عومرێکە، لەگەڵ عیشقی تۆ من بوومە برادەر
ساڵێکە، لەبەرچی تو خودا لێمە[1] زویری؟

١ لێمە: کورتکراوەی (لە ئێمە).

بەو پەرچەمو ئەگریجەیە، بمنوێنە لە باغان
بەو ئارەق و بادەو مەیە، بمشێلە هەویری
بەو نازکیو نەرمییە، تۆ زوبدەیی جانی
بەم تورت و تەڕیو گورجییە، تۆ سەلکە پەنیری
لەو بەندو مەقاماتی جەفاو هەڵخەڵەتانن
تۆ بوویە ئەبوزەیدو، منیش بوومە حەریری
تاکەی؟ لە دوای بادەیی خاوی تۆ بە جوستی
ئەسرین بڕژێنم، بە دوو سەد شێخی جەزیری
لەو مەجمەرەدا زاهییە (پشکۆ)، کە گەشاوە
دلگەرم و بە سۆزو کوڵە، وەستاوە بە ژێری.

(٧)

لەشکری وەهمو خەیاڵاتم، لەسەر دڵ دابەزی
ڕۆژی سێزدەی شوومی شەومی، کردە گریەو عاجزی
سوورە سێوێکم لە لق، خستمە بەر دارو قەڵانگ
یا مەمی سەر سینگی ئەو بووم، چوومە بەر دەستی کەزی؟
بۆچ نەهاتی، هێندە بانگم کردی یو پاڕامەوە؟
خۆپەرستی، گاوری، جادووگەری، یا ڕافزی؟
پێم بڵێ ناوی چبوو، ئەم هاتن و نازەت کە کرد؟
من سەرو هەورازو کەوتم، تۆ سەرەوژێرو بەزی
گەر سبەینێش، بێیەوە جێ ڕاوگەکەی ئیمڕۆ نەهات
وا ئەزانم ئەم ئەسیمەم، ساڵە وەختێکە وەزی
هەروەکو چاوی ڕەش و، خاڵی لەبو، کوڵمەی سپیت
سپیەلاکم ڕەش بووە، دڵ داخە، جەرگم قاقەزی

چۆن نەگریەم، پەرچەمو زولفی کە ئەخشێنێ لە ڕووی؟
کێیە دیتوویە لەسەر خەرمانی خونچە، بارە زی؟
ڕاچەنی ڕۆحم لەدەنگی بازنو، دڵ هاتە جۆش[1]
وەك لە ئاگردانی ڕووی، جەرگی کەبابم داچزی
(ڕاجیا)! یەزدانی پاك، بۆت هەڵدەسوورێنێ سبەی
پێی بگەی، هەر بیگوشی، هەر بیمژی، هەر بیگەزی!!.

(٨)

کە هات لێشاوی مێشاوی سروشتو نیشی ڕامالی
لە پێشایی شەپۆلی کوڵ، خەفەت شەڕوالی دامالی
لە تاوزینگی هەنیسکی ژین، دلی کورد وەك هەناسەی من
لە گەنجینەی زەوی‌و کاتا، بە بێ دەسماڵی، دەس مالی
ملی هەر کەس تەماشاکەی، بە تۆقی تاقمێك گیرە
سەری هەر کەس تەماشاکەی، تەمی هەڵداوە ڕەشماڵی
سەبا ئەمساڵ سبەینانو، شەماڵ ئێوارەکان نایەن
مەگەر ڕەش بوونەوە چاوی بەدی بارەش بوو هەڵ، کالی
بڵێم بارەش نییە چاکە، هەناسەی مەردی زانایە
کە لەم دونیایە بەر پانە، نییە هاوجووتو هاوالی
زەمان کردی ئەوی کردی، کە تێزاندت کەسوکارت
ترازاندی لە یەك دوو دڵ، بە تیتاڵو بە فیشالی
نەسیم سەرکز بووە ئیمشەو، لە جۆشی هۆشی بێ نۆشان
دەهۆڵی دونبەکی مەکرە، هەوای زوڕنایە شمشالی

١ لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (ڕاچەنی ڕۆحم لە هاڕەی بازنو، دڵ هاتە جۆش).

پەلی بگرەو بە زتی دادە، ئەوی دەرچوو لە هۆزو گەل
بە خۆی و ئاغەی و شێخ و، دەفەو پۆشینو بەرماڵی
کەسێ چاوی دڵی ڕەوشەن نەبوو بەم نیشتمانی کورد
شەقیکەو، پڕ شەقیکەو، لێی مەپرسە سووچ و تۆباڵی
کەسێ گەر هاتە بیری نازو باڵای بووکی باغاتی
لە پێیکە زینەتی مێرگو چیاو مێلاق و قەمتاڵی
ئەوی کانوونی کوردانم، کە (پشکۆ) گەرمی داهێنا
لەسەر کورسی دەنوون گەرمێن و کوێستانی، بەخۆشحاڵی.

(٩)

مناڵی دڵمە گریاوە، لە ڕێی شارانە یارانی
لە بێ شێی وشک بوو، تازە وا دایانە دایانی!!
وەنەوشەو خونچە دێن و، سونبول و گوڵ تێکەڵاویان بێ
لە کوڵمەی دابنێن پەرژین و ئەم ناوانە ناوانی
چ قامەت: عەرعەرو سەروو سنەوبەر، نەستەرەن، شەمشاد!!
دڵەی پڕ ئاگرم، دلبەر، بە ئەم لاوانە لاوانی
دەمێ مەستم دەکا چاوی، دەمێ بەستم دەکا ئەبرۆی
تەبیب تۆ چیت لە من داوە؟ کە لەم نازانە نازانی
کە دێ بۆ کوشتن و گرتن، بە هارەو هاژو هووژێکە
کە کاتێ نیشی خۆشی دێ، لە بێ هەستانە هەستانی
کە بەستەی پەرچەمی دێ دڵ، گرووی گرتو سەرەو بێ بوو
لە بازاڕی جوانیی یار، بە ئەو تۆقانە تۆقانی
دڵی (ڕاجی) نەپشکووت و گوڵی بەختی وەری، چونکە
سەنەم زوو بەو نیازو بیرەوو تاسانە، تاسانی.

(١٠)

بـۆ کوشـتنی کرمـی دڵ، سـەر دوروکـەڵی غەریـبەنگی
بـۆ ڕشـتنی ئـاوی چـاو، چـاوەی عـەرەق و بـەنگی
شـیرین و تـەڕو پـاراو، سـەروی لـە نویـێ ڕسـکاو
هەر سەد هونەرو یەك داو، هەر یەك گوڵو سەد ڕەنگی
لـەو دیمەنـە بێبـەش بم، بەختم ڕەشـە، چۆن گەش بم؟
سـاتێ کـە لـە بـاوەش بم، سـەیری دڵو ئاهـەنگی
نەخشی خەت و خاڵی ڕووت، هەر یەك بەیەکێ ئەنگووت
کوڵـەت بـە هـەوا پـشکووت، دنیـا پـڕە پڕشـەنگی
هـەر مـاوە زراوم چـێ، لـەرزین لـە هـەناوم چـێ
نەشـتەر لـە دوو چاوم چێ، کەوتوومەتـە بـەر چـەنگی
تـازا وەرە ڕازاوە، تـای زوڵفـی تـرازاوە
کـارت هـەموو سـازاوە، وا تێمەگـە دالـەنگی
بـەو ئـەبرووە پـەرگاری، بـەو ڕوومەتـە گـوڵزاری
بـەو دیدەیـە بیمـاری، بـەو توندیـە سـەرهەنگی
ئـەو سێوە بـە دەسـتمکە، لـەو سـینەیە مەسـتمکە
بـەو سـینەمە بەسـتمکە، بمەرێنـە بـە بێـدەنگی
(پـشکۆ) بەسـە سـووتانت، هـاوین بـووە زسـتانت
هێـشتا بـە تـەمای دیـدەو، دوو قـەترەیی ئـاونگی؟!.

(١١)

دڵبـەرە دەسـتی دایـە دڵ، لەتلـەتی کـردو ئـەغنی
تـارو دەمـاری جیـسمەکەم، ڕسـتییو پـاکی پـشکنی
لێـوی عـەقیقی خـستە بـەر سـێبەری زوڵفـی سـونبولی
گـەردەنی زەعفـەران و، دەم خونـچەو، ڕوو گـوڵی چـنی

دڵ، وەکو گۆ لەبەر شەقی زەمانە دەشتی گرتە پێش
حوورو پەریو ئادەمی، بەو شێتو شوورە پێکەنی
پەردەیی خوێنی دڵ دڕا، ڕژایە حەوزی چاوی مەن
گریە بناوانی شکا، ئێستە مەحاڵە بەستنی
کوڵمتە خوێنی لێ تکا، تازە، ڕقە، یا خەجڵە
گەر ڕقە هەستە بمکوژە، بەسییەتی نازو شەرمنی
چاو غەمزەیێکی گرتووە، زوڵفی دوولا هەڵاوەسی
جەژنمە چاوە ڕاستەکەم، تۆ کە قەنارە بۆ منی
مەمکەوە تا ڕۆژی دووا، پەمت بە مەلو شانی هەوا
بەڵکە هەموو کەس تێدەگا، عاشقو تەمبێ کردنی
پێ بە فەلاقە، سەر بە کوت، دڵ بە هەناسە دەرپەڕی
گیان بە بەهەشت شا بووە، لەو ڕوخو سینگو گەردنی
دڵبەری، (ڕاجی) کە ئەکوشت، کفنی بە قامەتی بڕی
ڕۆحی لە پشتی بەستو گشت، تێشووی جەماڵی ئاخنی!!.

(١٢)

بەسییە دڵو دین بردن، لەم تۆخە بە بێ دینی
بەس پێم بدە ژەهری مار، لەو زوڵفە بە شیرینی
نەقدی خەمە تامردن، باری دڵی ڕیسوامە
هەر کووچەیی بێدادیو، هەر کولبەیی غەمگینی
چاوت بە هەوای خۆشی، تالانی سەرو ماڵە
بەو تەوقەو خرخاڵە، تاکەی لە ڕقو قینی؟!
بۆ بولبولی پڕ زارم، وەك غونچەیی دەم بەستەی
بۆ دەردی بە هاوارم، وەك سوورەتی یاسینی

بەم کوڵمە ئەلەتریکی، یا ڕۆژی لەسەر ئەوجی؟
بەم زوڵفە شەوی تاری، یا شووڕەوو پەرژینی؟
لێوت کە پڕی خەندە، قەنداوی خەجاڵەت کرد
زیوینە دەس‌و پەنجەت، یا لەو دەمە زێڕینی؟
وەك تازە لە خەو هەستی، ئەو چاوە پەنا بە خوا
بۆ هەتکی هەموو خەڵکە، نازو غەزەب ئەنوێنی
گوڵزاری بەهارانی، یا بووکی سەراپا سوور؟
یا پیشەتە خوێنخواری، یا هەر بوتی خوێنینی؟
سووزەی جگەری (ڕاجی)، هیچ کارێ لە تۆ ناکا
چونکێ لە هەناسەی سەرد، زانیومە کە تەئمینی.

(١٣)

یارت کە هەبێ، بارتە تا ڕۆژی دوایی
بارت کە نەبێ، غارەتی تۆ بێ سەرو پایی
دوژمن مەکوژە، دۆست نەوەك بتکوژێ ڕۆژێ
یاران مەخە سەر تەختی هەوایی، بە مەرایی
مەروانە هەتا کۆمەڵی بەدبەختی دیارە
هەرزانە قوماشی دڵەکەت، نەك بە گەوایی
داپۆشە سەرت، چەتری غەم‌و سەبر بە سەرکە
ڕابووره، لەهەر حەسرەتی دوو ڕۆژی جودایی
تاریکە شەوت، هەڵکە چرایانی ئەلەتریك
لەم شێوەیی نەوسانییە، تابییە خودایی
کارێ مەکە گیرۆدە ببیو، دەرنەچی بۆ خۆت
نیشێکی بکە سەربکەوی، دوور لە ڕیایی

مەشکێنە دڵی شووشە شەرابی دەمی خونچە
تاکو نەمرژێ نارەقی چاوت، بە سیایی
هێزێکە، هەموو کردەوەیی کۆمەڵی ئێستا
لەو هێزەوە بخوازە، ئەوانەی بە تەمایی
(ڕاجی) مەکە ئەندێشەوو، دانیشە لە خانە
یا ڕاکە لە دو کارێ، بەلایێ، نە دە لایی !!.

❊ ❊

- یٚ -

(١)

لـە چینی پەرچەمو زولفت، چ تەیرێکە نەگیرا بێ؟
بە ڕیزەی تیری موژگانت، چ نێچیرە نەکوژرا بێ؟
لەسەر تۆ شۆخی چاو کاڵم، لە دەستم چوو سەرو ماڵم
نەپرسی جاری ئەحواڵم، ئەگەر ڕەحمت لە دڵ دا بێ!!
بە باڵا شۆخو شیرینی، بە چاوان شەربەتی ژینی
بە سینەو مەم چ ڕەنگینی، بڵا مەیلت لەگەڵما بێ
ژیانی خۆم بە بەر با دا، کە لێوت بۆسەیێك نادا
چ شێخێك بێ لە دونیادا، لە دینت وەرنەگێڕا بێ؟
بە ڕۆژ خامۆشو بێ هۆشم، بە شەو پڕ جۆشو بێ نۆشم
شەوو ڕۆژ مەستو سەرخۆشم، کە چاوت بادە پەیا بێ
چ بێ ئارامو بێ سەبرم؟ لە سەودای تۆیە وا ئەمرم
لە سینەت هەڵکەنن قەبرم، بەهەشتم شوێنو مەئوا بێ
دەخیلی داکو بابت بم، بە ژێرپێ خۆڵو خاکت بم
بە فیدای ڕۆحی پاکت بم، لەبەرچی ماچی ڕووت نابێ؟
دڵم پەرپووتو غەمبارە، لە دەردی تۆیە عەمبارە
بگە هانام، بکە چارە، ویساڵت با لە ڕێی خوا بێ
خودا هەڵناگرێ قوربان، لەبەرچی عاجزی لێمان؟
بەسە، (ڕاجی) مەخە کێوان، ئەوەك ئاخر زەمان ڕا بێ!!.

(٢)

هەتا چەرخی ژیانە، کۆمەڵی کوردانە بەسرا بێ
سەروکاری ڕەوشتو خوو، بە سەد شیرازە هۆنرا بێ

بلێنە سادە ڕوویان، بەزمی مەی بگرن بە هەر لا دا
بلێن گۆرینده ئاوازیان، لە هەر شێوە لە داوا بێ
بلێنە پۆلی شادی، ڕوو لە ئاونگی گژوگیا کەن
تنۆکی ئارەقەی ڕووی دلبەران، تێکەڵ بە بالا بێ
بلێنە ڕووت و قووتانی مەحەببەت، ئێستە یاری کەن
کە زانیومە، هەموو کەس خۆشەویستی دێ بە ڕووی شابێ
کە جەژنی عالەم ئارایە، گەلی کوردانە وەستاون
ئەبێ هەر کەس لە دیوانی ئەدەب سەرخۆش و ئازا بێ
بە پیرۆزگاریو تۆقە، جەماوەر زنەوەری بەخشی
دەسی یەک بەرمەدەن، بیگرن، ئەگەر منداڵی ساوا بێ
بنێرنە دوا کچان کۆ بن، بە هارەو هاژە دابڕژێن
لە هەر لا، خانم و بەگزادە تێکەڵ ئاڵ و والا بێ
مەلاو شێخ و جبەو مەندیل و شاڵ، باوێنە کووپەی مەی
هەموو بیانشۆنەوە خاوێن، ئەوەک ئەم ڕۆژە ئاوا بێ
هەموو مێرگ و ڕەز و باغان، بکەن ئازاو و ڕازاوە
چریکەی بولبول و قومری، زریکەی پیرو بورنا بێ
بە دوو دەس بادەگێڕی زەوق و خۆشی، ڕاست و چەپ مەی دا
دەهۆڵ و تەپڵ و تەمبوورەو، کەمانچەو عوودو زوڕنا بێ
بلێنە دلبەری شیرین زمان، لەم بەزمەدا فەرموێ
بە دەستوورێکی شاهی، غەرقی خشڵ و نەخش و زیبا بێ
بڕۆن، مردوو لە گۆڕان تێگەیێنن، خوا عەفووی کردن
خودا هەر نوور ئەبارێنێ، کە گەل تێکرا بە یەک شا بێ
مەگەر بێو ژیانی نوێ، لەگەڵ تیمرۆکە سازاوە
کە (ڕاجی) خۆی لەبەرگی یەکدلی، وەک خونچە پێچا بێ.

(٣)

دڵــم پــشکووت‌و، ئیمــشەو بــا ڕەوا بــێ
ئەگەرچــی پایزیـــشە، هــەر ســەبا بــێ
ئــەمما ئیمــشەو کــە قــەدری لەیلەتولقــەدر
دڵــی خــەڵقی، دەبــا بــەم شــاهە شــا بــێ
قــەو گوفتــاری چەشــنی شــیرو هــەنگوین
بــە لێــوی ئێمــە دایــم داڕژا بــێ
عــەزیزی بــۆ وەتــەن وەك ئێمــە ســووتاو
خودایــا، دوور لــە ڕووی دەردو بــەلا بــێ
ئــەنیس‌و مــەحرەمی ڕازو دڵ‌و دیــن
ســەرو گیــانی منــی هــەردەم فیــدا بــێ
لــە کوردســتانی شــادی‌و فــەن‌و پێشــچوون
هــەتا ڕۆژی دوای، نــوورو زیــا بــێ
لەســەر لێــوی نیــازو نــازی کــوردان
وەکــو ئــاونگی ڕوخــاری گیــا بــێ
بــە دەم نــەورۆزی بــەختی کۆمــەڵی کــورد
جریــوەی موشــتەری‌و زوهــرەو ســوها بــێ
حــەریفێکم نــەوێ، وەك مــن لــە عیــشقا
بــە ســووزەی ڕوویــی هــۆزی، ســووزیا بــێ
بــە تــاری زوڵــف‌و، عــوودی دەســت‌و ئەنگوســت
پــڕی چــەنگی، لــە جەرگمــدا ســەدا بــێ
بــە ناوچــاوانی ســاف‌و چــاوی بیــنین
وەتــەن ئــەمجا هــەموو دەردی دەوا بــێ

بلێـــەی کەشـــفو حیکمـــەت، دایـــە کەللـــەم
ئـــەبێ قـــاپی ئـــەمزانین داخـــرا بـــێ
ئـــەدیبێکی تـــەڕو بـــەرزو لەبیبـــە
لـــەناو یـــارانی مانـــا، ناســـرابێ
زمـــانم لەنگـــە بـــۆ ویـــستەی زەمـــانم
قەڵـــەم ســـاغە لەگـــەڵما، تـــا شـــکا بـــێ
منـــیش هـــەروەك قەڵـــەم، تـــا لێـــو بـــڕاوم
دەبـــێ پـــێشم هـــەموو حەمـــدو ســـەنا بـــێ
نـــە وەك قاقـــەز، لەگـــەڵ نیـــشتمانو میللـــەت
بـــە زوڵـــفو، خـــاڵو خـــەت، کوڵمـــەم ســـیا بـــێ
لـــە عالەمـــدا عـــەزیزێکم موعینـــە
ڕەئـــووفی دیـــنو دونیاشـــم پـــەنا بـــێ
ئـــیتر (پـــشکۆ)، ڕجاکـــارم لـــە مـــەردان
لـــە بـــەرزی تێبکۆشـــن، کـــورد گوشـــا بـــێ.

(٤)

کێ هەیە گیانو دڵـی، بەسـتەی کەمەنـدی ڕوو نـەبێ؟
کێ هەیە لەم هاتوچوونە، بەسـتە دڵ، کوشـتوو نـەبێ؟
دیمـەنی پـاکی، نموونـەی جەنـەتی دەربەسـتەیە
چۆن نەبێ ئەو دڵبـەرە، دەربەسـتی ئـەو دەربوونـە بێ؟
ئـەو کـە پـەروەردەی شـەرابو، ئـارەقی لێـوو دەمـە
با تەرازووی خێـری مـن، دوو لێـوی ئـەو خاتوونـە بێ
ناسـکی کێـوی لـە گومبـەز دایـە، ڕامـی مـن نییـە
چی دەبێ ئیمڕۆ لەبەر چاوم، ڕەمـی ئـاهوو نـەبێ؟

ئەو بەرو دۆشەی قومار دۆڕاوە، بۆچی پێکەنی؟
سەر لە گریانی خەجاڵەت کا، بە هیوای خور نەبێ
تا وەرز بووم، ڕامسپاردە لای‌و بازی دا لە لام
با وەکو تەیری کەوی، خۆی ڕێڵی ئەم هاموونە بێ
وەك شەدەی نەرمی لە مل هاڵاندو، دەستی دایە دڵ
خاوەنی، تۆڵەی دڵی لێ سەندو، با ماندوو نەبێ
تاوەکو مووسا، لە کێوی دەستەچیلەی بائیسی
هەر بە پێ خواسی ئیتر، با تووشی ئەم جەیحوونە بێ
من گڕی ئاگر لە دڵمە، بۆیە چاوم سوور بووە
شەونمی ئەو خستەسەر، با تووشی داوی موو نەبێ
سینە ئاگر، کاری مەم، دڵ سووتە، کاری لێرییە
گەر خەتی تێدا نەبێ، ئاوون دەبێ ئابوونە بێ
خونچەیی لێوی، لەگەڵ دوو نێرگسی چاوی دەکا
لالەیی کوڵمەی، دەبا یاری خەتی بەیبوونە بێ
تا بلێسەی چاوی (پشکۆ)، دڵ پەلاماری نەدا
وام ئەزانی چەنگبازی دووکەڵی گێسوو نەبێ!.

(٥)

ڕەونەقی بەختم، لە چاوی نێرگسی شەهلا ئەچێ
عاجزیی ڕۆژو شەوم، بەو دلبەرەی زیبا ئەچێ
نرخی عومرم، نایەتە باس‌و تەرازووی حیکمەتی
مەرگی سەد ساڵەم بە خەندەی لێوەکەی زوبدا ئەچێ
تام‌و بۆنی زوڵف‌و کوڵمەو، غەبغەبەو سینگ‌و مەمی
کەی بە حۆری‌و شیرو هەنگوین، کەوسەرو تووبا ئەچێ؟
تا لە ملماڵاوە ڕستەی زوڵف‌و کاکۆڵی گەشی

شـانەیی دڵ شـی دەکـا، وا زەردوشـی بـاڵا ئەچـێ
هەرچـی وەك مـن دڵ بریـنـدارو کولافـەی نازتـە
چـاو بـەگریان، بـۆ خـەڵاتێکی دەسـت خێـرا ئەچـێ
ئـەی دەخیلـت بم وەرە، چـەند دڵکەشـە دوو لێـوی تـۆ
هـەر دەدانێکـت، بـە شـوعلەی گەوهـەری لالا ئەچـێ
ئافـەرین بـۆ ڕەسمـی پـاکی تـۆ، لـە دونیـاوو لـە دیـن
ڕەونەقی ئیمـانو دیـنم، کـەی بـە کـەس قـەت لا ئەچـێ؟
دیـمەنی پـڕ ئـارەزووت، تـاکو بـە ئاسـان دێـمەوە
خـستمە گێرفـانی دڵ، وا گـوڵ بـە کەشـتی بـا ئەچـێ
جوانی یـو ئـازت، کـە شەرِ ئەفرۆشنە چەرخی نیـشات
زامـی گۆشـەی چـاوەکانت، وا بـە گـژ عیـسا ئەچـێ
ئـەی نموونـەی قـودرەتو، نـووری خودایـیت تێکـەڵاو
هـەر کـە تـۆ هـاتی، خـەمی کۆنو نـوێم تێکرا ئەچـێ
ئـەو کـچە نەوبووکـمـە، ئـەم جەژنەیـە پـیرۆزە لـێم
جـەژنی بـیرو بـاوەڕم، بـەو شـۆخی بـێ هـەمتا ئەچـێ
سـوێرو تاڵی هیجری ئیمشۆکەت، شەوی پـێ کردمـەوە
ئەم سبەینەی بەینی هـەردوو لام، بـە لـوتفی خوا ئەچـێ
سی دەسو مل، ماچو بۆن، مێشکی وجوودی پـڕ دەکـرد
بۆیـە نەقـدی زەوقەکـەم، واپـڕ بـە دوو دونیـا ئەچـێ
جێگە گەسـتەی زوڵفی، کـوڵمی عـاجزی سـوورکردمەوە
نەخـشی دەسـتی قودرەتـە، بۆیـە بـە گـژ سـیما ئەچـێ
بـۆ بـەراوردی غـەمو خۆشـی، کـە (ژیکـۆ) کوشـتەیە
چـاوە ڕاوێکـیش بکـا، وەك ئیـشی بـێ بـڕوا ئەچـێ.

(٦)

هەنارو سێو گوڵ پێ ناگەیێنێ
هەتا بارانی پایز نەیڕشێنێ
سەرو پرچی، ئەمڕازاون لە بازاڕ
بە شانەو ڕەنگی قودرەت، دای ئەهێنێ
بە یاریدەی مۆرژەو، چەنگاڵی زولفان
لە سینگی عاشقان، دڵ دەرئەهێنێ
پەڕی گیرفانو کۆشو دەم دەبێ دوڕ
ئەمامی قامەتی گەر ڕاهەژێنێ
ئەگەر چاوێك بگێڕێتە جەماتێك
یەکاوێەك، چاو لەبەر بێ دڵ ئەمێنێ
مەحەببەت، وەك ئەمامێکی گوڵی گەش
لە ئەرمێنو چەقێن، هەر خۆی ئەچێنێ
لقی وەك داری تووبا، ئەم پەڕ، ئەو پەڕ
کە هەر کەس چی بوێ، لێی داتەکێنێ
لە باغی کوڵمو دەم، سینگو مەمی زەرد
مەزەی چاوان، بە لێوان ڕاگەیێنێ
ئیتر چەند خۆشە تێکەڵ بن خەتو خاڵ
جگەر بادەی مەحەببەت بیتەمژێنێ
بەسەرخۆشی، لە هۆزو دین پەشیمان
ئەوی جاسووسە هەر ئاخان هەڵێنێ
لە بازاڕی مەحەببەتدا، دڕۆزن
دراوێکی لە کیسەی دا ئەمێنێ
خودا، وێنەی بەهەشتو یارو (ژیکۆ)
هەتا عالەم ئەمێنێ، پێگەیێنێ.

(٧)

دێهـاتو شـارو گەڕەکەکـەت، بـا کـەلاوە بـێ
خزمـی خـراپو نەفـسی گـلاوت هـەتا هـەبێ
سـەر نـاگرێ ڕەوشـتو، سروشـتت کـەچو چـەپەڵ
لـە مـاڵو هـۆزو حکومـەت، هـەتاکو تـەما هـەبێ
تـەما وەلامو کـارو بناغـەت کـە تێـک تـەدا
تـەما نـەبێ دوژمنـی گیانـت بـرا نـەبێ
ئەگـەر بـە ڕێکـوپێکی بـژینو هـەق بناسـین
ئەم شێخو مێخە سا بۆچی موشـکیل گوشا ئەبێ؟
نامووسـی پایـەماڵو، دراوسـێی بـە دەنگوبـاس
لـە مـاڵتی ئـەخزێنێ، هـەر کسـێ لـەلاوە بـێ
بـەدکاری ماڵـە، میکـرۆبو ژەهـری هەناوەـە
ئـەو کەسـە دوو چـاوەە، لـەمڕێی تەقـەلاوە بـێ
خۆ لابدە (ڕاجی) لە دۆستی بەد، نەکو لە سەگ
سـەگ چاوەناسـە، لـە یـاری بـەدگۆ گـلاو ئـەبێ.

**

## چوارین

(١)

سەربەخۆ، سەرخۆشی بەزم و مەیکەدە
پڕ بکە جەرگ و دڵ و گیان و گەدە
خۆت بە هەق بسپێرە، بێرە بێ سۆز
دەس لە داوێنی نیگارت بەرمەدە.

(٢)

پەخشی هێزتکەو، ئەمێنێ کردەوە
تێبگە خولدانی ئەم ڕۆژ و شەوە
بۆ تەوە، یان بەردو دار و وەحشییە
یەك ڕووە، دەرکا سەری لەم دوو ڕووە.

(٣)

شاهی کانی شار و بازاڕ و کەنار
هەر ئەوە توانا بە گشتی کاروبار
خۆی لە دەوری خۆی ئەسووڕێنێ هەبوون
هەر دەمێ شەیدا ئەکا یارێك بە یار.

(٤)

هیچ لە دەس خۆما نەبێ کار و مشوور
ڕەت نەکەم دەردو بەلاو مەرگی سوور
چیم لە ڕۆژی حەشر و پردو هەلڕەلین؟
چیم لە ئازار و لە شادی و نار و نوور؟.

(٥)

تا بە هەنگڵ دا نەکەی کوپەی شەراب
تا دەماخت پڕ نەکەی چەنگ و ڕوباب

ناگەیــە دۆســتانی مانــاو، ڕاســتو هــەق
باوەشــت بۆشــە، وەکــو دونیــای خــەراب.

(٦)

هــەر خوداییکــە، کــە بێتــە بــاوەڕم
ملکەچــی ویــمو، بــە هــێتر موزتــەرم
کوشــتمی، چــیم لیــدەکا جــارێکی تــر
ئەمتــەنێتۆ، بۆچــی مــافوورو بــەرم؟.

(٧)

ئــاگرو ئــاو، هــەواو خــاك بــوو
پاش خــولی دوو زەڕڕە، خــوا بێبــاك بــوو
گیانلەبــەر ســوورێکی داوو نیــشتە خــاك
لوقمــەیی مــارو مــەلو خاشــاك بــوو.

(٨)

تــا بەکــەی هــۆشو تکــاو پاڕانــەوە؟!
تــا بەکــەی شــەرمو حــەیاو پاشمانــەوە؟!
ڕووی ژیــان ماچــکەو بنۆشــە ئــاوی ســوور
بەســییەتی مــەکرو ڕیــاو پاڕانــەوە.

(٩)

داخــی کــردم ئــاگری مــاڵو منــاڵ
گــەرمو ســاردو، عــادەتی چــوار فەسڵی ســاڵ
هــەر تــەوژمێ بــوو، تــەوژمێکی شــکاند
لینگــە فڕکــەم، بێبەشــیی هێنامــە پــاڵ.

(١٠)

ئــەی خــوا! خــۆ مــن دروســتکردەی ئــەتۆم
خــۆت خــەراپی، گــەر خــەراپو ڕەنجــەڕۆم

عــاره نـاڕازی بــی بــۆ دەسـتکردی خـۆت
کـەی بـووە ڕۆژی نـەزەل، مــن هاموشـۆم؟!.

(١١)

ئێستە خـەلکیش تێنـەگا، مـن تـێ ئەگـەم
بـەو پیاڵـەی سـۆزە تـازە پـێ ئەگـەم
ئیحتـیلامم بـۆچ بەشـەیتان بـێ لـە خـەو
بۆچـمە خـەون و جنۆکـەو پـێچ و خـەم؟!.

(١٢)

کـێ لـەمباتی کـێ، ئەسـووتێنی جـەزا؟
ڕەنگـە قـانوونی عەدالـەت وا بکـا؟
هەرچـی مـن بیکـەم، یـەکێ تـر بیخـوا
هـەر کەسـە بۆ خـۆی خواییـك بـێ، خـوا!!.

(١٣)

گـەر هـەژارو بـێ نـەواو سەوداسـەرم
دەوڵەمەنـدو مـاهیرو دانـشوەرم
هـەر دەکـەم جێیـەك لـە خاکـا ئـاوەدان
بێگومـان، گـەر شـاهەو گـەر نۆکـەرم.

(١٤)

خانەکـەم ناکـەی بـە نانێـك ئـاوەدان
خانـەقای شێخیـشە، پـڕ پـڕ ئـاوو دان
مـن بناسـم تـۆ، ئـەویش خـۆی گـەورە کـا
خـۆ تـۆ ناترسـی لـە ئـازاو ناتـەوان؟!.

(١٥)

خۆت ئـەڵێی: برسـێ و ئێـوەش ڕووت و قـووت
مـن ئـەدەم پێتـان لیبـاس و جـووت و قـووت

چەندی پرسیارم بکەن، هیچ کەم نەکەم
چش بزر ناکەم لە نابووت‌و لە بووت!.

(١٦)

نان‌و بەرگێکم دەوێ، یارێکی یار
گۆشە مەیخانێک‌و، سۆزەی سازو تار
کووپەییەک‌و، پێک‌و، بەرچاوێکی گەش
نامەوێ ئیتر بەهەشت‌و مێرخوزار.

(١٧)

خاوەنی هەر پاش‌و پێش‌و ناوەڕاست
تۆ کە هەر خۆتی بە چەوتی، یا بەڕاست
پێم بڵێ: سیحرو، جن‌و، شەیتان چبن؟
خێرو شەڕ، قازانج‌و بازاڕێکی کاست؟!.

(١٨)

کێیە ئینسان‌و مەلایک، سەربەخۆ؟
نەیکەی‌و، نەیبەی، بە ڕاوێژێکی تۆ
من خەتابارو، بە سووتان موستەحەق
سووچی خۆتە هەرچی بیکەی ڕەنجەڕۆ!!.

(١٩)

زانیاری غەیب‌و حازر، چونکە تۆی
نامری‌و، ئەمرێنی گشتی کام‌و ڕۆی
کورتە کاتێکی ژیاندت گیانلەبەر
ناوی تەنریخ‌و خەرتەمن، هاتوچۆی.

(٢٠)

چونکە تەنیای، کێ هەیە لێت کا گلە؟!
دانەری هەر نیسبەت‌و پەست‌و پلە

مەگرە لەم دەستکردی خۆتە ڕەخنە قەت
مەیخەرە ژێر باری زۆری‌و مل ملە!!.

(٢١)

عەشرەت‌و، هۆزو، حکومەت، یەك گەڕەك
ماڵ‌و، میرات‌و، ممات‌و، دەست‌و چەك
شۆڕش‌و، کوشتارو، پاس‌و، باس‌و خواس
کردەوەی خۆتن، بە بادانی خەڕەك!!.

(٢٢)

بت پەرستیش تێدەگا، بت مەزهەرە
شێخ‌و زاناو فەلسەفی، پێدا وەرە[1]
هەر کەسە مێشك‌و، دڵێك‌و بیری خۆی
گشتی ئامانجیان بە ڕوویی دلبەرە.

(٢٣)

گەر مەلەك بکا لە ڕەحمی داکما
لێم بنووسێ حاڵ کوا؟ ئیدراك ما؟
کێ بگۆڕێ کارساتی چارەنووس؟
کێ بپرسێ لێم، لە گۆڕو خاکما؟!.

(٢٤)

خۆت ئەڵێی: گەنجێکی گوم بووم، هاتمە ڕوو
تا بناسرێم، دامە عالەم خولق‌و خوو
کێیە دوژمنت‌و، حەسوودو، بەرهەڵست؟
خۆ نەتیجەی (خەلق)ە، هەر ناسینی توو!!.

(٢٥)

ڕای پەڕاندم، چاوی پڕ سەوداگەری
لێی ڕفاندم، بیرو گەنجی سەروەری

---

١ - لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ : (شێخ و زاهید، یەك بە یەك پێدا وەرە).

چـــونکه بـــێ قـــازانجو مایـــه، مامـــەوه
بەســـیه (ژیکـــۆ) فەلـــسەفەو نـــام ئـــاوەری.

**

## چوارینی تەرجیع بەند

(١)

تاكو تـــەنیا دێـــمە ناڵەو، باســـی دڵدارو غولاما
ئەیخەمە مل سونبولو گوڵ، دڵ نەبینێ خۆی لە جاما
تۆش گرفتـــاری وەکـــو من، دوور لە قاوانـــی عەواما
(یا نَديمي قُمْ بِلَيلٍ واسقني، واسقي النَدامى)

تا بە سەرخۆشـــی لە ڕۆژا ڕابوێرم، ڕوو لە خۆشـــیم
کەس نییە گەر بێتە هانای ناڵەو گریەو نەخۆشـــیم
پێم نەپۆشرا ڕازی عیشقەت، چونکە دەردی تۆیە نۆشیم
خَلَّني أسْـــــهَرُ لَيْلي، وَ دَعِ الناسَ نِياما

وا لە دەریای خەم نقووم بووم، وەختە بشـــووتێم لە تاوت
هەڵگـــری لۆمەی کەســـانو خزمی خۆمیشـــم، بە ناوت
بۆچمە ســـا ماڵو شـــادی، وا ئەڵێمە هەردوو چاوت
أسقياني، وَ هَديرُ الرَّعدِ قدْ أبْكى الغماما

پێکەنە، یارێـــکە، بـــادەی مەی دە، گیانا بێرە لاما
هەڵپەڕن با موتریبو ســـاقی لەگەڵ تارو مەقەما
چەندە خۆشە پێکەوە سەرخۆشو، حاشاکەین لە ناما
فما وَأن كَشَـــفَ الوَرد عن الوجه اللثاما

ڕوو لە نەشئەی پەرچەمیکە، چاوی ناوچەوانی یارت
تەرکی دنیاکە بە جارێ، ڕووکە شـــەوقی لالەزارت
هەرچی مەنعتکا لەدڵبەر، پێی بڵێو لێیدە بە دارت
أيّها المصـــفي الى الزّهادِ، دَعْ عنكَ المَلاما

تــۆ گرفتاری کەمەنــدی زولفی یــارو خەتو خاڵی
مەســتو سەرخۆشو غەریبو بێکەسو رووتو ڕەجاڵی
چونکە وا نێزیکە مەرگی، هێند نەخۆشــی چاوی کاڵی
فُـزْ بِـهـا، مِنْ قَبل أن يَجْعَلكَ الدّهر عِظاما
ســەیری نەوتوولی قەدو، سینەو مەمو، قەندی لە جاما
شێتو شەیدای بوومو هەرکەس، کەوتە ئاهەنگو وەراما
قُـــلْ لِـمَـــن عَيَّـــرَ أهـل الحُـبِّ بِـالحُـبِّ، وَ لامـا
لا عَرَفْـتَ الحُبَّ هَيهات، ولا ذقتَ الغَراما
سەر لەگێژاوی مەحەبەت، دڵ لە ناو بەحری بەڵادا
دەوڵەتو نامووسو دینم، بۆ کەسێ گشتی بە بادا
تاوەکــو ئەمرم، ئەچێ گیانم بــە گــژ ڕۆژی جەزادا
لا تلمني في غَلامٍ، وَ دَعِ القَلبَ ســقاما
(ڕاجیا)، وەك شێخی ســەعدی، من ئەوا کەوتوومە داما
بێ ئەواو پەرپووتی عیشــقم، دوور لە قانوونو نیزاما
لَيسَ وَحْـدي فـــي مَـــدى الوَجْـــد تَــرَكْتُ الإحتراما
فَـبِداءِ الحُبِّ، كَمْ مِن سَيّدٍ أضحى الغُلاما؟!!.

(٢)

ئەی بوتی شیرین کەلام
بێنە لەبو خاڵو خەت
ئەی دوڕی گەنجی مەرام
بێنە لەبو خاڵو خەت
تۆی هەوەســی بێ دڵان
تۆی چەمەنی بولبولان
تۆی تەرەبــی جاویدان

بێنە لەبو خاڵو خەت

ئەی سەنەمی خونچە دەم
خاوەنی بـاخی ئیـرەم
ئەی گوڵـی ڕەنگین کەرەم
بێنە لەبو خاڵو خەت

یاری دوو عالەم ئەتۆی
ئادەم و خاتـەم ئـەتۆی
شەوقی دڵو غەم ئەتۆی
بێنە لەبو خاڵو خەت

مەمکوژە بێ ماچی ڕووت
بەو شـکەنی تاقو جووت
تاکـو مـنـم دوبـــەدووت
بێنە لەبو خاڵو خەت

ئەی شەمی عالەم بەها
نیعمەتی بێ ئینتیها
شـاپەڕی زەوقو سەفا
بێنە لەبو خاڵو خەت

ماتو قەلەنــدەر منم
خەســتەوو بێ دەر منم
مورغی سەمەندەر منم
بێنە لەبو خاڵو خەت

مەعدەنی کامو ویداد
گوڵشـەنی ڕۆژی موراد
ســـاقی کأسُ الرَّشــاد
بێنە لەبو خاڵو خەت

بۆ دڵی (ڕاجی) هەژار
ئەی بوتی سیمین عوزار
هەستە بە زەوقی بەهار
بێنە لەعبو خاڵو خەت.

(٣)

چین چین لە چەمەن، وا لە ئەو ئاڵاوە خەتو خاڵ
سەیریکە چ تەرزێ، گەشو تێراوە خەتو خاڵ
تێکەڵ بووە بەم ڕوومەتە، خەملاوە خەتو خاڵ
هەر لا کە ئەچی غالییە سووتاوە خەتو خاڵ
ئەو دڵبەرە ئاهو ڕەووشە، هەمسەری کێیە؟
ئەو نازکە گوڵ غونچەدەمە، هۆنەری کێیە؟
ئەو شیرینە ڕوح سووکە، خودا، ڕەهبەری کێیە؟
لەم باخە، کە ئارایشی وا داوە خەتو خاڵ
جارێ بە تەمای کوشتنی من، خەنجەری ئەسوێ
جارێ لە خودا ترسیو دڵنەرمییە، ئەدوێ
لام واشە بە خوێنی منە، ئەم پەرچەمە ئەڕوێ!
نابینی لە ڕووی شەوقەوە هەستاوە خەتو خاڵ؟!
تینوو، بە نەمی ئارەقی سەر پەلکی گوڵانم
برسی، بە دوو یاقووتی لەبی تازە بوتانم
پڕ دەردو غەمو حەسرەتو هاوارو فوغانم
بەم دوو شتەوە، لەم دڵە تۆزاوە خەتو خاڵ
ناگەم بە کەمەر گرتنی ئەو شۆخە لەبیبە
ئەو دڵبەرە، ئەو دینبەرە، ئەو کوردە نەجیبە
هەرچەندە لە من وازی نەهێناوە حەبیبە

بۆ دوژمنییـــــە، ئاگری بەرداوە خەتو خاڵ
قەدری تۆ من ئەیزانمو ئەتهێنمە سەرچاو
ڕۆحم ئەکەمە دۆشەکی نازت، بەدڵو داو
وا چاکە ڕەقیب لادەیو بگری قەدەحی ناو
ئەك وەختێ بڵێی حەیفە پەشۆکاوە خەتو خاڵ
چاندوومە گوڵو نێرگسو نەسرینو وەنەوشە
هەر ئێکە لە لایێکەوە، پــڕ تافو درەوشــە
(ڕاجی) وەرە ئەم باغە، چ ڕەنگینە بە ورشــە
وەك بولبولو قومری، دەمی کێشاوە خەتو خاڵ.

(٤)

## داشۆرینی فەرمانگەی تەموینی کۆیە

تەموین کە ڕزقی مــن دەدا
لە قوونی ئیـــستیحقاقی بەم
ژیـــانو مـالــی دا بــە با
لە قوونی ئیـــستیحقاقی بەم
ویـــستی کەسێ بیتاقە کا
لە ئەو سندووقو تاقە کا
بەشی خۆی بێ عەلاقە کا
لە قوونی ئیـــستیحقاقی بەم
لە نۆسـەدو چلو شـەشــــە
چەند سەربەهەش سـالی ڕەشە
غەمـی لـە کۆڵو باوەشــــە
لە قوونی ئیـــستیحقاقی بەم

مەئمور نەڵێی ئەسکەندەرە
پۆلیس لە ڕێور بەردەرە
سەری لە داوی دڵبەرە
لە قوونی ئیستیحقاقی بەم

وەرزی سەپانە، جێی غەمە
گەلیش لەگەڵ گورگان، گەمە
دەستی بیتاقەچیو مەمە
لە قوونی ئیستیحقاقی بەم

قەلەندەرو هەژارو ڕووت
کوژانەوە هەروەك بزووت
لەم شارە نەیما بەرگو قووت
لە قوونی ئیستیحقاقی بەم

چ گەورەبووم‌و بەهرەوەر
گۆڕیەوە بە دەردی سەر
بیتاقەکەم نەهاتەدەر
لە قوونی ئیستیحقاقی بەم

شکاتو عەرزوحاڵی تۆ
بۆ حیفزو ڕەفزە، سا برۆ
چیدیکە خۆت مەکە خەرۆ
لە قوونی ئیستیحقاقی بەم

بەرتیل نەدەی بۆت ناکرێ
بێ پارە، بەش، پێت ناخورێ
گازت سواوە ناگرێ
لە قوونی ئیستیحقاقی بەم

هێند هاتوچووم قاچم سووا
وەك بـی لـە تـارەقا ڕووا
بەختی بەدیشـــم لێم دووا
لە قوونی ئیستیحقاقی بەم

بە سەرکزی، بەکوزکەشی
بە بێدەنگی، بە چاوشـی
هەر مامەوە بە بێبەشـی
لە قوونی ئیستیحقاقی بەم

بـەلایی ڕاســتییدا ئەچی
من ڕاستو بوومە ساختەچی
زۆرم ئـەدی خواریو کەچـی
لە قوونی ئیستیحقاقی بەم

پێنجی، (فەتاح) فلانە بەگ
ئیمزای دەکا بۆ بەرگو ڕەگ
موجەددیدیشـــە نا بەحەگ
لە قوونی ئیستیحقاقی بەم

مـــەئمور تەماعی خۆی نییە
چـــاوی لـە حەقگوزارییە
(عەلییە فەنیش) یەکی دییە
لە قوونی ئیستیحقاقی بەم

بە دەردو هێشو ئێشەوە
بـــە ناحیەو بە دێشەوە
بەشارو پاشو پێشـــەوە
لە قوونی ئیستیحقاقی بەم

هەنوونەو هەنوونە بێ
بەگ جووتە گون بە قوونە بێ
شوکریش، درەنگو زوو نەبێ
لە قوونی ئیستیحقاقی بەم
کوتاڵی زەردو سوور هەموو
بۆ بایەو مەئموور نەبوو
کرمانج بە قوون دڕان نەچوو
لە قوونی ئیستیحقاقی بەم
مەئمورە جوستوجۆ ئەکا
موستەورەدەی تاپۆ ئەکا
کرمانجی ڕەنجەڕۆ ئەکا
لە قوونی ئیستیحقاقی بەم
ورگی زلو ملی قەوی
شوکر نەبی نابێ کەوی
عالەم لەژێر دەستیان نەوی
لە قوونی ئیستیحقاقی بەم
کیلۆ بە دوو کەسان ئەدا
بایع دزی لەویش ئەکا
وەرزی فەقیریان دا بە با
لە قوونی ئیستیحقاقی بەم
هاوار! کوردینە بچگەنێ
لەدەس دزو جەردەی بەنێ
سەتری گونیشم نادەنێ
لە قوونی ئیستیحقاقی بەم

عێـراقــه ڕێنگــرو دزه
دوو چاوی حیزو سەرکزە
دوژمنی چاوی چەند بزە
له قوونی ئیستیحقاقی بەم
قەزایه (کۆ)، لێم بووە قەزا
خــــتمییه بەر دارو جەزا
هێشـــتاکه لێم نابێ ڕەزا
له قوونی ئیستیحقاقی بەم
قائیمەقام (عارف جەلال)
نەیچێشتووه تاوی حەلاڵ
ئەرزاقی کرد به گاڵەگاڵ
له قوونی ئیستیحقاقی بەم
موستەوڕەدە (سەیید فەتاح)
نەیبیســتووه ڕێگەی نەجاح
تەنگن دەمێ، دەمــێ فەڕاح
له قوونی ئیستیحقاقی بەم
قانوون چییه، ئیدارییه
ئیداره قانوونــی نییه
لەسەر بەشم یەکی دییه
له قوونی ئیستیحقاقی بەم
مەئموور به کەیفی خۆیەتی
خەریکی وەردو شـۆیەتی
داســی له مل مەلۆیەتی
له قوونی ئیستیحقاقی بەم

(گویا) حەیاکەو شوورەیی
وەرزت خوراوو پێگەیی
هەرچی زگی بۆ تێگەیی
لە قوونی ئیستیحقاقی بەم.
کۆیە/ ١٩٤٦

(٥)

دەمێکە بۆ کوردی هەژار
هاوار ئەکەم، وەتەن وەتەن
وەك تاوو هەورەکەی بەهار
ئەرژێتە دەم، وەتەن وەتەن
کە بەشکران گەنجو چەمەن
کە سەربڕان دارو دەوەن
بە دڵڕەقی شاخو چەقەن
سەریان بە تەم، وەتەن وەتەن
بەراوو پشتاوو زەوی
چی خۆی نواند بەرزو نەوی
لە ئاستی دوژمنان کەوی
بە زۆرو کەم، وەتەن وەتەن
بە کانگەوو کۆگەو کەڵێن
بە دارو ئاوی دەستەهەڵێن
وەك من بە سۆزو کوڵ ئەناڵێن
بە دەردو غەم، وەتەن وەتەن
هەوا بە باغو ڕاغەوە
بولبول بە زامو داغەوە
بە بەردی بن بناغەوە
چاویان بە نەم، وەتەن وەتەن

بــەتاڵە وا دەمــاغ و دڵ
لە کیسە چوون چنارو گوڵ
ئەڵێن بـە ڕەنگی زەردو پڵ
لەژێر ســـتەم، وەتەن وەتەن
(پشکۆ) کە ئەخرینگێتەوە
وەك تـەپڵە ئـەترینگێتـەوە
پێی خۆشــە ئەزرینگێتەوە
لە جامی جەم، وەتەن وەتەن!!.

(٦)

جەژنی نەورۆزم، وا هات بەلاوە
ناسۆری ساردیم، هەموو کولاوە
تیـماری ئەکا گوڵ بـــە گیاوە
ئـەیپێچێتەوە دار بـە گەڵاوە
هاریـــن بــــەگەرمی، دڵ ئـەگەیێنێ
بە ورشــــەو پایــز، دای ئـەتەکێنێ
لە شەختەی زستان، سەربەست ئەمێنێ
سەوزی کا بەهار، ڕوو بە خوداوە
خونچــــە پێکەنیـــن، کە گوڵ چنینە
کە ویش[١] بوو بە گوڵ، جگەر گوشینە
سەرشــین وەنەوشەش خەریکی شــینە
مێلاقو نیســـان، ملکەچ بە پاوە
ڕوو سپی، چاو زەرد، نێرگس کە ئەبزووت
حاجیــلەو بەیبوون، دڵیان ئەپشــکووت
قەوجــی گیـاوگۆڵ، هەزار تـاقو جووت

١- ویش ، ئەویش.

بە سەد هەزار ڕەنگ، هاتنە سەماوە
هاتنە تەماشا، نەورۆزی خۆش ڕوو
دڵـی دایەوە، هەرچـی کە زیز بوو
گیـاوو گیانـدار، بناغەی مردوو
بـە خاس‌و خەراو، هەمووی ژیاوە
ئەبیات هاتنەجۆش، خۆشڕەنگ‌و خۆشبۆن
نەشـەی گیانی من، گەشەی چاوی تۆن
سـەد نەلیکترۆن، بـە یەك پرۆتۆن
لە کار درووسـتی، واجـووزی ناوە
سەرسـام، ئەبینن بەرلین‌و بەغدا
بـە چەنـد مەکینە ئەدەن کارەبا
مەکینـەی نەورۆز تەنیا لە دونیا
بێ سـویچ‌و گلۆپ، چریسـکەو تاوە
گوڵووکی خوێنین، سپـی ڕەنگ‌و سوور
لە تەن سـووڕی خوارد، نیشتمانی نوور
هەموو جێ گەڕا، چ نیزیـك، چ دوور
لەشـکری میکرۆب، پشـتی شکاوە
جەژنی کوردم دی، (ڕاجی)، سەوزو ئاڵ
چەند مل بە دەسماڵ، بە کەشـیدەو شاڵ
تەمەنـی کوردان، لـەنوێ هەموو ساڵ
کـە هات کۆمـەڵ کەن، مەکەن بڵاوە.

**(٧)**

دڵ، نرخی لەسـەر خاڵی سیای دڵبەرە ئەمشەو
سەر، باجی لەسەر خاکی دەری گوڵبەرە ئەمشەو
مەعلومە لە مەیخانە، هەموو قەنتەرە ئەمشـەو

والآیە بەلای حەزرەتی ئەم مەنزەرە ئەمشەو

گرتوویە دڵم جیلوەیی خورشیدی ئیشارەت
پێویستە لەسەر ئەجمەیی دیوانی بەشارەت
یارم، کە لەسەر تەختەیی هەیوانی صەدارەت

خاوەن حەشەمی ئاسەفو ئەسکەندەرە ئەمشەو

هاتو، بە سەفا سۆزەگەری کردە بەهانە
دانیشتو وتی: وەختی جەفا هاتە نیشانە
ئەم سەیرو سلووکەت چییە ئێستا لە میانە؟

وا عالەمی ئەم دەورە، لە دەم ئەژدەرە ئەمشەو

نوورینە، بلوورینە، ڕوخو گەردنو سینەی
ڕەنگینە لەناو دائیرەیی ئەنجەمو عیشوەی
بیبینە لەڕووی حوسنەوە، بشکێنە مەیو نەی

سەروێکە، تەلای موشکو گوڵو عەنبەرە ئەمشەو

خەندەو ئەزەری، دڵ دەڕفێنێ بە موهیمات
دەعیەو گوزەری، ڕوح دەپسێنێ لە مولاقات
بەستوویە بەدەم کاکۆڵی موشکینی، حەشامات

ئەی وای لەمنێ، زەلزەلەیی مەحشەرە ئەمشەو

پابەندی هەوای گوڵشەنی ڕەنگینی عێراقم
سەوداسەری گێسوویی سەبەبکاری میحاقم
بیستوومە کە لەو دڵبەرە ئێزیکە فیراقم

ڕوح دوکەڵە، دڵ غالییە، تەن مەجمەرە ئەمشەو

جارێ لە هەوا بەندەمو، جارێ لە زەمینا
یاریش بە غەزەب حازرە، هەردەم لە کەمینا
عارەق دەڕژێنم لە هەموو چاوی برینا

بازاڕی تەواوم هەیە (ڕاجی) وەرە ئەمشەو.

(٨)

ئاواتی مەرگم، شادیم، نەخۆشی
ڕۆژانی ژینم، ڕۆیین بە بۆشی
چەند بازاڕم کرد، بە خۆفرۆشی
فنجانی خۆشیم هەرگیز نەنۆشی
مەحەك و گۆگرد، هەر گرد و کۆمە
گۆی کردم بە شەق، لەو گرد و گۆمە
نەهۆم ناهێنم، لەو دوو نەهۆمە
مێردەزمەی غەمم بە کوڵ و دۆشی
ڕەهەندەی جەفای باپیر و باوان
هەتیوەی پەناو، چوغڵ و بەد ناوان
سووتاوی چاکەو، خنکاوی تاوان
هەرچی هات دڵم هاوڕشتە کۆشی
چی سوود و قازانج، لەم دونیا کۆنە
هەزار مێردی کرد، هێشتا نەهۆنە
بە بۆڵە بۆڵ و، بە هۆنە هۆنە
هەر گێژی مژاند، هەر هۆشی دۆشی
لایێ بە شاییو، چەپڵەو چەپاڵە
لایێ ڕەشاییو، تەپڵەو تەپاڵە
مێشکم بە تاڵ و، نەشکم قەباڵە
پاڵەی ئاواتم چی تێ نەکۆشی
دونیا گەژمێری پیاوی زەنگین بوو
پارووی بەتام و چەور و شیرین بوو
لەگەڵ زانایان، دژو بە کین بوو
نەهات بەزەیی و ڕەحم و پەرۆشی

هـــاوارە ڕاكـەن، ڕا بـــن، ڕەهـــا بن
تاكەی بـە (تاكە)ی جەورو جەفا بن؟
ڕەش‌و ڕووتەو قووت، نەخۆشی تا بن
گیان بە لەرزەوە، كەس دای نەپۆشی
ســـەرماو برایەوك، ئێمەو ناكۆكی
خەلكی هەلێدا، بە جاكی‌و جۆكی
ســـەد ماوەی بری‌و جارێ نەكۆكی
خاكی ئێمەی برد (ڕیـــتۆ فلۆشی)
سەرمەستی هیوار، سەرپەستی بارم
سەربەستی واتەو، بەربەســـتی كارم
دەشـــت‌و چیاو باخ، یانەو هەوارم
(ژیكۆ) شتێكم لێ دانەپۆشی!!.

## (چوارینی تاك)

ئەگـەر بیناســی بنیـادەم، هــەمووی تــەهلی وەتاغێكـە
لەسەرچـــاوەی چـــەماوێك‌و، لـــە قـــاوەی قاوەجاغێكـــە
بــە تــەبیات تێكـەلاوێك‌و، لــە ڕیــزا ڕێكخراوێــك بــێ
لەبەرچی وا هەمووی وەحش‌و، درنج‌و بـێ دەماغێكـە؟!!.

**

## أ- پێنجین

(١)

سـەیری فنجانی مەمو، بادەی دەمی زیبا ئەکەم
یارمـەتی چاوی خومارو، ماچ مەزەی ڕەعنا ئەکەم
ڕەسمی شاباشـی لە هەڵقەی پەرچەمی مینا ئەکەم
یانەیی بەختم لە سـینەی گوڵشـەنی سملا ئەکەم
شانشینیی خۆم لەکوڵمەی کەهرەبەی سیما ئەکەم
جووتی شاهێنی برۆی، پێویستە بۆ شاراوی دڵ
نەشتەری موژگانی بۆ شیشەو قولاپی شانو مل
دانەیی خاڵی لـە داوی عیشـقدا بۆ تەیری زل
ئاگری لێوانـی بـۆ برژاندنـی زامانی کوڵ
نەرمو نۆڵە، چەندە شل شل قامەتی سەودا ئەکەم
مەیکەدەو لۆقنتەخانەی بەزمو سۆزی (ڕەحمەخان)
ڕایەڵەو باڵا هەژانی بیدعەتو، شـۆری زەمان
نازی پڕ ئاواتی چاوی، عیسـمەتە بۆ نیشتمان
نامەوێ بەرگو مەعاشو، سیسـتەری بێگانەکان
خەسـتەخانەی گیانی زامارم، لەبی لەیلا ئەکەم
شەڕ لەگەڵ کەس ناکەمو، سوودی ڕیایی، نامەوێ
شـت لە کەس ناخوازمو، باراشـی مەرگم داکەوێ
من خەوی مەستیمە داپۆشیوەو قەت قەت ناڕەوێ
بیـری پارەو مامڵەتو بازاڕ ناکەم، هیـچ هەوێ
کۆنە پیشەی خۆمە خۆم ڕیسوای قەدی تووبا ئەکەم
دەوڵەتـی گریـەم هەیـە، وا پـڕ عەقیقە دامەنم
ڕنجبەری عیشـقم، لە نیشم گرتوون گیانو تەنم
پیاوی ئاغاو شێخو بەگ نیم، تووتی ئاسا پێکەنم
ئەو نەمامانەی خەڵك چاندوونی هەڵیـان ناکەنم

دوژمن‌و دورِندە نیم، چۆن کاری بێ پەروا ئەکەم؟
گەر لە سایەی نازی دلبەر، پاکەتی (لۆکس)ئەخۆم
گەر بە سەرخۆشی، وڵاتی عارەب‌و فارس ئەخۆم
گەر بەری پێ ڕانەگەیوی هەر دلی ئاوس ئەخۆم
ناوبژیکاری وەتەنم‌و، هەردەمە بۆکس ئەخۆم
سەد شوکر، توانام هەیە لەم خاکە ئەملاولا ئەکەم
باسی سێو‌و سەرو و بێ ناکەم، لە ئەم دامێنەدا
چون دلارامی بەنازم، لەو دەمەی بێ ڕێنەدا
ناکرێ باسی تەواوی، تا جنێوم پێ نەدا
شەرتە لەو گوڵزارە تا بەو لێوە میوەم لێ نەدا
باسی نارێنکی‌و گەزەندەی حورمەتی تەنیا ئەکەم
باس‌و جاسووسی لەسەر کەس ناکەم‌و، ناکەم هەرا
نیش لەکەس تێکنادەم‌و، نادەم بە ناکەس پرس‌و ڕا
هەر مشووری خۆم‌و هۆزی خۆم ئەگێرم، وەك برا
گەر لە کاتێکی دەرو تەندووری هیوا داخرا
قۆڵ لە سۆزا هەڵئەکەم، تا شل ئەبم هەر ڕا ئەکەم
دەوری پارەو پوول‌و مامەڵەت تێپەری، دەوری دڵە
ڕەنگی باران‌و بریقەو، بولبول‌و باغ‌و گوڵە
سازو نەی، قانوون‌و چەنگ‌و بەربەت‌و سەرهەنگڵە
هەرچی لەم مەیخانە دوورە، عاشقی مەرگ‌و گڵە
هەستە (ژیکۆ) چاو لە منکە، سەر پری سەهبا ئەکەم.



## ب- پێنجینی تەرجیع بەند

(١)

ئەی خوا! لەم ماوە داماوم بە پاوە، یا نەجات
بەشخوراو، پێ بەستراو، کارم کراوە، یا نەجات
مەرگە سەرخۆشیمو زیخم پڕ لە چاوە، یا نەجات
گیان لە گیرفانی دڵم بێ ناز ماوە، یا نەجات
ڕاستەبازاڕی ژیانم بەستراوە، یا نەجات

کێ هەیە پرسێکی پێکەم، ڕاستیم پێدا وەڵام؟
کێ هەیە دوورە شەڕو داواوو ئاشنایی سەلام؟
کێ هەیە هاوتای هەقو یاریو دروستیو ژیرو فام؟
هەرچی هەس دووڕوو و درۆزن، پاشەژەن، پێشەو خوڵام
شێتو سەرسام بووم، دەلیلێکم نەماوە یا نەجات

ئەی خوا، تۆ ئادەمت کردە فریشتە، یا بەشەر؟
گەر بە تەنیا ئادەمێ بوو، بۆچی کردت دەربەدەر؟
بۆچی کوشتت، بۆچ کوڕانت کردنە وەحشیو زەرەر؟
بۆچ ڕقت هەستا لە ئەملاکو، زەویت کردە کوژەر؟
ئێستە داوای ئادەمییەت ڕێی براوە، یا نەجات

تۆ وتت ئادەم لە قوڕ خوڵقاوە، شەیتان ئاگرە
خاک تەبیاتی سوبحاتو سەبرە، ئاگر باغرە
ئێستە ئێمە بووینەتە ئەو خۆڵەمێشو داسرە
هەر ئەتۆی کارت بەگشتی، پێچەوانە حازرە
گەر سەرو کاری قەدیمیت ڕا براوە، یا نەجات

گەر هەموو پێغەمبەرانت ناردوون ئیش سەرکەوێ
چاوی ئەم قانونو وەحیانەت کە هەرگیز ناخەوێ
شەرتی ئینسافە کەسێ خۆشتبوێ، قەت نەسرەوێ
ناحەزە، سستیو بەتاڵیو نامرادیمی ئەوێ

من کـه کوورەی دۆزەخم بۆ داخراوە، یا نەجات

عـالـەمـی کۆنو نوێـی خاکیتـە، خاك قووتـی ئەدا
گێـژو لوولـی بـارەشو بـارانە، بـەر لووتی ئەدا
چەند بەریدو میلی لێ ئەسـتێنێ، یەك فووتی ئەدا
ویـش، بـەمناوی ئەركو مەرگو گۆڕو تابووتـی ئەدا

کار وا دژوارو سـەختو ناتەواوە، یا نەجات

ئەمـخەنە ژێر بـاری کۆتو، هـەر فەلاقەو پێ لەقە
ئەمدەنێ ژەهرو زەقوومو، سەردەمێ ئەمکەن شەقە
نابـڕێ تـۆپو تـڕی ئـەم هۆزە لێـم هـەردێ تەقە
توخوا ئەم حالە بۆ مەخلووقی سەربەستت هەقە؟

چاو پڕ تاوو، دڵ بە تاوو، گیان بە داوە، یا نەجات

دڵـبـەری خـۆ پێـوەنـانو، پێـوەدانو، پێـوەچـووم
پێـوە ڕسـکـی بێ حـەیایـیو، پێوە ڕێژی نابڕووم
خامـەکێشـی نەخشـی تۆمو، تانەکێشـی کوندەبووم
چی هەڵێنێ دەم وەکو من، هەر ئەڵێ بەم چەشنە چووم

ناسەواری چاکە پاشەوپاش گەڕاوە، یا نەجات

ڕووڕەشیو دوودەستە ئەژنۆیی، گەلێك پەیدابووە
بێ ڕەوشـتـیو تەمـبەڵی، ڕەنگی ژیانی بردووە
خانەقاو تەکیەو دەسیسەی دوژمنان سەرکەوتووە
هـەر مـناڵێـکی هەبـوو، لێوی پژا بەم جادووە

بێژە (ژیکۆ) بەشخوراوە، یا نەجاتو، یا نەجات!!.

(٢)

کە مەیخانەی ویساڵت هاتە ناو جۆش
کە یارو یاوەرت کردن سـەفاپۆش
لەناو بەزمو نەواو کەیفو دەفو نۆش
کە ڕازاوە حیجابی مەجلیسـی خۆش

له نەشئەی مەی، نەکەی بمکەی فەرامۆش

تەماشا! چۆن دەنۆشن مەی، نیگاران؟
لە گوڵزارو چەمەن، وەختی بەهاران
دەگێڕن چەرخی زوڵفەت چاوخوماران
ئەتۆش قیری سیا، وەك گشتی جاران
لە خەندەی مەی، نەکەی بمکەی فەرامۆش

ئەوا پڕ بوو دڵی عالەم لە چاوت
هەموو مەستانە هەستان، چوونە داوت
عەجەب ئازادی کردن قەددی لاوت!
ئەگەر ئێمەش جەفاکێشین بە ناوت
لە گریەی مەی، نەکەی بمکەی فەرامۆش

لە ڕێگەی عیشقدا دەرچوو حەیاتم
تەمام هەر تۆ بوو بۆ فەوزو نەجاتم
کراسی مەرگ، گەر کردت خەڵاتم
لە پێش کوشتن، بە فیدیەی، من فیداتم
لە شێوەی مەی، نەکەی بمکەی فەرامۆش

دەمێ فەرموو، لەسەر چاوم مەکان کە
دڵی پیرم، بە یەك لەنجە جوان کە
لە سۆزم، دەفتەری عیشقم ڕەوان کە
دەخیلت بم، سوئالی بێ کەمان کە
لە سووزەی مەی، نەکەی بمکەی فەرامۆش

بە جیلوەی رووت‌و نەشئەی چاوی خەممار
بە خەندەی دەمت‌و ریزەی لەعل‌و مروار
بە توحفەی مەمت‌و سینەی ساف‌و گوڵزار
لە ژێر خێمەی سەرو زوڵفی پڕ ئەنوار
لە بادەی مەی، نەکەی بمکەی فەرامۆش

ئەگەر بیشەمکوژی قوربان ڕەوایە
کە دەرمانی ئەلەم کا، هەر خودایە
دوو چاوت لێم بە دایم نارەزایە
ئەگەر (ڕاجی) لە خزمەت بێ حەیایە
لە خاسەی مەی، ئەکەی بەکەی فەرامۆش.

(٣)

چ خودایێکە دەکا چەرخە بە ڕووی کەون و زەمان؟
دابەشی کردووە ئەم خەڵکە، بە چەند جۆری جوان
هونەری داوە بە پیاوان و، زەڕو زیو بە ژنان
ناگزووری بە مەلا داوە، گزووریش بە نەزان
دەوڵەتی داوە بە کەر، نیعمەتی داوە بە سەگان[1]
ئەم نیشانانەیی دونیایە، بە دەردو بە بەڵا
بەم هەموو ناگرو ساماڵ و هەوار هەورو هەڵا
باخچەوو زورگ و گیا، کەندو چیا، دارو گەڵا
دڕک و گوڵ، شایەدی نێزیکە لەسەر ئەم کە خوڵا
دەوڵەتی داوە بە کەر، نیعمەتی داوە بە سەگان
دەوڵەمەند ناوی لە دەمدایە، دەڵێ واوە نەچی
ناقڵەو عیلمی لە دڵ دایە، دەبێ خوارو کەچی
حاتەمی تەی بە گونی نابێ، کە بۆ مەرگ ئەچی
پاڵەوان بێبەش و، هوشیار گرانبارو، کەچی

---

١ حاجی قادری کۆیی لە شیعرێکدا دەڵێ: (هەر ئەدیبێک بووە سا خوا لە دەمی ناوە بڵێ: دەوڵەتی داوە بە کەر، نیعمەتی داوە بە سەگان). دیوانی حاجی قادری کۆیی، گردو کۆو پەخشکار: گیوی موکریانی، چاپی سێیەمین، چاپخانەی هەولێر، ١٩٦٩، ل ٤٢.

هەروەها، دیوانی حاجی قادری کۆیی، لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی: سەردار حەمید میران و کەریم مستەفا شارەزا، بەغدا، ١٩٨٦، ل ٨٢.

دەوڵەتی داوە بە کەر، نیعمەتی داوە بە سەگان

قاوەخانێکە پڕی بەزم و هەراو زەلزەلەیە
دەغڵو دانێکە پڕی ژیلو سنو خەرتەلەیە
مێرگو قشلاغە پڕی کاوڕەلەرو بزگەلەیە
من دەلیلم بە خودا گیانە کە حاجی شەلەیە

دەوڵەتی داوە بە کەر، نیعمەتی داوە بە سەگان

لەم هەموو بەش بەشی دونیایە، براکەم! شڕییە
لەم هەموو خۆشییەدا، مەردە لە قاتوقڕییە
مەشکەیی شێخ لە ڕیا، هەروەکو ئاخوڕ پڕییە
تۆش بڵێ کاکە وەکو من، ئەمە باوکی خڕییە

دەوڵەتی داوە بە کەر، نیعمەتی داوە بە سەگان

لەم بەرو دەرگە دووسەد گورسنە پاراوەتەوە
بە دڵی پڕ غەمو سپەلکی ڕەشی ماوەتەوە
چونکە دیتوومە هەموو ناکەسو بیچ، ساوەتەوە
من بە ئەم نوکتە لەرێی خەڵك تەڵەم ناوەتەوە

دەوڵەتی داوە بە کەر، نیعمەتی داوە بە سەگان

بەحەمە من لوتفی خودا، هێندە کە ناسیومە بە یەك
باوەڕم زۆرە بە پێغەمبەرو قورئانو مەلەك
کردەوەی خۆم کە بە هانا بێ لە ڕۆژانی کوتەك
(ڕاجیا)، چیم بەسەر ئیمڕۆیە بە میلیۆنو بە لەك

دەوڵەتی داوە بە کەر، نیعمەتی داوە بە سەگان!!.

(٤)

براکان، وەرنە سەیران وا بەهارە
شنەی باوەش، کزەی جەرگو دەمارە
نەشەی پشکووتنی سەد لێوو زارە
زەماوەندو گریشەی گیاوو دارە

لە کوردستانی شیریندا دیارە

لە لایێ هەولێرو هۆی کوڕ تێکەڵاوە
لە لایێ بەینو بەستو، چاوو ڕاوە
لە لایێ بەزمو ڕەزمو، بەندو باوە
بە هەر لادا ئەڕۆی، هەر تافو تاوە

لە کوردستانی شیریندا دیارە

دەمێ سۆزەی سەرو، سەوزەی لقو چڵ
دەمێ لەنجەی قەدو، پەنجەی گوڵو مڵ
دەمێ پرشەی گەڵاوو، مرشەیی پڵ
دەمێ ورشەی هەناوو، دووکەڵی دڵ

لە کوردستانی شیریندا دیارە

چراخانەی شەوی بەزمی گەلاوێژ
بووە سێرەی ئەسێرەی کوردی چا بێژ
بە سەردو گەرمی هەر مەحلێکە ڕاوێژ
دەوارێژو، هەواچێژو، تەمانێژ

لە کوردستانی شیریندا دیارە

چریسکەی کۆو تەرازووو حەوتەوانە
تریسکەی موشتەریو زوهرەو کەوانە
لە چەخمەی بەرخو شێرو گوڵ ڕەوانە
ئەوانەی بۆ گەلاوێژن شەوانە

لە کوردستانی شیریندا دیارە

لە سێوەیلا ئەما تاوی کلکدار
چزووی دووبشکە ڕشتی گومگومەی ژار
دەوولکو ماسییو، قرژاڵو گابار
بە پێوە یا بەڕێوە، مەستو بیمار

لە کوردستانی شیریندا دیارە

تکاتان لێ نەکەم شـێرانی شـەرزە
لە سەردا وەرنەخوارێ، چەشـنی تەرزە
ژیانی نیشــتمان، ئەر پەستو بەرزە
ئەوەی سـاغو شەپرزەن، لەم دوو وەرزە
لە کوردستانی شیرینددا دیارە

هەلالەو ســتکو ڕەیحانە ســـەپانە
دەمی شـــێرو پلێنگو لـووتەوانە
چەقیلەو مۆردو مێلاقو نیســـانە
لە چاوو ڕووی بەهەشتی مەن نیشانە
لە کوردستانی شیرینددا دیارە

دلۆپـــەی چـاوی (ڕاجی)، لالەزارە
لە ڕەنگاوڕەنگی سارا، غەم گوسارە
گوڵەو هەروا لەسـەر قەلغەت سوارە
هەمـــوو هـــەر کیمیایی کردگارە
لە کوردستانی شیرینددا دیارە.

(٥)

ئەم هەمـوو خوێنـاوییە، خاکەی لە کوردســـتانمە
ئەم هەمـوو بــاغو زەویو هێلانــەیــی باوانمە
ئەم هەمـوو ڕووبـارە ســـوێرانە، کوڵــی گریانمە
ئەم هەمـوو ئاڵو گەشو، سوورە گوڵەی مێرگانمە
خوێنـــی باوکەو مامو ئامۆزاو بـراو یارانمە

بـــێ کەســـوکارو هەتیـــوو، دەردەدارو ڕەنجەڕۆم
- تا- گرانی کردووم، ســـــەرباری زامو سێبەڕۆم
بۆ دەوا، ژەهرم ئەدەن تورکو عەجەم، ئینگلیسو ڕۆم
کاکی خۆم کەی چا دەبم؟ مەنناعەیەك ئەمەی لە خۆم
هەر دڵم مابوو، تەقی کردو چەشی کرمانمە

پێبزانە گیانی شیرینم، لەکوێ هاتوویەدەر؟
بێجگە لەم خاکەی کە تێیدا بوویە تۆزو دەربەدەر
بۆچ بە مەردی، باوکەو دایکی خۆت نەناسی، قوڕبەسەر؟
مەمکی دایکو تەربییەی باوکت بەکارت بێ، مەگەر
باوکە ئاوارەی وڵاتو، دایکە سەرگەردانە

تێکەڵی هەر هۆز ئەبی، بوویە هەوێن، کردت بە زێڕ
ئەیمژن بێگانە خوێنت، تۆش ئەبی چرچو چەوێڕ
مێشکو مۆخت دەرئەهێنن، ئەی ئەزانی گێژو هێڕ
جا وەکو بوخچەی ژنانیش، ئەتخەنە هەرزاڵو تێڕ
حاڵی تۆ هەر من ئەزانم، بۆیە قوڕپێوانە

ئیشو زانینو هومێدی کوردە ڕۆیی، وەك پلار
کەوتە دەستی نابەکاران، ئەیوشێنن بێ ژمار
هەرچی لاقو دەستی کوردە، ئەیشکێنن وەك شکار
داخەکەم، بێگانە بوونە ڕۆستەمو ئەسفەندیار
تەفروتوون بۆ تورکو ڕۆمو عارەبو کوێستانە

ئەی گەلی هاوخوێنی شیرین، وەی گوڵی خۆش بۆنو ڕەنگ
گەر مناڵێکت ببینم، ئەیمژم وەك نوقڵو بەنگ
پیرەمێردێکت ببینم، ئەیخەمە شان وەك تفەنگ
زوڵفی خاتوونان ببینم، بۆ کەمەندمە ڕۆژی جەنگ
تۆزی پێڵاوت، وەکو نازت لەسەر چاوانە

کۆمەڵێکم پێکەوە نووساوە، دڵ شەیدایەتی
هەرچی قازانجی وڵاتی کوردە، ئەو پەیدایەتی
هێندە گەورێکی ئەفامیش، زەرتکو سەودایەتی
وا لە تیمارخانەکانی لەندەنو بەغدایەتی
بەس لە مەیدانی هونەردا، هەوهەوی مەردانە

سووره سێوی ڕوومەتت، بۆچ زەردە ڕۆڵەی شیرینم؟
هەر منم، بێگانە نیم، دۆستم، مەزانە دوژمنم
هەر لەبەر دووری دوو چاوی تۆیــە بۆرو چلکنم
ئێستە پێت شـابوومەوە، خۆشە ژیانو مردنم
تۆم لە دەم دوژمن دەرێنا، شـایی‌و سـەیرانمە
پایەداری کەی خودا، هەرچی لـە کوردە پێشـەوا
ناوی تۆم لێ بەستو ڕووی خۆم کردە عاسمانو حەوا
خاکـی خوێناویـم بکاتـە گوڵشەنو ئاوو هەوا
تاکو (پشکۆ) قەت بەکەس نەکوژێتەوە، بەختی ڕەوا
بەشکو گەرمی کاتەوە، هەرچی دڵی کوردانمە!!.

(٦)

بووکی چەمەن سەوزە بوو، سوور بۆتەوە
تك تکەیـی شـەونمی ڕشـتۆتەوە
مێـزەرو دەســماڵی کـە کردۆتەوە
چـاوی قـەلانیـش خـەوی بـردۆتەوە
دڵ بە گەشـــی باوەشی کردۆتەوە
بەزمـی گـوڵو بادەوو دوو چاوی یار
وا ئـەگەڕێ ئـاو گەڕەکـی نەوبەهار
پڕ لە حەزو زەمزەمەیی چەنگو تار
کـاری لـە نەورۆزێ ئـەکا چاوەزار
هەرچی کە سووك هاتو گران چۆتەوە
قوڵفی کەمەر، تـا ئـەترازێ لەبەر
دوگمەیی مەم، تا نەمژێ مێشکی سەر
ماچـی دەمان، سەرنەکرێن سەربەسەر
دڵ چ نیـازێـکی نییـە بێتـە دەر

بەحری کوڵی، چونکە نەنیشتۆتەوە

کاتێ لە پەردەی گوڵی سووری خزا
جەرگی بە تەندووری خەسووی داچزا
بووکی بە فرمێسکی بەڵاڵووکی زا
کۆرپەیی خوێنی کە مژاوو دزا
بابەکەشی خوێنی نەمەندۆتەوە

شیوەنە لەو ماڵە، هەتا دێتە چەنگ
بەرگو گەنم، نەوتو خەرێتەو تفەنگ
هۆزی شەپرزەی تەقەلا، دێ بە جەنگ
هیچ لە سەرکەوتنی ناکا درەنگ
کەس جڵەوی ئەسپی نەبەستۆتەوە

تێبگە حەزکردنی جاحێڵو کچ
چۆن ئەگەنە یەکترو، کۆڵانو رچ؟
خۆشە دەمێ ماچی خەتو خاڵو لچ
سەختە دەمێ، گرژییو تۆرانو خچ
دەست بە کەلەپچەو بە سەری کۆتەوە

تێنەپەڕن لەشکری خەم، جوون بە جوون
تا بکەوێ هێزی هونەر، سەرنگوون
ئێستە کە هەڵسێتەوە لێوی بە خوون
دوژمنی ناسیوە لە رێی چەندو چوون
دەستی نەنێ، شەرتە بە (پشکۆ)تەوە.

(٧)

لەگەڵ هۆزا مەبن خوودارو دووڕوو
بکێشن بۆ هەموو ئێشێ تەرازوو
برێژن ئاوی چاوو رەونەقی ڕوو
بنێژن گوڵشەنی هۆشو دەمودوو

هەڵـستە ئەی گەلی کوردی خەواڵوو

لە ڕۆژی ژین، هەموو گەر بێنە کوشـتن
بە مەردی، نەک، حەیا قەترێکە ڕشـتن
زمانو دڵ بکەن خاوێن، بـە شـووشـتن
گران بکڕن یەکییو، پیـسـی فرۆشـتن
ڕەوانـی قووت بـدەن قازانجو پاروو

سـەری بەرزو، دڵی خاوێن سـوپەر بێ
ڕەوشـتو بەرگی شـادیتان لەبەر بێ
دوو چاوی نیشتمان، ڕەوشەن نەزەر بێ
پڕی سـەربەسـتییو جەژنو هونـەر بێ
نەبینێ شـێخو مێخو سیحرو جادوو

سولەیمان، گەر ئەڵێن کاری بەقاش بوو
خودا دابووی، هەموو نیشـی بەلاش بوو
بـە عەقـڵو هۆشو ئازاییو تەلاش بوو
لە چەوتیی دوورو، سەربەستی وەڵاش بوو
جـەماتی مەردییو عیلمی لەلا بوو

گزنگی ڕۆژی کۆمەڵ، کەوتـە کێوان
مەترسن قەت لە شەیتانو لە دێوان
بنۆشـن بادەیی خۆشـی بە لێوان
بە کردەو مەشقو هەڵکێشانو پێوان
بـە گیان پەروەردەکەن منداڵو زاروو

جەماوەرکەن، کە کارێکتان لە پێشە
بـە تەدبیر بیخەنە کار، بیرو تێشـە
ڕەگی ژین بێ میانە، هەر بە هێشـە
سەروکاری هەموو شت، کێشە کێشە
شـتی ڕەق ڕەق بنێنە بن پەراسـوو

به زانین، سەنعەت‌و فەن ئاوەدانە
کلیلی دەرگەیی شادی‌و ژیانە
تەماشای دڵبەرو باخی گوڵانە
هەموو دەم، ڕۆژو مانگت پاسەوانە

وەرن (ڕاجی) بدەن باوەش، لە بانوو.



# ج- پێنج خشتەکی

(١)

## پێنج خشتەکی لەسەر غەزەلیکی ئەدەب

بـــابیتەوە هاواری دڵو خاك پەرســـــتان
میللەت بخوڕن، هەروەکو شێران لە نەیستان
تا سەربکەوێ خاکی وەتەن، وەك گوهەرستان
ئیمشـــــۆکە برازێنـــەوە ڕیزەی گوڵو بوســــتان
قەت هەڵنەوەرێ گوڵ لە تەمەن، جان لە تەنستان

**

کۆمەڵ بکەن‌و، ڕێکیبخەن زینەتی مەوتەن
لاوانی عەشـایر، کوڕە جاحێـلی تەهمەتەن
بگرن بە هەوەس، دەسـتی برایانە لە گەردەن
بادە بەسە بۆ بێن‌و، بدەن مەی، بە خەمی دەن
ئیمشـــــۆکە شـەبوستانە، با بێتە گوڵستان

**

ئێمە بـە چ حاڵێکەوە مـردین‌و گرفتار؟!
خوێنی دڵو چاومان ئەڕژێ، تاڵە لـەب‌و زار
گەر بێتو لە مە هەڵبکەوێ گەورەو سەردار
چەند خۆشــە لە پردا، کە دلارامی وەفادار
خۆی بێتە عیادەت لە نەخۆشان‌و لە خەستان

**

پاشا بە عەدالەت بێ لەگەڵ میللەت‌و ڕەعیەی
پۆل‌و ســـــەفی دوژمن، وەکو تۆمار بکا تەی
لێدا بە بەشارەت لە وەتەن، چەنگ‌و دەف‌و نەی

خۆشــــتر نییە بۆوەی کە نیساری قەدەمی کەی
سەد جانی عەزیزت، نە بەدەستێ، بە دوو دەستان

❊❊

هەر کەس کەببینی لەچەمەن، یا سەری کێوان
بیــکەی بــە برای خۆتو، نەبێ پەردەوو نێوان
هەرچی کــە بگەی پێیو تۆ بیکێشییە گریوان
جارێ شـــــەکەری لێوی ئەوەند بمژی بە لێوان
شەهدی شـەکەرت بتکێ لەبن ناخونی دەستان

❊❊

بەزمێکی یەکیی بێنییە ڕوو، خۆت کەیە نەعلی
تەبعــی بگری، هەڵبکەنــی ڕیشـــەیی جەعلی
وەبــزانی لــە پەردەی وەتــەنا، ویننەیی بەعلی
جارێ ســـەری کوڵمەی بگەزی، گاهـ لەبی لەعلی
گەهـ بنکی دوو مەمکی بگری، گەهـ سەری پوستان

❊❊

شــیرینو تەڕو شۆخە وەتەن، دڵبەری میللەت
قازانــجی دڵو گیانــە، ژیانــی ســـەرو دەوڵەت
جارێ کە بکا مەیلی عەدو، خۆشە بە هیممەت
گاهـ زەحمەتی دەی، گاهێ نەدەی، گاهێ بە تەیبەت
ڕێــکی بگوشــی، عوزر بەزیرایە لــە مەســـتان

❊❊

بووکــی وەتەنت، هــەر کە بە تۆ نازو ڕەهی دا
بۆ کردەوو بــۆ مەعریفەتت، گەنجی شەهی دا
بەو مەعدەنو بەو سککە کە هاتو نیگەهی دا
ئەمجارە قەدی خۆت، لە قەدی سەروی سەهی دا
باڵێنـــی وەکــو مار لــە ئەخلی عەرەبوســـتان

* *

تاخۆ بــە دڵی شـــاد نـەبینم کە چرا دێ؟
بـەزمی وەتەن و ڕێکییو عەدڵ و سەرو پا دێ؟
(ڕاجی)، بە ســوتالێک و جەوابێکی بەقا دێ
تاکەی (ئەدەب) ئەم عوشرەتە، هەر تاکو ئیدا دێ
مردووت بـەمرێ هەمــستن، ئەوا مردوو هەڵستان.

* *

# بەندو بەیت

## أ- ناونیشانی کوردان

(١)

هانام بە بەر تۆ یا غەففار
سوڵتانی شاخو دەشتو شار
دامەزرێنی لەیلو نەهار
ڕزقی دەدەی بە موورو مار
هاوین، زستان، پایز، بەهار
چەرخت گێڕاوە پایەدار
بەخێو دەکەی گەداو توجار
بزر ناکەی یەک تۆزە کار
لە هەموو حاڵێ ئاگەدار.

(٢)

ئاگاداری هەموو حاڵان
هەی دەردەدارو چاو کاڵان
لەناو شاخان، لەناو ماڵان
ڕەحمێ دەکەی بە عەودالان
دایان پۆشن بە دەسماڵان
چ هۆدەو ناز، چ بن داڵان
بە ماچان بپرسن حاڵان.

(٣)

بپرسن حاڵی فەقیران
دەریان بێنن لە زنجیران

بارانیـــان مەکـــەن بـــە تـــیران
هـــەروەك دیـــلان و نەچـــیران
لـــەلای خـــەزێم و لاگـــیران
بـــۆ منـــی هـــەژارو مـــاڵ وێـــران
جێگـــای ماچـــمکە، دەســـگیران
لـــەناو ڕەزان، لەســـەر بـــیران
هـــیچ مەترســـێ لـــەبی پـــیران.

(٤)

لـــەبی پـــیران، نـــەتبێ باکـــە
نازەنینـــەی ڕوومـــەت پاکـــە
هـــی چاومەســـتەی پـــڕ تریاکـــە
گـــەردن بللـــووری ئەفلاکـــە
بـــەو خودایـــەی تـــەنیاو تاکـــە
ڕۆحـــم دەڵێـــی لـــە ژێـــر خاکـــە
بـــەدەن دەڵـــێ: لـــێم حاشـــا کـــە
لـــە داخـــی تـــۆ، جـــەرگم چـــاکە.

(٥)

جـــەرگم ســـووتاوی کوڵمانـــە
لـــەبن ڕیـــزەی ئەگریجانـــە
شـــنگ و هـــەڵاڵ و ڕەیحانـــە
دەســـتە دەســـتەی کاکۆڵانـــە
گیابەنـــدو خـــاوی شـــاخانە
میـــسك و عەنبـــەر چـــەند هەرزانـــە

غالییـــەی عــەتری شـــارانە
نموونــــەی زوڵفــــی یارانــــە
دەڵێـــــی ڕیــــزەی بارێزانــــە
لــــە دەم شـــەکراوی چـــاوانە
داغـــی ســـەر جـــەرگی باغانـــە
بــــــڕوانن ئــــــاخر زەمانــــــە!!.
(٦)
ئـــاخر زەمـــــانم لـــــە چـــاوە
شـــەرمو حـــەیام هـــەڵگێراوە
پیاڵـــــەی شـــــەرابی دانـــــاوە
نێـــرگس لـــە دەوری ڕســـکاوە
مـــەزەی خـــاڵو خـــەت کـــشاوە
هێـــشتا دەســـتی لـــێ نـــەدراوە
جووتـــن بـــادەی لـــێ نەخـــشاوە
ســـاقی بـــۆم بێنـــە بـــەم لاوە
ئەجـــــەل نێزیکـــــە، وەســـــتاوە
شـــیری بـــڕۆی دەرکێـــشاوە
جەوهـــــەرداره، تـــــازە ســـــاوە
تـــیری برژانگـــی دانـــاوە
خێرابـــــە، کـــــارم تـــــەواوە.
(٧)
کـــارم تـــەواو لـــە کـــەوانی
دڵـــی کردوومـــە نیـــشانی

لەبەر شوعلەی دوو کوڵمانی
وەك مانگو ڕۆژی تابانی
بزرم ناکا لە چاوانی
بە پڕشنگو بڵێسانی
بە موبجانو درەوشانی
بێ فەرقن شەو بەیانی
بەخوا خۆشە ڕاموسانی
سبەینانو، ئێوارانی
نیوە شەو، نیوڕۆیانی
پاش عسرانو، بەیانیانی
چێشتەنگاو، ماڵ نوستنانی
شەکرو شیرو خەمرەکانی
هەنگوینی بێ هاوقەرانی
بەرەو خوار بێی، بۆ لێوانی

(٨)

لێوی چی؟ ئاوی حەیاتن
زێڕی سووری بێ زەکاتن
یاقووت ڕێژن، بۆ وەڵاتن
شیفای سەد نوقڵو نەباتن
چەند پاشای بەرزی بۆ هاتن
چی فەوتانو، چی هەڵاتن
هێندێ بە هیوای خەڵاتن
وەکو من بێ دەستەڵاتن

بــەڵام بــە ســەبرو ســوباتن
دایــم لــە ســەوداو مــەزاتن.

(٩)

ســـەوداو مـــەزاتی لێوانـــە
موشـــتەری ڕیـــزەی ددانـــە
دوڕڕو گەوهـــەر بـــە بارانـــە
مامڵـــەتگرم ماڵوێرانـــە
ســەودای بــە خــوێنی چــاوانە
هێــشتا دەڵــێ چــەند هەرزانــە.

(١٠)

هەرزانـــە کـــوێی زەقـــەنێ
داڕژاوە بـــە ســـەد فـــەنێ
قــەت دەرنایــە لــە مەفتــەنێ
لەســـەر قـــەڵاتی گـــەردەنێ
قوببــەی ســەد ڕەنگــی مەعــدەنێ
قوربـــانی بم، پێدەکـــەنێ
ڕۆحــی عالــەم هــەڵ دەقــەنێ
مووســا ڕۆیــی بــۆ مەســکەنێ
لــە شــێوەی غەبغــەبی تــەنێ
پــێڵاوی پــێ دادەکــەنێ.

(١١)

نــەعلی چــی؟ نێــرە تەووایــە
جێگـــای ناســـینی خودایـــە

گەردەن، داری داگیرسایە
شەویش، تاریك و سەرمایە
هەورو باران، ڕەعدو بایە
دەستەچیلێکی بۆ نایە
سەر لێ شێوانی مووسایە
بیزانن کاری مەولایە
هاروونیش هاتە هانایە
تەسخیری فیرعەونی شایە
بە کەوکەبەو تەماشایە
با غەرقی کەن لەم داوایە
نوورەی موعجیزەی عیسایە.

(١٢)

موعجیزەی عیسا لە سینە
سفرەی خودای بێ قەرینە
ناردی بۆ قەومی بێ دینە
ئیمان بێنن بە یەقینە.

(١٣)

سفرەی شیرین، سینگ و مەمە
چارەی هەزار دەرد و غەمە
بللووری ساف و بێ تەمە
بە فنجان و، بە زەمزەمە
دەلێی دایەرەی عالەمە
خڕو پڕو شەکرلەمە

سارێژی گشت دەردو غەمە
هەریەك خونچێکی بە دەمە
بەشی هەزار هەزار جەمە
نیمان بێنە بە دڵو دەمە
نەوەك بتکاتە شەمشەمە
ئەی خۆشەویستەی هەمدەمە.

(١٤)

ئەی هەمدەمەی کارو باران
ئاشقی باڵای چاو بەخوماران
دڵ بەلەرزەی گوارەداران
لێقەوماوی گوێ بە گواران
بروانەی چۆچەی هاواران
لەسەر لاجانگی نازداران
سەر نشێو دێن، هەروەك جاران.

(١٥)

هەروەك جاران، نەرمو شلە
لە ڕێی کەزیەی، چاوم کولە
ماری ڕەشی شانو ملە
هانا دەبا، بە بولبولە
گەردن لغیش لەسەر پلە
دەڵێی ماڕووتی بابلە
هەڵاوەسراوی کاکوڵە
کرمزکەی دێنە بەر دڵە

ئــــەمجا نـــــۆرەی قەنەفلّــــــە
جانتـــای عــــەییاری لـــــە ملـــە.

(١٦)

لـــە مـــل، جانتـــای عەیــاریــــە
مێخەکبەنـــــــدی دلّداریـــــــــە
پــــــەروەردەی بێنــــــی باریـــــە
بـــــە زنجـــــیرەی نازداریـــــــە
ســــەودای لادێیــــی و شــــاریـــە
بـــــە پــــیرۆزەو مرواریــــــــە
هـــــەوای لـــــە ڕووی ســــەرداریە
لەســــــەر ســــــینەی بەھاریــــە
ســــەد گــــوڵ خونــــچە بەزاریــــە
نێـــــرگس بەشــــی غەمخواریــــە
چـــاوی زەردبـــــوو، یەکجاریــــە
ڕەنگـــــی ســــپی ســــەرباریـــە
قــــوڕ بەســــەر مــــن، ڕێــم هاریــە.

(١٧)

ڕێـــم هاریــــــە، وانــــــەم دوورن
ســــوورو ســــپی، ڕەنــــگ بلــوورن
ســــەوزو ئــــاڵ و، زەرد و ســـــوورن
هــــەژانی بــــەنك و بــــەن مــــوورن
دوگمــــەو هەیاســــەی پــــڕ نـــوورن
کەمبــــەرەو لوولــــەی مەســـــروورن

سەرگەرمو مەستو مەخموورن
لەشکری بێ باسکو بوورن
لێیان دوورە هەرچی زوورن.

(١٨)

هەرچی زوورە، لێیان نایە
مێرگیان بە ئاوو هەوایە
هەریەك لە داوایەك دایە
بێ ئەزیزم لەم دونیایە
ورشە ورشم لە پەنایە
چ لەم لابێ، چ لەو لایە
بەهەشتم جێگەو مەئوایە.

(١٩)

جێگەم لە باغی بەهەشتە
قاشی ئاوکی چەندە خشتە
شوورشەی زگی سافو دەشتە
نەخشاوی خاڵ، حەوتو هەشتە
توورتو تەڕو لووسو گشتە
وا دەبێ حۆری سروشتە
پیرۆزیان بێت ئەم فریشتە
بەناو ئێکە، هەزار چشتە
یەك تەختەیە، خشتو مشتە
هەر کاری وەستای بێ پشتە.

(۲۰)

کـــاری وەســـتای بـــە حـــەواوە

هـــەر بـــە نـــەمرێك دارژاوە

قـــوبییێکی وای لـــێ هەڵـــداوە

نـــاوی ســـەد گـــەنجی لێنـــاوە

ئـــەم ئینـــسانەی وا بـــەر چـــاوە

هـــەی کاکـــە لێـــرە ڕســـکاوە.

(۲۱)

هـــەی کاکـــە جێـــی جوســـتوجۆیە

لـــە دامێنـــی گـــەردن، گۆیـــە

مابـــەینی نـــاوك و ئەژنۆیـــە

تـــەوقێکی وام لـــە ئەســـتۆیە

لێـــرە ناکـــەم گفتوگۆیـــە

عـــەیبی ئێمـــەش هـــەر هـــی تۆیـــە

مـــەڵێن شـــایەرمان شـــەتۆیە

ئەگـــەر بیڵـــێم باوکـــە ڕۆیـــە

جـــەرگم ســـووتاوە، بۆنـــسۆیە.

(۲۲)

جـــەرگم ســـووتا وەك قەقنەســـی

لـــەتاو ئەســـتوندەی ئەتڵەســـی

هـــەردەم دەدرەوشـــێ نەرگـــسی

قـــەت شـــین نابـــێ خـــارو خەســـی

دڵمـــی بـــەناز هەڵاوەســـی

بـــە قـــەددو ســـەروی نەوڕەســـی

حەپــــە تــا ئــاخر نەفسـی
چـــندە ناخۆشـــە بێکەســـی
خوایــە هــەر تــۆم فریاڕەســی.

(٢٣)

فریاڕەســـم هـــەر تــۆی خـــودا
پـــووزو بەلـــەك بـــە دەردەخـــا
مـــۆمی بلـــوری هەڵـــدەكا
دونیایـــە پـــڕ ئـــاگر دەكـــا
ســـەد ئــەولیا كـــافر دەكـــا
پاشـــاو گـــەدا، شـــێخو مـــەلا
دەبـــن بێهـــۆش و بـــێ ســـەدا
فكـــر ناكـــەن چ حەشـــتەبا
غـــەیری دوو قالـــب كارەبـــا
لــە ئــەژنۆی تــاكو ئــووكی پــا
لـــە چـــاوان دەكـــا مەرحـــەبا.

(٢٤)

مەرحـــەبای گـــەورەو منداڵـــە
هـــاڕەی پاوانـــەو خڕخاڵـــە
لــە پێـــی كـــچی چـــواردە ساڵە
لـــە پـــاوو پـــووزی عەوداڵـــە
تێـــی هـــاڵاوە ماڵـــەو ماڵـــە
دەڵێـــی مـــاری بـــێ تاواڵـــە
لـــە گـــەنجی زیـــوو ســـاماڵە.

(٢٥)

سامالّو شەوقی لەنجەیە
ئەمجا نووری سەر پەنجەیە
ئەویش لەدەم ئەو گەنجەیە
دەلّێی لە جێی پەنج فەرزەیە
ڕووی لە مەککەو مەدینەیە
هەر یەک فانۆسی دیدەیە
خێری وانم، یەک بە دەیە
هەر ساتێ، سەد خێری هەیە.

(٢٦)

خێری پەنجەی کافوورینن
لە خوا نەناسان پڕژێنن
هێند ناسکو نەرمو شیرینن
کاژی مەرمەڕ، بلوورینن
بەتاوو بۆن، داری چینن
تەرزو تەڕو، هێنو مینن
وا ڕەنگاوڕەنگو نەخشینن
ژیانی ڕووی سەر زەمینن
خۆ کوێر نەبوون، بۆ نابینن؟.

(٢٧)

بۆ نابینی پشتی قاچی؟
لەسەر کوورەی غەمان لاچی

گــەر بیگەیــە، بیکــەی ماچــی
تێــی نــافکری، دای دەپاچــی.

(٢٨)

دای دەپاچــی هــەروەك شــەكر
وەك نەخۆشــێ، بــۆی بــێ بــەفر
یــاخوا، یــا حــەزرەتی خــدر
جــەرگم بــۆی بــوو پنــدر پنــدر
بــۆ شــەكرو بــەفری وا نــادر.

(٢٩)

نــادرن، ئــەی بــرای ڕێیــە
ئــەمجا، ئــۆزەی بــەری پێیــە
دەڵێــی ئاوێنــەی ئاوییــە
کــەیفت، کاکــە، لەھــەر جێیــە
تەماشــای کــەو، چــاوت لێیــە.

(٣٠)

چــاوت لێیــە لــە قومپــانی
تــۆپی زێــڕین، یــاری گیــانی
شــەڕی ئینگلیــزو ئــەڵمانی
ھەراکــەی چــینو ژاپــانی
بــە ئیتالیــاو، ئــەمریکانی
بــە ڕووسو میــسرو یۆنــانی
لەســەر ڕییــە گــەر دەیزانــی

هەروەك بەیتی بەردەشانی
لە قەرانگویو، قۆمەرغانی[1]
بە تاسەو، لوولی زولفانی
مەدحی دەکا، تا قومپانی.

(٣١)

مەدحیان کرد تا قووپانەوە
هەموو چوونو بڕانەوە
شایەر بە چەند لێکدانەوە
یار لەبەر دەستیان مانەوە
منیش ماندووم حەسانەوە
هێندێکم نایە بانەوە
دەستو دەمم کشانەوە
کە تۆ فکریم بە گیانەوە
عەیبی نییە بادانەوە.

(٣٢)

بادانەوەم، بۆ بازووە
شەهێنی سەد تەرازووە
خودا دروستی کردووە
لەسەد ماددەی بژاردووە
بۆ دەستەملانی ناردووە
دوو چلچرای هەلکردووە
لە بالآی یاری بەستووە.

---

١- دوو گوندن لە دۆڵی جافایەتی.

(٣٣)

بـــالاّو نـــالاّ دەســـتاو دەســـتە
قـــۆڵو باســـك، دەســـتەو ڕەســـتە
کـــاژی زیـــوین، شـــیری خەســـتە
هەرکـــەس جێگـــای بـــەرزو پەســـتە
جـــەرگی ســـەقەت، ڕۆحـــی ســـستە
ســـەربەخۆ، شـــێت و سەرمەســـتە
ئینجـــا دڵبـــەر چ دەربەســـتە؟.

(٣٤)

چ دەربەســـــتە یـــــاری مـــــەزن؟
لەبـــەر هـــاژەو هـــاڕەی بـــازن
پاشـــاو گـــەدا بـــۆی دەتـــەزن
لێـــو ســـــێلاّن دەگـــــەزن
بـــە مەقـــسەد ناگـــەن، دەبـــەزن.

(٣٥)

ناگـــەن بـــە پەنجـــەی گەوهـــەری
بـــە قـــەنتار بێـــنن مـــشتەری
بـــەردی بـــە قیمـــەت جەوهـــەری
قـــــەتارەی شـــــەمەندەفەری
لـــە دو ویـــش بـــاری حوشـــتری
ئینـــــۆکی ناداتـــــە بـــــەری
ئـــەو نەونەمامـــەی دڵبـــەری
حەســـوودی پـــێ دەبـــەن پـــەری

لە پێوە تا تۆقی سەری
ڕۆحم بە جاری هەڵوەری
وەختە لە خۆم ببم بەری
بە بێکەسی و، بە بێ دەری
بە فەقیری و قەڵەندەری
هاتم کە ببمە هاوسەری
مردم بە سەد کوێرەوەری.

(٣٦)

مردم لە داخی ڕوومەتی
گەڕام، سووڕام مەملەکەتی
بە پێ خواسی، بەسەر پەتی
بە هەزار جۆرە ئافەتی
هەرچی هەمبوو لە دەوڵەتی
دامنا لە بان خاڵ و خەتی
ڕووت و قووت بووم ئاقیبەتی
دەبیمە قەبرم، عەزرەتی.

(٣٧)

عەزرەتم هەر ئاخ و داخە
چۆڵم کردن کاخ و لاخە
جارێکم گوت: جێم بۆ ڕاخە
وتی: هەی هەی، چەند گوستاخە.

(٣٨)

چەند گوستاخە وەك پەروانە
کاری پەروانە سووتانە

لـــه نەلـــەتریکی کولّمانـــه
بلّێـــسەی نـــووری یەزدانـــه
چـــەرخی هـــەزار شەبوســـتانە.

(٣٩)

چـــەرخی لەنجـــەی لـــه بالاّیـــه
زەردو ســـوور، ئـــالّو والاّیـــه
شـــەدەی بـــه نـــاز لەســـەر نایـــه
دلّـــی خـــەلّکی لـــێ پێـــچایه
هـــەر یـــەك ســـەد گرێـــی لێدایـــه
چـــارۆکەی بەســـــەر کێـــشایه
دەلێـــــی گەنجـــه داپۆشـــرایه.

(٤٠)

دەلێـــی گـــەنجی بـــێ قیاســـه
شـــاهید، تـــورپەی پـــێچو تاســـه
جێگـــەی هـــەراو بـــاسو خواســـه
ڕیـــشوەی بـــه ڕیـــز ئـــاسو لاســـه
هـــەر یـــەك مەســـتی تـــاسو کاســـه
بـــه گـــێلاسو، بـــه ڕێواســـــه
چـــۆن ناکەوێتـــه وەسواســـــه؟
ئـــەوەی وەلیو خـــودا ناســـه.

(٤١)

ئـــەوەی دەســـولّحا بـــۆ خـــودا
لـــه مزگـــەوتو لـــه خـــەلّوەدا

کــه دی دڵبــــەر لــــە جیلـــوەدا
بــــــــەجاری وا هەڵخەڵــــــــەتا
گــاور بــوو، لــە دیـــن وەرگــەڕا
شــەیتان حەســـوودی پـــێ دەبـــا.

(٤٢)

حەســـــوودی پاشـــــاو خونکــــارن
بــــە ئـــــاخو داخو هـــــەژارن
شـــێخو دەروێـــش خزمـــەتکارن
پاکیـــان بــە هــێشو ئـــازارن
چـــاوەڕێی ئـــــەمری دڵـــــدارن
سەرمەســــتو شــێتو بیمــــارن
لــــە گیـــانی خۆیـــان بێـــزارن.

(٤٣)

بێـــــزارە هەرچـــــی دینــــدارە
هــــەردەم لــــە هــــاتو هــــاوارە
بــــە هــــەزار دڵ برینـــــدارە
ئەشـــقی دوو چـــاوی نــــازدارە
هەرچـــــی پـــــیرە، هــــەرزەکارە
گـــــەر زارۆی پـــــارو پێـــــرارە
وەکـــــو مـــــن زارو نـــــەزارە.

(٤٤)

زارو نــــــەزار وەکـــــو منـــــە
نقـــووم لـــە گـــۆمی بـــێ بنـــە

چـــونکو چـــاوی لـــە گەردنـــە
مـــالۆیرانی بـــەلگو بنـــە
پـــشکنیم کـــونو قوژبنـــە
دیـــتم هەرچـــی کـــچو ژنـــە
نەمـــدی وەکـــو ئـــەو گوڵبونـــە
ئـــەتۆش بـــڕۆ، بیپـــشکنە.

(٤٥)

بـــی پـــشکنە هەرچـــی باشـــە
چـــی خـــاوەن ڕوتبـــەو مەعاشـــە
بـــە قەشـــەو، ڕایـــەو، شەمماشـــە
بـــە دۆمـــی وەســـتای کەڵاشـــە
وەســـتای بێـــژینگو تەڵاشـــە
هەرچـــی گـــردو، هەرچـــی شاشـــە
بـــە بـــاربێنن زنـــڕو داشـــە
چ ئاوریـــشمەو، چ قوماشـــە
هێـــشتا بـــەهای یـــار، بەلاشـــە.

(٤٦)

بـــەهای قـــەت نایەتـــە ڕایـــە
نـــۆرەی ســـەیرانو ســـەفایە
لـــە شـــارو دەشـــتو ســـەحرایە
بـــە کۆمـــەڵ دێـــن بـــۆ ســـەمایە
ناســـکە کیـــژن، ڕۆڵـــەی دایـــە
کارناســـکی نایـــەو مایـــە

هـــــەمووی شـــــیرینو لەیلایـــــە
خــــاتو زیـــــنو زولەیخایـــــە
خـــــەرامان چـــــینی ئاوایـــــە
قەمـــــەرنازیش لــــــە خەتایـــــە
هەرچـــەند دەکـــەم قـــسەم نایـــە.

(٤٧)

قـــسەم نایـــە بـــە زۆرو کـــەم
هـــاتن کـــوڕی قامـــەت عەلـــەم
شـــێرانەو مەســـتو موحتـــەرەم
زەبـــر بـــە دەســـت، ڕەنگـــین قەڵـــەم
چـاپوك ســـوارن، خـــاوەن حەشـــەم
(گیـــو)و (فـــەرهاد)و (کاکەمـــەم)
(یوســـف)و (خورشـــیدی یەکـــەم)
دەست بەخەنجەر، ســگریت[1] بە دەم
هەڵدەپـــەڕن شـــاه و خـــەدەم
نـــــەماوە نـــــاوی ڕۆســـــتەم.

(٤٨)

ڕۆســـــتەم و زاڵ، خـــــاوو ســـــتن
ئاغـــــاو بەگلـــــەر ڕادەوەســـــتن
لــــە مەیـــدانا ســـەف دەبەســـتن
لەگـــەڵ دوژمنـــــان سەربەســـــتن

---

١ سگریت. **Cigarette**: جگەرە.

گرتن، خستن، کوشتن، بەستن
گوڵلەو خەنجەر دەپەرستن
ڕۆڵەی شێر، نازاو مەستن
کوردن، سەرگەرمن، دروستن
گوردو مەردو، توندو چوستن
دەرگەی وریایی نابەستن.

(٤٩)

نابەستن دەرگەی دیوانان
دێن و دەچن پاڵەوانان
دەچن بۆ ناوو ناوانان
تفەنگ لە دەستو لە شانان
حیلە حیلی بەستەزمانان
نرکە نرکی شاە و خانان
هەروەك گۆڵەی عاسمانان
سواری ئەسپان، وەك یەكانان
سمان دەخشێنن لە بانان
قەڵتاغ دەوەستن بە ڕانان
گرشەو بلێسەی دەبانان
هەمووی لە ساحێبقڕانان.

(٥٠)

ساحێبقڕان، شەستو شەشن
بەناوبانگن، دڵ بێ غەشن
جگەرداڕن، ساحێب بەشن
ساحێب کەماڵن، سەرکەشن

تــــاعوونی قـــەومی ڕووڕەشـــن
کـوردن، عەگیـدن، چـەند گەشـن
ڕاوی خۆڕیـــــان دادەبەشــــــن.

(٥١)

دادەبەشـــــن ڕاوی ئاســـــك
نـەرم و لـووس و پـووس و ناســك
هەڵـــدەماڵن قـــۆڵ و باســـك
دایـــــدەهێنن ڕەگ و لاســـك.

(٥٢)

ڕەگ و لاســـــك دادەهێــــــنن
تـــازە نـــەمامان دەچـــێنن
خـــوێنی دوژمـــن دەڕژێـــنن
مەحبووبـــەی خۆڕیـــان دەهێـــنن
ڕێکـــوپێکی نافـــەوتێنن
بــە نــاو و ناوبــانگ دەمێـــنن.

(٥٣)

دەمێـــنن کـــوردی ڕوحـــانی
عەشـــایەری، هـــەم دیـــوانی
عێلـــی جافـــان و بابـــانی
شـــێر و پڵێـــنگن لاوانـــی
پاڵـــەوانن منـــدالانی
نـــاژمێردرێن بـــۆ چـــازانی
خێڵـــی کـــورد و هـــەورامانی
ئاغەســـــووری و سەـــایلانی

میکایــەڵی و جــاف ســوڵتانی
ئــەهلی پــژدەر، بــە هــۆزانی
عەباســــــییو، بابــــەکرانی
مامــــەش و مـــەنگوڕ، نــاوانی
ئــــاکۆ، خۆشـــناو، باڵـــەکانی
(پاشــای کــۆره)، شــای جیهــانی
مــیر مەحـمـەڵی و، مــیر وســوانی
هــــۆزی بنزنـــری و پیرانـــی
مەرگـــەیی و شـــاڵە بـــەگیانی
لەگـــەڵ کـــۆیی و ئاقـــارانی
بـــە غـــەفووری و حـــەوتزیانی
هـــەمووی لـــە مـــەردی مەیـــدانی
مـــــەریوانی و موکریــــــانی
سوزنـــسنی و هینـــدی ئێرانـــی
بانـــەو ســـەقزو سەردەشـــتانی
قەڵاســــیوکەو، ســــێکانیانی
بـــە مـــــسکین و شـــێخەکانی
شـــێخ بزینـــی، لەگـــەڵ شـــوانی
لای کــــەرکوک و ســـــلێمانی
باســـی نــــاکرێ بــــە زمــــانی
بـــۆڵی و بـــابۆڵی و خـــەیلانی
سورچـــی و هـــەریری و شـــێخانی
زازا، بەرانبــــــەر ســــــۆرانی
زراری و ئـــــاگری و بێجــــانی

کوڕە کوڕەی دزەییانی
وەك تایەفەی کاکەخانی
(ئەحمەد پاشا) ی ڕوتبەو شانی
برایماغایی‌و قەمپلانی
مامەسێنی، لەگەڵ سیانی
جگە لەوان، بریفکانی
بە بەرزنجەو کەنەزانی
ساحێبی ناوو نیشانی
تا دەگاتە لای لاجانی
حدوودی تورك‌و عوربانی
کوردی زەندی ناوەدانی
جانفیداکانی کێوانی
بە قەڵەم ناکرێ بەیانی
هەموان دەناسی‌و دەزانی
قۆشمن قۆشمن، پیرو جوانی
دەچن بۆ ڕاوو سەیرانی.

(٥٤)

ڕاوو سەیران، زۆرو وازە
بەزم‌و خۆشی‌و سۆزو سازە
هەریەك بۆ ئێکێ دڵخوازە
بلاوەی شمعێن‌و بازە
لە ناو چزم‌و کەل‌و ڕازە
نوورزەی تاژی‌و، دەنگی نازە

پێکـــــــــۆڵی نەســـــــــپی لاوازە
حـــــــودود کەوتۆتـــــــە شـــــیرازە
زیلـــــەی زوڕنـــــاو نـــــای و ســـــازە
فیقـــــــەی دوزەلـــــــەو نـــــــاوازە
وا دەســــــــوتێ بـــــــەزمی تـــــــازە
وەك بـــــــەنزین و نـــــــەوت و گـــــازە
هەرچـــــــــی دوورە لـــــــــەم دەروازە
بەشـــــی هـــــەر ســـــیو پیـــــوازە
مانـــــــدووی نـــــــشێو و هـــــــەورازە
لێـــی بـــێ ســـندان، پێـــی مـــەنازە.

(٥٥)

پێـــــی مـــــەنازە، ئـــــەو بەدگۆریـــــە
پیـــــــشەی بوختـــــــان و درۆیـــــــە
ئـــــەو بـــــەدکاری مـــــن و تۆیـــــە
جـــەوتی بـــە ســـەر، وشـــکەڕۆیە
ڕووڕەش و دەســـــــــتە ئەژنۆیـــــــە
چـــی پێنـــاکرێ خـــۆڵ بـــە دۆیـــە
لـــە نیـــشی بـــێ جـــێ خەڕۆیـــە
هـــەر کـــەس لەگـــەڵ یـــاری خۆیـــە
خـــــەریکی مـــــەرج و گرۆیـــــە
لـــە مـــاچ و مـــورچ گفتوگۆیـــە
گەیـــــــــشتن و هاموشــــــــــۆیە
خودایـــە نەیخـــەی ئـــەم گۆیـــە.

(٥٦)

ئەم چەرخە هەر لە سەما بێ
چرای پیرو جوانو شا بێ
یاری شیرین لە پەنا بێ
دەمت لە ناو دەمی نابێ
دەستت لە مەمکی گیرابێ
دەرگەی غەمت پێوە دابێ
خوایە بۆ ئێمەش وەها بێ
یارەب لێم نەگری عیتابێ
بیگرم، بیگوشم، نییەو نابێ
لێوی بمژم، دەردم چا بێ
گەزینی کولمەی ڕەوا بێ
یاخوا گەر شوێکم مابێ
دڵبەر بە ناڵو والا بێ
بە غەمزەو نازو بالا بێ
بە باوەشەوە دوورا بێ
ئینشائەللا، دەبێ وابێ
خودایە ماڵت ناوابێ
با بەشی حەمدو سەنا بێ.

(٥٧)

حەمدو سەنا بۆ یەزدانە
لە تەرەف (عەبدوڕڕەحمان)ە
ناوی (ڕاجی) لە شیعرانە
خزمی جافانو بابانە

لــــە شــــیرازەی کوردســـــتانە
ئـــەم بەیتـــەی دانـــا بـــە گیانـــە
نــــاوو نیــــشانی کوردانــــــە
دیــــــاری بــــــۆ براکانــــــە
لێــی خۆشــبن گــەر نقوســتانە
ڕەحمــەت لــە بــاوکی هەموانــە.
١٩٣٩/٣/٨

* *

## ب- وێنەیەکی مێژووی تەبیاتی نیشتمانی کوردان بۆ تێکۆشین و ڕزگاری لە تەمبەڵی و نەزانی

(۱)

هانام بە بەر شاهی کوردان
دامەزرێنی عەرد و عاسمان
خودای ئەجنەدە و ئادەمیان
هەناردوویە پێغەمبەران
نیشانمان دەن دین و ئیمان
هەم فێربوونی گەلێ ئیشان
جوێ بوونەوەی عێل و ڕیشان
سازندەیی کار و پیشان
هەر خۆیەتی خاوەن ئیشان.

(۲)

ساحێب نیشان پەرستینە
ئینجا گەورەی مورسەلینە
شەهەنشای مەککە و مەدینە
بەرۆ دەستووری ببینە
هەر خۆیەتی خاوەن دینە
بە عارەب خاسی مەبینە
بۆ هەموان، وەك یەك ئەمینە.

(۳)

ئەمینی کورد و عوربانە
سەرداری شاه و سوڵتانە

جێ نازی جین و ئینسانە
خودا فەرمووی لە قورئانە
ئەی کوردە خاسی بزانە
ئەمری ئەومان لەسەر شانە.

(٤)

لەسەر شانمان ئەمری ئەوە
چیدی مەکە چێشتە خەوە
رۆیشتووی، خێرا وەرەوە
لە خزمان مەچۆ دەرەوە
هێندێ لە خۆت بفکرەوە
ملت ئەستوورو قەڵەوە
هۆش و بیرت لا جەڵەوە
بەرماڵی شانت بکەوە
دەفعەت بە شێخت بدەوە
ئۆزەی جووت و گاو درەوە
بەخێوکە مێگەل و رەوە
وا رۆژە، یا مانگە شەوە
چاوت دەبینێ خرکەوە.

(٥)

خرکەوە هەرچی پێت دەوێ
ئیش و کارت لێرەو لەوێ
شانی بەرزت قەت نەنەوێ
تا میللەتت سەربکەوێ

جـــەرگو دڵو گیانـــت نـــەویّ
تێکۆشـــــە، دەردت بـــــسرەویّ.

(٦)

دەردت بــــە هـــێشو گرانــــە
خـــوێنی ناڵـــت لـــە چـــاوانە
خاکـــت خـــاپوورو وێرانــــە
پـــووشو پـــەڵاشو پاوانـــە
بـــۆ غــەیری تـــۆ، بـــێ ناوانـــە
ئینجـــا ســـەیریکەو بڕوانــــە
چـــەند مەعـــدەنت لـــە کێوانـــە
لـــە کەنـــدو چـــۆمو گردانـــە
هـــەم لـــە چـــۆڵو بیابانـــە
هـــەمووی شەوچـــراو دوڕدانـــە
مۆمنـــاییو خـــاکی ســـەرانە
بـــەردی خـــەڵوز چـــەندە جوانـــە
گڵـــی گـــۆزانو دیزانـــە
بیناســـــە گڵـــە بەرانــــە
گڵـــی ســـپی دۆشـــاومانە
بـــۆ زێـــڕو زیـــو، هـــەمووی کانـــە.

(٧)

هـــەموو کـــانی دەســـتو لوێـــچە
هـــەموو دەوری خـــوارو خێـــچە

شاخ‌و کێوومان قسڵ‌و گێچە
خێرابە، خۆی تێوە پێچە.

(٨)

خۆت گەش کەوە، ساڵت هاتە
خاکت پڕی لە ماڵاتە
بزن‌و مەڕت بۆ خەڵاتە
گاور گۆڵت لە مەزاتە.

(٩)

لە مەزاتە کەوڵی ڕێوی
گۆشت مامزو بزنە کێوی
شوور و دەڵەک، های لە نێوی
بۆ گەنجی وانە تۆ خێوی
پێویستە کە خۆت بیزێوی.

(١٠)

خۆت بیزێوە مامە بیرە
ماڵاتت مەکە لە بیرە
هەمووی ماڵی یو دەستگیرە
خاوەن خووری‌و ڕۆن‌و شیرە
بە شیرێژو بە پەنیرە
خواردەمەنی شاو گزیرە
هەموو گەنجی بێ نەزیرە.

(١١)

هەموو گەنجی بێ پایانە
جا نۆرەی پووش و پاوانە
چەند قشلاغ و، چەند هەرزانە
لە کێوان و لە دەشتانە
دەڵێی ڕیزەی سوارانە
پاڵەوانەو لە مەیدانە
شنەی باسکی باڵۆرانە
گیا گوێزەرو پووش کورتانە
ستک و کنگر بە بارانە
شنگ و ڕەیحانە سەپانە
دۆری و کاردو لە ڕازانە
بن بەردەقی و مەلایانە
جا پیفۆکی سەلک پانە
ڕۆحی پاکت پێ بزانە
لە نازو نیعمەت میوانە.

(١٢)

میوانی سەربەرزو لاوە
گیاو گۆڵت وا نەخشاوە
بە ملیۆن ناوت لێناوە
بە ملیاریش نەناسراوە
خزمەتکارەو ڕاوەستاوە
چ هی سەحرا، چی هی کاوە

چ هـــی ســـێبەر، چـــی هـــەتاوە
ســـــەوزو ســـــوورت داچـــــناوە
وەك زوڵفـــــی یـــــاران تێـــــراوە.

(١٣)

تێـــراوە، بـــۆی جوســـتوجۆ كـــە
گوێزبەلـــــــەوو ئاڵەكۆكـــــــە
گـــەنم و جۆیـــە، نیـــسك و نۆكـــە
زەوی و زارت وەرد و شـــــۆ كـــــە
گـــەنجی ژینـــت، لـــەوێ ڕۆكـــە
شـــۆخی لەســـەر خـــەڵك و هـــۆ كـــە
گیـــای بـــۆن خۆشـــت جـــاڕێ بۆكـــە
تـــــا نەبووبـــــە مارمیلۆكـــــە
ئەی كوردە، حەمە، خۆت خەڕۆ كـە!!.

(١٤)

خـــۆت خەڕۆكـــــە، جەزیرەیــــە
بـــــە شــــەمپانی و بــــە بیرەیــــە
چــــەند دەرمانــــت كەتیرەیــــە
نەســــپۆن پــــڕی لــــە لیرەیــــە
گلێخــــــە، مامــــــە پیرەیــــە
ســـــڕنش دەڵێـــــی مدیرەیــــە
مـــازووو بـــەڕوو، هـــەم شـــیرەیە
بـــە هـــەموو بـــەر لـــە زیرەیـــە.

(١٥)

لــه زیــڕه‌ی جــمووت‌و منداڵـــه
ئه‌گــه‌ر مانگــه، ئه‌گــه‌ر ســاڵه
بــۆ تــۆی ڕاگرتــووه ئــه‌و ماڵــه
لــه خــۆی پێــچاوه ده‌سماڵــه
ده‌ڵێــی کــچی چــوارده ســاڵه
ناچــێته‌وه، هــه‌ر لــه ماڵــه
بــڕۆ، بــۆ خــۆت بیگــه پاڵــه
مــاره‌ی بکــه، پێــی داماڵــه
کــورده بـه‌ســیه گاڵــه گاڵــه.

(١٦)

کــورده جــا مه‌یــده ته‌ڵاقــه
لــه دونیــادا بووکــت تاقــه
گــواره‌ی، گوڵــووک‌و مێلاقــه
مــووی، وه‌نه‌وشــه‌ی باقــه باقــه
یــان بــاڕێزه‌ی لــه قــه‌د تاقــه
چــاوی کــانیم پــڕ مه‌راقــه
بۆچــی ســا نایکــه‌ی ئیلاقــه؟
هــه‌ر وه‌ك ڕێویــت واقــه واقــه.

(١٧)

واقــه واقــت هــه‌روه‌ك ڕێــوی
کــه‌وڵت ئــه‌وا که‌وتــه کێــوی
جــارێ بــۆچ خــۆت نــابزێوی؟
گــه‌ر خــۆت بناســی، وه‌ك دێــوی

بۆ دەرمانو خواردن، خێوی
باغت رازا، برۆ نێوی.

(١٨)

برۆ نێوی قەلەندەرە
هەمووی بە دەستو خەنجەرە
لە پشتی بەستووە کەمبەرە
بە سێپەرەو، بە سێوەرە
دەلێی عەسکەری بەربەرە
خۆت، یەك بەیەك پێدا وەرە
پێتقجەو، شینەشاتەرە
گشتی جوانو دلبەرە
بۆ مەرگو ژین سەمەندەرە
رەگو قەدو پەلكو بەرە
بە هەموو دەردان یاوەرە.

(١٩)

یاوەری پیرو رەزیلە
چ نێرگزەو، چ حاجیلە
درۆی نەبێو بە بێ حیلە
گشتی بۆ ژینت کلیلە
بۆ باوكو رۆلەت کەفیلە
کەنێرەو چارەچەقیلە
سێ بسکۆلەو گرگازیلە
ئەو گیایەکانی خنجیلە
هەموو لەبەر دەستت دیلە.

(٢٠)

هەمووی دیلی بەر دەستانە
هەروەك گوڵووكی نیسانە
لە دامێنی بەهارانە
ڕازانەوەی كوردستانە
خەندەی گەرچی لە لێوانە
جەرگی ڕەشی كوردەكانە!!.

(٢١)

كوردی كەم نیمان و دینە
شینكت پەڕی كاڵەشینە
وەی چەند تەڕو كاڵ و شینە!
مۆردو چەقالەت ببینە
نەسناسە، هەم یاسەمینە
كولەكەت، (قەرع)و (یەقتینە)
بۆ هەموو دەردان پەرژینە
دەڵێی سوورەتی یاسینە
سەرو و شەنگەبی هەژینە
سپیدارت لەسەر زینە
خۆخ و هەڵووژە مژینە
قەیسی و تری بگوشینە
هەنارو هەنجیر چنینە
ئەی كوردە چاوت هەڵێنە
سا باوەشی تێ وەرینە.

(٢٢)

بــاوەش بگــرە بــۆ ئــەو بووکــە
بــۆی زوڵفــی پــونگ‌و خڕنووکــە
خــاڵی گۆنــەی بەلاڵووکــە
مــاڵ‌و حاڵــت پــڕ لــە شــور کــە
دارەبــەن بۆچــی مەحتووکــە؟
لەگــەڵ قــەزوان هاتوچــووکە
بنێــشتت پــڕی قوتووکــە
دەوای زگ‌و زارو پووکــە
بــەتام‌و بــۆن، نــەرم‌و ســووکە
ئینجــا ڕێــواس‌و چــەڵتووکە
کۆگــۆیی‌و کفرەبالووکــە
هــەمووی لــە تــۆ دەکــا تووکــە.

(٢٣)

تــووکی بەیبوونــە فیزەیــە
لەگــەڵ نەشــەی گەزیزەیــە
دەڵێــی کوڵمــەی عەزیزەیــە
لــە بــاوەش نــازو تیزەیــە
بــۆ خزمــەتت کەنیزەیــە
تــڕدووک‌و زی، زڕیزەیــە
داری دەســتت نەقیزەیــە
کــەوەرو تەڕەتیزەیــە
مــام جەژنۆکــەت لــە ڕیزەیــە.

(٢٤)

لـــه ڕیـــزەت، ســـیرو پیـــوازە
بـــه کـــەرەتو گۆگـــەم بنـــازە
زەڵو زووڵو قەســـەڵ، ســـازە
بـــۆ ئـــیشو کـــارت شـــیرازە
پەڵپینـــەی شـــیوت بخـــوازە
شیرخوشـــیلکت لـــە دەروازە
تیمـــاری ســـەد مارانگـــازە
ســـەڵکەی بینـــە ئەنـــدازە
چـــەند پەپوولـــەی پێـــوە بـــازە
بـــۆ کاروبـــاری تـــۆ ســـازە.

(٢٥)

بـــۆت ســـازە دارو دەوەنـــە
کەنـــدو چـــۆم، شـــاخو چـــەقەنە
هـــەمووی مـــەردی ســـەر کەلەنـــە
ڕاوەســـــتاوە، تەمەمتەنـــــە
ئەتداتـــە دەســـت، هەرچـــی هەنـــە
ئەگـــەر دەزوو، ئەگـــەر بەنـــە
چ پێویـــستیت بـــە لەندەنـــە؟.

(٢٦)

چ پێویـــستیت بـــە جاپانـــە
بـــە ئیتالیـــاو ئالمانـــە
گـــەر ئـــاقڵی، ســـا بیزانـــە
ئـــەخشو تـــەونت لـــە دەســـتانە

لــــە عالـــــەم خاکـــت میوانـــــە
هــــــەموو گـــــەنج و دوڕو کانــــە
هــــــەموو ژیــــــانی ئینــــسانە
ئــــەتۆش ئــــەرکت لەســــەر شــانە
بـــە کیـــــشانەو، بـــە پیوانــــە
مەبـــــە دەروێـــــش و دێوانــــــە
ڕێکیخــــــەو، مــــەگرە بەهانـــــە.

(٢٧)

بەهانــــــەت بکــــــە بەتاڵـــــە
لــــە کاریکــــە، کفــــرو ژاڵـــــە
هــــی خۆتــــە، مــــاڵی حەلاڵـــە
شــــۆخ و نــــەرم و شــــۆڕو کاڵـــە
گــــەزو، بــــی و، پــــەلک و پاڵـــە
قامیــــــشی خـــــانوو، هەرزاڵـــــە
هــــەمووت بــــۆ هــــاتوون حەواڵـــە
چــــــیدی بـــــە زاری مەناڵــــــە.

(٢٨)

مەناڵــــە چــــیدی بــــە گریــــان
کــارت پیکــدێ هــەر لــە حــەیوان
خــــاک و گیــــا، بیجگــــە لــــەوان
بڕوانــــــە ســــــەوزەیی باخــــــان
لەگــــەڵ مــــــەعادینی شــــاخان

تێکرا، غەزنەیە کوردستان
داخی جەرگم، نییە کەسمان.

(٢٩)

کەسمان نییە بێتە پێشە
دڵمان پڕی زام و ئێشە
ئاقڵمان شێخ و دەروێشە
پیاوەتیمان ژار و نێشە
ئیشمان کەچ و تێکەڵکێشە
نیخە نیخ و کێشەکێشە
چیکە ئاخان هەڵمەکێشە
دیواخان پڕ لە لاکێشە
بەڵام هەمووی شەش و بێشە.

(٣٠)

شەش و بێشە کارمان تەواو
دەستە بەستە، پامان شکاو
باخچەڵمان ئاو لێ بڕاو
ڕەق و وشکن، زەوی و بەراو
دەرەو مێرگی تازە چناو
بە چەندیشی بەر لێ خوراو
بە خۆڕایی کەوتینە داو
بە بێ دانەی هەڵاوەساو
سێبەر پەیدا، دوور لە هەتاو
بەخوا ئێمەین، مردوو مراو
دەبا بمان پێچن لە جاو.

(٣١)

نـــیتر، جاریـــشمان خـــساره
نـــیش‌و کارمـــان نالـــمباره
لەبـــەر دەسمـــان دەنکـــە نـــاره
کێـــــور چـــیاو، زەوی‌و زاره
بـــۆ ســـەنعەت کانگـــەی بـــەهاره
جێگـــەی تیغـــی جەوهـــەرداره
تـــۆپ‌و تفـــەنگی نـــازداره
چـــەند فابریقـــەی بـــێ ئـــەژماره
بـــاروت، بـــە بـــار‌و قیتـــاره
شـــۆرەو گـــۆگرد، وەك باڵـــداره
لەبـــەر دەســـتت دار‌و بـــاره
هێـــشتا چـــاوت لـــەلای پـــاره
چـــاوت کـــوێره، پـــڕ لـــە خـــاره
جـــەرگت تـــەپی، پـــڕ لـــە ژاره
دڵـــت پـــڕ سفتوســـۆ، هـــاره
شـــێت‌و بێهـــۆش، ئـــەی هـــاواره
ئـــەی هـــاواره، ئـــەی هـــاواره.

(٣٢)

هـــاواری دڵ، قـــەت نـــاسرەوێ
خـــەوی مـــەرگمان نـــاڕەوێ
ناچـــینە ســـەر لـــە هـــیچ هـــەوێ
بـــەم حاڵـــەش، خۆشـــیمان دەوێ!

هیوامـــــان، ڕۆژێـــــك و شــــەوێ
كـــە دوژمـــــن پـــەكی بكـــەوێ
تێتگـــــەیێنم، گـــــەر دەتـــــەوێ
وەك جـــوو ئـــەڵێم: لێـــرەو لـــەوێ
زۆر چـــــاكم (فەلەســـــتین) دەوێ.

(٣٣)

زۆر چـــاكم، بـــێ حـــاڵ و حـــەواڵ
خـــــاكم پـــــڕە، زاڵـــــم و زەواڵ
كاریان بوو كۆك، دەیكەن بە تاڵ
بـــــە هەڕەشـــــەو بـــــە گاڵـــەگاڵ
بێ جێن، فـەقیر، لـە دەشـت و مـاڵ
قـژ زەرد، بـاڵا بڵنـد، چـاو كـاڵ
دوو زوڵفـــی ڕەش وەكـــو زوخـــاڵ
دوو مـــــەمكی وەك دوو پرتـــــەقاڵ
دوو لێـــوی گـــوڵ، یـــاقووتی ئـــاڵ
دوو كـــوڵمی ســـافی بـــێ وەبـــاڵ
چـــەتری ســـەری وەكـــو مـــەتاڵ
هـــەڵی ئـــەدا ڕۆســـتەمی زاڵ
ئـــەبرۆی كـــەوانو، دەنكـــی خـــاڵ
ژیـــانی كردمـــە ژەهـــری تـــاڵ.

(٣٤)

ژەهـــری بـــرینم پـــڕ لـــە ســـۆ
هیـــچم نـــەدی خۆشـــی لـــە تـــۆ

هەرچەندی کردم هاتو چۆ
ڕاستیم هەموو بوونە درۆ
تۆش مایەوە بێ گفتوگۆ.

(٣٥)

بێ گفتوگۆ، جەرگم ڕزی
شانی هەموو هێزم خزی
دڵو هەناوم داچزی
سواری غەمانم دابەزی
لە دڵ چەقی سەد دڕکەزی
دۆخینی نیشتمان بەزی
دەستو دەمی خەڵکی گەزی
دەماری کوردەکان تەزی!!.

(٣٦)

تەزی دەماری کوردو من
هۆشو دڵم نەما لەکن
دایکی وەتەن کە بوو بەژن
بە خەڵکی دا، چ سەر، چ بن
پێی بوونە سەرکردەو مەزن
کاروانسەرایە، دابەزن
بخۆن، بنوون، مێرگو ڕەزن
کوردیش، بە تووشی قەڵبەزن!!.

(٣٧)

بە تووشی قەڵبەزن، لە کێو
هەڵدێن لە وتنەی جندو دێو

ماڵو منداڵ ناکەن بەخێو
ماندوو، لە هەورازو نشێو
هەر بە تەمان بینە خدێو.

(٣٨)

بینە خدێوی میسرو شام
گەندەڵیان کردن جووت تەمام
نەژمێردران بەستەو مەقام
نەپێوران باخچەو شەقام
هەر پێک نەچن، ئاغەو غولام
تەمبەڵو پوشتەو بێ نیزام
بێ نیشوکارو عەقڵو فام!!.

(٤٠)

بێ عەقڵو فامو بەش خوراو
هەر یەک بە جۆرێ کەوتە داو
لە کیسی چوو سەیرانو ڕاو
زمان شڕی، حەیا ڕژاو
بە دەستو دەم، بە گوێوو چاو
بەدکارییە پیشەی، تەواو
کوردی نەسیری دڵشکاو
دوژمنی، خۆی ناویتە ناو
ناترسێ قەت لە چاوو ڕاو.

(٤١)

لە چاووڕاوی لانەدا
خەیاڵی خاوی بانەدا

مێگەلی وەختی ڕا نەدا
دراوی خۆی، بە کا نەدا
توولەی بە جووتو گا نەدا
تۆش بسووڕێ، بەم بانەدا
بەم چۆڵو مێرگەپانەدا.

(٤٢)

لەم چۆڵە چیکە سەر مەکە
خوێنی کوڕان هەدەر مەکە
گوێ لە زەڕینی کەر مەکە
قازانج ئەکەی، زەرەر مەکە
لە هۆز خۆت بێ خەبەر مەکە
بووکت لە ماڵا دەر مەکە
گورگت بە مێگەل وەر مەکە
یاری لەگەڵ خەنجەر مەکە
(ڕاجی)، قسەی کە وەك ژەکە
بیری منداڵت، ژیروەکە.

(٤٣)

ژیروەکە لاوی دڵ بە جۆش
چیدی مەبە، بێ هۆشو گۆش
ئەمن پەرۆشی تۆمە، تۆش
دوور لە تەبیبو، هەر نەخۆش
نەبووریە یارو بادەنۆش!!.

**

# پەسن و پێداهەڵدان

## پەسنی ڕۆبینتەنی جاف

تـا هەڵبکـەوێ سـەروەری وەك ئێـوە، لـە جافـا
نامێنـێ لـەناو کـورد، عەشـیرەت لـە خیلافـا
لاوێکـی هونەرمەنـد، وەتەنپـەروەرو مـەردی
کـێ بـێ کـە بـەرەو ڕووت بوەسـتێ لـە مەصـافا؟
نـاوت چـییە؟ ڕۆبـین تەنـە، پۆلاییـە کـارت
لێکهـاتووە، خـۆش ئەسمـەر، موسـەمما لـە تـەنافا
شـایانی وەزیـری، بـەخوا، گەرچـی مـودیری
سـەربەرزی ئـەدەب، کـانی هونـەر، شـێری لـە قافا
ئەی بەندی دڵی (حاجی ئـەمین)، جـافی تەهەمتـەن
ئەمبیـستووە لـەم هـۆزە دوواکەوتـە لـە مافـا
وەرگێـڕی کـە تـۆ ڕووت لەکەسـان، ئـەختێ بەکینـە
عَـنْ مَـضْجَعِها مِنْـكَ، جنـوبٌ تَتَجـافی
بورهانـە هـەموو بـیرو، وشـەت حیکمـەتو شـانە
بوڕندەیـە شـەشێری وچـانت لـە غیلافـا
دائـیم کـە پـڕی نیعمەتـە دیوانـت، ئـەوا خـەڵك
یَـسْعَوْنَ الی البـابِ ثِقـالاً وَخفافـا
هەرچـی ئەشـی ناسـیبی، کـە ئەتناسـێ لـەخۆوە
وا دیـاری لـەناو کۆمەڵـە، وەك ڕۆژی لـە تافـا
بـا عالـەمی بێگانـە بـزانن، کـە مـە جـافین
فِي المَجْـدِ، مَـعَ السُّؤددِ لَـنْ نَتَنـافی
جێی فەخرە هـەبن وێنییـەیی تـۆ زۆر لـە عەشیرەت
ألعِـزَّةُ بالقُـدْرَةِ، حَتـی تَتَکـافی

چونکە هونەرت، شۆرەتی خستۆتە سەمای کورد
بێگانە ئیتر هیچی نەماون لە گەزافا
من بەندەیی ئەم هۆزەو خاکەم، کە هەتا هەم
هەر چەپلە لە دەستانمە، هەر دەم لە هوتافا
ئەی کاکە، ژیانم کە لە ڕووی ئێوە تەواوە
کُلُّ مَرَضِ العَيْشِ يُعافى وَيُشافى
من گوڵ ئەپەرستم، کە لەباخی گەلی کوردان
كَالْبُلْبُلِ في الصُّبْحِ أُغَنِّيهِ عِزافا
کوردیو عەرەبی تێکەڵ ئەکەم، تا بە برایی
ئەم قافیە لێکخۆش بێ، لە هۆنینو لە بافا
زەردەشتییە ئەم کێوو کەژەو، مێوەوو مێوە
قَدْ وارَثَها الجافُ سِهاماً وَسِلافا
نەمزانی سوپاست بە چ کەم؟ کاکی جوانێر
إذْ خَيَّرَني وَصْفُكَ، لَمّا أتَدافا
ئەو کاتە لەڕێت، بێکەسو ئاوارە ئەوەستن
لا تَتْرُكُ ألطافُكَ لِلْخَيْرِ مُضافا
ئەو شەخسە حەسوودی کە ئەبا پێت، ئەزانێ
قَدْ ألْبَسَهُ الجَهْلُ مِنَ الحُمْقِ إكافا
لەم عەشرەتەدا، کار هەموو ڕاستو تەرازوون
فالعَدْلُ يَدُ الحِكْمَةِ، وَالحَقُّ يُوافي
(ڕاجی)، بەهەموو شێوە لە ڕووی هۆزی ئەپشکوێ
لا يَمْنَعُ عَنْ ضَوْعِهِ جِنْياً وَقِطافا.

١٩٦٠/٤/٢٠

## پەسنی سەید هادی نەفەندی

بەنەوعێ کەوتەدەر عیرفان، ترینگەی تەپڵی شادی هات
سەراسەر پڕکران دەوران، کە ناوی نووری هادی هات
لە زینەت ئاسمان پڕبوو، وەکو گۆ شەوقی دڵ خڕ بوو
بەمەیدانی هونەردا چوو، گرتیەك، سەد گوشادی هات
بەبەزمی نەزمی تەعمیرات، خودا هێنایە تەحریرات
لە کۆیسنجاقەوە دیهات، هەموو جەژنی مورادی هات
وەکو ڕۆستەم، سەید هادی نەفەندی ڕۆژی بونیادی
بەتەکیەو مەسجیدو نادی، بەبازاڕی تەمادی هات
عەجەب حوکمێکی دامەزران، بە کەم وەختێ وەکو باران
لەلایێ مەرمەڕو مەرجان، لەلایێ حەرفی بادی هات
لەلایێ گێچو بەردو دار، لەلایێ هەندەسەو کردار
لەلایێ مەسجیدو بازاڕ، لەلایێ نەخشی عادی هات
دەڵێن مەئموری ئەوقافە، درۆیە، ئەو قولەی قافە
نفووزی ئەمری پڕ تافە، بەگوێرەی ئیعتیمادی هات
سەمای گوڵزاری پێداکرد، ستارەی نەحسی ئاواکرد
کەچەند دووکانی ئینشاکرد، چ ئەسکەندەر نەژادی هات
چ دووکان، قەیسەری قەیسەر، چ دووکان، مەرمەڕو گەوهەر
لەزینەت مونتەزیم یەکسەر، بە بەزمێکی ئیرادی هات
ژیانو نازکیو ڕەوشەن، دڵی وەك جەننەتو گوڵشەن
کە (کۆیە) مەیسەرو مەیمەن، بەپێشکەوتەی بیلادی هات
بە شوعلەی ڕاستیی سەرکەوت، لەئەوجی غیرەتا دەرکەوت
لەقاپیی ئەو عەدو ودرکەوت، بەناهی نامورادی هات
حکومەت ماڵی ئاوابێ، کە زاتێکی وەهای لا بێ

بە تەرفیعی موهەییا بێ، کەوا هوشیارو هادی هات
خودا تا تاخیری کاری، بمێنێ کارو بازاڕی
کە ئەم، سەربەرزە تاساری، بە چاکیی شکڵو مادی هات
هەموو (کۆیە)، سەفا پڕ بوو، کە ئەو شێری شکاری خوو
بەهەیوانی وەفادا چوو، بە توڕڕەی ئیجتیهادی هات
لەسەر حوکمی ئەزەل (ڕاجی) کەکێشای ڕەسمی تەئریخی
جریوەی کەوکەبەی دایم لەبورجی ئینفیرادی هات[1].

## پەسنی شامیل یەعقوبی - جێنشینی کۆیە

(١)

خودا چەرخی بەکاری کیمیا کرد
هەوێنی دادی، پڕ عەمردو سەما کرد
دەروێشی دا، قەزایی کۆیی سنجاق
کە ڕۆژی ڕوونی کوردی ئاشکرا کرد
بڵێسەی عەدڵو ئەستێرەی سەعادەت
بە قائیمقامی ئێمەی ڕەهنوما کرد
ئەوەی یەعقوبییانە، کاکە شامیل
هەموو دەردێکی بێ دەرمان دەوا کرد
ئەهالیو شێخو ئاغاوو مەلاکان
هەموو پێویستی هەر کەس، پێ ڕەوا کرد
لەسەر مقیاسی ژیری، بێ تەرازوو

---

١-ئەم نیوەدێڕە بە پێی هەژمارکردنی پیتەکانی ئەبجەد دەکاتە ساڵی (١٣٥٤ کۆچی) بەرامبەر بە ساڵی (١٩٣٥ زاینی). بەڵام دەبێ بەم شێوەیە هەژمار بکرێ: (جریوەی کوکبەی دایم لە برجی انفرادی هات)، کە ڕێنووسی دیوانەکەیە.

بەرانبـــەر هـــاتو، مـــەخلووقی ڕەهـــا کـــرد
لـــەڕووی بەخـــشین و لوتـــف و ڕەحـــم و ئینـــصاف
قـــەزاییکی تـــەڕو تـــازەی بینـــا کـــرد
بـــە عـــیلم و فـــەنن و وریـــایی، لـــە پـــڕدا
بەعالـــەم کـــەهروبای بـــەهرەی وەفـــا کـــرد
لـــەڕێی تـــەحلیل و تـــەرکیبی ئەساســـی
بـــە بـــەرزی نیـــشتمان، فـــەرزی ئـــەدا کـــرد
کـــە هاتـــە ســـەر ژمـــارەو جـــەبرو نیـــسبەت
شـــکاوو ســـاغ و ئـــاوەنجی جیـــا کـــرد
کـــە هاتـــە ســـەر مەســـاحەی میللـــەتی خـــۆی
هـــەموو شـــەکلێکی پـــەرداخ و بـــەجا کـــرد
کـــە خـــاوەن خۆیـــەتی بـــۆ ئـــەزم و تـــەرتیب
دڵـــی کـــوردی پـــڕی حەمـــدو ســـەنا کـــرد
بـــووە بـــاوکی بەشـــەر، وەك دەوری ئـــادەم
بـــەڵێ وەك نووحـــە، کەشـــتی بـــۆ چـــیا کـــرد
حەقیقـــەت، فەیلەســـوفێکە لـــە کـــوردان
کـــە دەســـتووری ســـولەیمانی پـــەیدا کـــرد
کـــە ئـــەو گەنجـــەی بـــە ئـــەم چـــەرخە نیـــشان دا
خـــودا ڕەحمـــی بەقـــەومی بـــێ ئـــەوا کـــرد
بەچـــی کـــەم وەســـفی ئـــەو عـــالی جەنابـــە
کـــە (شـــامیل بـــێگ)ە نـــاوی، ئینتیهـــا کـــرد
وەرە (ڕاجـــی) ، بپـــاڕێوە لـــە یـــەزدان
کـــە ئێمـــەی وا برایانـــە تـــەبا کـــرد.

١٩٤٣

(٢)

بە نووری هێز ڕووناکن، زەمین و ئاسمانی کورد
بە ئاتۆمی عەمەل پاکن، دڵ و کەللەو گیانی کورد
بە بڕیاری جیهانگیری، هەموو یەك بیرە وەستاوە
نیشانەشکێنی ئاواتە، سەروکاری زەمانی کورد
کە تەئریخیش نەکا ساغی، بڵێن ڕەحمەت لە ڕابردوو
کە ئێستا ئەو بەهەشتەی خوا ئەفەرموێ، نیشتمانی کورد
مشوورگێڕی ئەگەر زۆریشە، کورتی پێت بڵێم کێیە
ڕەئیسی شاری کەرکوکە، شەهی ڕوتبەو نیشانی کورد
نەسەب (یەعقوبی)یە، ناوی بە (شامیل بەگ) ئەناسن گشت
کوڕی بەگ (صافی عەبدوڵڵا)، ئەجاحی ئیمتیحانی کورد
لە ژێندا کۆن و بێ تام بوو بوو قەومی ئێمە، سەر لەنوێ
دلێرێکی وەها بەرزی بە دەستووردا ژیانی کورد
ئەبینن هەورو بارانو، بلاچەو مانگو ڕۆژو چەرخ
لەرووی قازانجەوەن گشتی، بەگشتی پاسەوانی کورد
گوڵی بەختی وەری بوو، چرچ و سیس بووبوون گیاو داری
گوڵی پشکووتەوە دیسان، گەش و تەڕ، باغ و بانی کورد
چریکەی بولبول و قومری و، زریکەی بازو نازی گەل
ئەسیریان دایە بەر سەودای شەپۆلی کەشکەلانی کورد
ترینگەی تەپڵی جەژنە، پڕ بە دونیا، ئەمسەرو ئەوسەر
ژیاوە، نامرێ، سەربەست بۆوە خانەدانی کورد
بەزانین و بە وریایی، بە بەخشین و بە ئابووری
لەچاخی ئەم حەکیمە، سەربەخۆیە کامەرانی کورد
شەهەنشاهێکە بۆ ژین و ڕەوشت و پاسی سەربەستی
نموونێکی ئیرادەی خوایە، ئەم نوتق و بەیانی کورد

سوپاسی ئەو سوپاسالارە، (ڕاجی) قەت تەواو ناکا
ئیتر هەر جەژنی پیرۆز بێ، هەموو هۆزی جوانی کورد.

(٣)

قائیمەقامی کۆیە، گەنجێکی شەهسوارە
ساحێبقڕانی دەوران، مەردێکی پایەدارە
(یەعقوبی)یە نەژادی، کە (شامیل بێگ)ە ناوی
سەرداری عێلو هۆزی کوردی وەتەن بەهارە
ژیانە خاکی پڕ کرد، حەسانەوە عەشیرەت
کۆمەڵ هەموو لەبارە، دوژمن هەموو هەژارە
وا کارەبای عەدالەت هەڵبوو لە موڵکو میللەت
گورگەو شوانی بەرخە، گوڵەو ئەنیسی خارە
وا کیمیایی لوتفی، ڕووی نیشتمانی پۆشی
دڵێکو سەت هەزارە، گوڵێکو سەت هوزارە
ڕوویی مەقامی بەرزی، ڕووناکە وەك ڕوخی خۆر
ئەحکامی بێ گرێو گۆڵ، میزانی زوڵفی یارە
بە تەرزی ڕێکوپێکی، ئەم شۆخە چونکە هەستا
هەموو بەهەشتە هەرچی لادێوو دەشتو شارە
ئەستێرەکەی درەوشا، بەتاجی سەعدی زێڕین
مناڵو پیرو بوڕنا، هەموو قەدی چنارە
(ڕاجی) بەخۆتو کۆمەڵ، بخوازە سا دەوامی
ئەوی سوپاسی ناکا، زانراوە نابەکارە.

(٤)

ئـەو سـەروەرە سەرپـشکە، لـە کۆمـەڵ کـە عـەواڵـە
(یەعقوبی)یـە، (شـامیل بـەگ)ە، شـاهێ بـە کەماڵـە
دەسـتووری بــە سەربەسـتییو بەخـشینە بەعالـەم
زانـــاوو خیرەدمەنــدە، خـــودا شـــاهیدی حاڵـــە
تێکۆشـەری بــەرزی وەتــەنو، پەروەرشـی کــورد
زنجیرەیــی کـــرداری، هـــەموو نـــەقشو جەماڵـــە
دیـــوانی پــڕە، شـــاه و گـــەدا دێنــە سوپاسـی
لـەم دەورە نـــەزانیش، هـــەموو زانـــستی لەپاڵـــە
لَمّـــا اختَـــرَعَ الوَحـــدَةَ و الأُلفَـــةَ فی القَـــوم
قَـــدْ إمْتَلَـــأت عرضَــــةُ دُنیـــا بِعَدالَـــة
واللهُ، لَقَـــــد ضـــــاءَ بِمَجْــــدٍ و ســـــعادَةَ
لَمّـــا عَـــزَلَ الخـــائِنَ، والـــصِدقَ أمالَـــه
(ڕاجــی)! نەتــەوێ باســی سوپاســی کــە بنووسـی
قوربـــانی بکـــە هەرچـــی گیــانو ســـەرو ماڵـــە.

(٥)

بنــازم، کاکــە( شــامیل بــەگ) ، پڵێنگــی کــوردی دەورانــی
کــوڕی (بــەگ عەبــدوڵا صــافی)ی، بڵێـسەی نــوری یــەزدانی
نـــەتۆی وا (جێنـــشین) لـــەم کۆیـــەدا، کۆبۆتـــەوە میللـــەت
بــە ڕوتبــەو شــانی ئەســکەندەر، لەســـەر تـــەختی ســولەیمانی
وەکـــو زۆرێـــك لــە دڵـــسۆزان، هومێـــدو بــەختی ئــەم هــۆزەی
لـــە عـــیلمو فەیلەســـووفیتا، ئەرســـتۆ یانـــە لوقمـــانی؟

بە بەخشین (حاتەمی تانی)، بە داد (نۆشیرەوان) ی تۆ
بەلاغەت (ئیمرولقەیس)ی[1]، فەصاحەت پێشی (سەحبان)ی[2]
بەچی وەسفت بکەم، یارەب، حەسوودت غەرقی ئافەت بێ
لەھەر شێوەو رەوشتێکا، گرانیت کردە هەمرزانی
بڵێن (راجی) هەتا ماوی، خودا بیکاتە بەرخوردار
لەسایەی پێبگەن گەنجی وڵاتو مەردی کوردانی.

## پەسنی مەلا عەبدوڵڵا - کاتبی دادگای کۆیە

مایەیی ژینی منو، بەرزی وەتەن، شابازی کورد
نووسەری دادو عەدالەت، میهتەرو هەمرازی کورد
خۆشەویستی گیانو دڵ، ئاواتی گەل، نرخی عەمەل
ژیرو زانا، پیری بیو، زاخی هۆشو نازی کورد
تاجی سەر، بازی هونەر، سۆزی جگەر، باغی بەبەر
شێری ژین، شیی مژین، شاهێزی تین، شیرازی کورد
تا فەلەك دەرخا، وەکو کاکە عەبدوڵلایی من
نایەتە باسو قیاسی عامو خاصی رازی کورد
تا سولەیمانی، بکا شاهی سلێمان ئاوەدان
نایەنێ وا شارەزای بازاڕی هیمەتخوازی کورد
دڵ کە بیری ئەو ئەکا، خوێن هەڵئەرژێو دێتە چاو
هێند گەشو ڕووخۆشە یاری یارمەتیو دەمسازی کورد

---

١ یەکێك بووە لە شاعیرە عەرەبە ناودارەکانی سەردەمی جاهیلی.

٢ سەحبان: ناوی (ابن زفرین ایاس وائلی)یە، وتاربێژێکی بەناوبانگی عەرەب بووە لە ساڵی (٥٤ کۆچی ٦٧٤ زاینی) کۆچی دوایی کردووە. (مەعاویە) پێی گوتووە: تۆ بەهێزترینو بەتواناترین وتاربێژی عەرەبی.

لێوی خۆش گوفتاری هەروەك دەستەچیلەی كێوی توور
كارەباو دەرمانی زامو، حەنجەرەی ئاوازی كورد
بۆ ژیانی گەل، چ تێكۆشەر، ئەهەنگو، پاڵەوان
ڕاوەبەختی نیشتمانو، ڕابەری ئیعجازی كورد
گیانی شیرینی گەلو (ڕاجی)، كە هەر تۆی گیانەكەم
چاوەڕێم گەش بێتەوە پێت، ڕوومەتی لاوازی كورد.

## سوپاس و بەخێرهێنانی
## حاكم عەلائەددین - دادوەری دادگای كۆیە

(١)

كە ڕۆژنامەی لەمێژ و، چەرخی دەووار
نیشانی دا نیشانەی نیشتمان كار
لە نیسانا، نیسانەی سەوزو سوور كرد
كە باراندی لەدەریا، دوڕی شەهوار
پرۆتۆن، لێكترۆن، نوورسانو گیسان
پیا زنجیری بەدكاران، بەیەكجار
(عەلائەددین)ە كاكم، حاكمی (كۆ)
گەیشتۆتە هەموو مەیدانو هاوار
لە دەریای كۆششا، گەوهەردەڕێنە
بەقازانجی وەتەن، بۆتە كەسوكار
سەری بەرزو، دڵی پڕ بیرو، ڕوو خۆش
بەخوو شیرینو، خاوەن تەرزو گوفتار
(سلێمانی)ی نیشانداوم، سلێمان
مولازم ئەووەلی لەشكر، بەملیار

لــه بــه‌گزادانی کــورده، کاکــه (حامیــد)
نــەوه، جێگــەی ســوپاس‌و کەشــفی ئەســڕار
مــودیری (تەفتــیش)ی مــه، کاکــه (ڕەمــزی)
لــه بــه‌گزادانی جافــه، مــەردی ســالار
ئەناســیّ ڕێــزی یــاری‌و، هــۆزی سەربەســت
ئەترســێنێ ســوپای هــۆزێکی لاســار
سوپاســی (قــادر ئەفەنــدی)، نووســەری چــاك
دەكــەم هــەردەم، بــەبێ پایــان‌و میقــدار
لــه ئیجراتــاتی حــەق، بــێ چــەندو چــوونه
گــوڵی گەردنکەشــی نیــسان‌و نــادار
بەماموٚســتا (حەمــەد)، زانــین دەروێشــا
ئەرســتۆی دا بــه ئەســتۆ، مــەردی جێــدار
لــه چــەرخی فەلــسەفەیدا، قوتــب‌و میحــوەر
لــه عــەردی هەندەســه، ئــەو بۆتــه پــەرگار
براكــەم، (كاكــه قــادر)، ویــش موعــەللیم
گــوڵی ســەر تــەپڵی ســەرمه، مــەردی هوشــیار
قــەدیمین پێکــەوه، هــەر بــۆم ئەبێنــێ
وەکــو ئەســتێره بدرەوشــێ لــه ئاقــار
بــرای عــارەب زمــانم، کــاك (نــەجیب)ه
نفوســی خــسته بــەر مقیاســی ئــەژمار
قۆمیــسەر ناحییــه، (صــدیق ئەفەنــدی)
لــەبیرم چــوو، کــه بینووســم هــەوەڵ جــار
ئــەویش ڕۆحێکــی کــورده، بــێ فــڕوفێڵ
لــه تــەحقیقاتی کۆشــەر، هــەروەکو مــار

بـرای خـۆم، دڵـبـەری خـۆم، (کاکـە ڕەش) بـێ
پەســـەندو، حـــوورِوو، گـــەنجێکی خەبــەردار
ئـیتر (کـاك مـسـتەفا)، وەسـفی بەچـی کـەم؟
لـە یاریـدا، سـەدای هـەی هـەی، دەلـۆ سـوار
لـــە ئەسـلاکی، (ســەعید ئاغـــا) ئەناســم
هـــەوای وەرگرتنــــی ئـــەخباری ئـــەقتار
بـــەخێرێن، تابیعـــەو گـــشتی لیـــوا، حـــەق
بـــە خزمـــەتکاری دەوڵـــەت، یـــەعنی جانـــدار
ئـیتر (کوێخـا حوسـێن)ە، مـیری (گـەرمۆك)
کـــە زۆرم خۆشـــدەوێ، مـــاقوولێو موختـــار
لـە(کـارێز) دادەنیـشێ، کـاك (موحەمـەد)
ئەناســـەن کۆیـیـــە، ئـەو مـــەردی ســەرکار
لەســـەر چـــاوو دڵو گیـــانم، بکـــەن شــەوق
بـە چـەنگو نـەی، کەمانـچەو، بەربـەتو تـار
لـــەدیوانی (عـــەزیز ئاغـــای غـــەفوری)
مەلـــەك دێنـــە ســـەماوو بـــەزمی دیـــدار
لـــەپێکی بـــادەدا، دڵبـــەر ئەکێـــشێ
عکوســی ڕاســتو چـەپ، وەك زوڵفـی عـەییار
بـــەخێرێن، هـــەر لەســـەر گیـــانم، بـــەخێرێن
گـــەلی ئـــەربابی مـــەعناو، قـــەومی بێـــدار
بەچـــاوی ئێـــوە، کـــوردم ســـەربڵندە
بـــەناوی ئێـــوەوە، مـــن بوومـــە بەشـــدار
لـــەوەی خۆشـــی زیـــاتر، بـــۆچ بگونجـــێ؟
دڵـــە ســـافو، جگـــەر نـــەیماوە ئـــازار

چ کۆمەڵ، کۆمەڵی بەزمو زەماوەن
چ کۆمەڵ، کۆمەڵی زانستو نیقرار
ببوورن، گەر نقوستانە لەڕووتان
کە(ڕاجی)، ناکەوێتە کێشی نەسپار.
١٩٤٥

(٢)

## نامەیەك بۆ حاکم عەلائەددین

برای بەڕێزم کاك عەلائەددین
سوپاست ئەکەم لەمەرگو لەژین
بەنامەکانت، کە گەش بومەوە
نامن لەسەر چاو، هەزار ئافەرین
ئەو کاتە وابوو، بەرەنگاری کات
لەتۆ تەئەسوف، لەمن ئاه و شین
کاتێکی تر دێت، خودا حەز بکات
کە دوو دەستی یەك، گەلێ ڕاگووشین
بە ئاوات و هات، بە جەرگی بەسۆز
بەگرژینەوەی ولاتی ئەمین
ئەوەك خوێندەوار برای یەکترن
خوێندارن هەتا لەڕووی خوێنمژین
ئەو کاتە ڕۆیم، پێویستم سەفەر
ئەتۆ ببووره، لە کورتیو لە قین
لە بیم ناچێ، لێرە، لە کۆیە
کە ڕامانبوارد، بەچەند زەوقو بین

خـــصوص، کـــه هـــاتم بـــۆ مـــاڵی ئێـــوه
ئەســـتێرام هـــەڵات، لەخۆشـــی یـــەقین
دنیـــا هـــەر وایـــه، دڵان لێـــك نـــەکا
دەبـــا تـــاخ بخـــۆین، بەدیـــدەی نـــومین
عالـــەم هـــەزار دڵ، ئێمـــەش تێکـــەڵاو
بەوێنـــەی خـــەیاڵ، گوڵـــستان چـــنین
فەرموتـــه ســـاڵێك بـــەبێ گلـــەیی
ســـەد ســـاڵی تـــر بـــێ، بـــرام، خۆشـــترین
ئێـــسته تـــالع ڕەش، کـــه دوور کەوتنـــەوە
هیوامـــه پێبگـــەم، بـــەباڵی فـــەرزین
لـــەنێزیك و دوور، بـــێ بەینـــه بـــۆ دڵ
گیـــانی وریـــای ســـەماو زەمـــین
بـــه بـــیری ئێـــوه، دەکـــەم هـــەمو دەم
چـــاوی دڵ ڕوونـــاك، تـــامی دەم شـــیرین
گەرچـــی تـــۆش وەکـــو منـــی برینـــدار
خوایـــه چارەســـاز، بەهـــەر پێکگـــەیین
کـــاکی خـــۆم، مـــرۆڤ بـــه ســـەبرو ســـوبات
بـــه داخـــواز نـــەگا، بـــەبێ نـــەنگ و کـــین
نەکـــەی خـــەم بخۆیـــت، لـــەنازی گـــەنجیت
بـــه خـــۆراکی ڕۆح، باغـــت کـــه پـــەرژین
بزانـــــــــه ڕۆژت، هەڵاتـــــــــه ڕۆژه
شـــەوت بـــه پرشـــنگ، بەتافـــه پـــەروین
دەســـتی پـــیرۆزی باوکـــت مـــاچ ئەکـــەم
ســـەلام لـــه (دڵـــشاد)، بـــرای بـــه تـــەمکین

دلاوەر، کۆسـرەت، چـاویان مـاچ نەکـەم
سـەلام لـە خوشـکان، بـە حورمـەت بـژین
والیـدەی عـەزیز، بـەخێر بێتـەوە
لـە پایتـەختی بـێ، بـە سـەد هێـزو تـین
نادیـدە، عـەرزی سوپاسـم بـەرە
بـۆ کاکـە حـاکم (محەممەد ئـەمین)
ئـەویش کەسـێکە، وەکـو سـولەیمان
خاوەنـدی چـاکەو، نقـێم و نگـین
چ خۆشـە بـرام، لـە ڕۆژانـی شـاد
بـە پـرس و وەرام، کـە دابنیـشین
ئەمـە کـەزەی دڵ، ئـەوش نیـشتمان
لـە بـەینی سـۆزو، گەشـەو، پێکـەنین
بـە ئـاوازی خـۆش، بـە نۆتـەی هـەوس
هـەوا بکەینـە کـوورەی ئـاگرین
لـەڕێی تەماشـاو، موتـالای ڕووان
هەسـتینە هەسـتی لەچـاوان دزیـن
هەریـەك بـە ڕەنـگ و، هـەر یـەك بـە دەنگێ
هـەر یـەك بـە بۆنـێ، تێکـڕا بپـشکووین
کـە یـەك دیـار نـەبوو، ببینـە خـەمبار
بـۆ ئـووری کولـمەی، بـە زاری و گـرین
زەوقـی جـەمات و، یـاران و، یـاری
بڵـێ گیانـە، لـەناو مێـشکی ژیـن
ئـەتۆ زۆر باشـی بـرام لـە شـارا
ئـەمن لـەلادێ، پەراسـووم ڕزیـن

وا مـــــردووم، وەهــــا، نابووژێنمـــــەوە
بەســـــەد نــــارەق و، بـــــە ئەســـــکەنجەبین
بێـــــدادە دەردم، قـــــــەرارم نـــــــەما
لــە لێفــەو دۆشــەك، لــەهیچ ســەر ســەرین
لـــــە دەردی دووری، هــــــاواری کـــــێ کـــــەم
کــە فریــام کــەوێ، لــە گرمــەی تــەپین
بەبەخــــــشە زاری شــــــکاتم نییـــــــە
قەڵــەم تــــەوژمی نـــــەما لــــە نووســـین
خـــۆی پـــیرە (ژێکـــۆ)، خـــەیاڵی تـــازە
وەکـــو لەشـــەودا، جـــەماتی پـــەروین.

(٣)

ڕۆژی جەژنـــە، وەختـــی ڕوونــاکی دڵـــی کوردانمـــە
دەسگوشـــینو ســـەربڵندی، ئێســـتە وا میوانمـــە
کۆمـــەڵێکی نیـــشتمانی بـــۆ ژیـــانم دابـــەزین
یـــەك بەیـــەك تــاجی ســەرو، پرشـــنگی دوو چــاوانمە
حــاکمی کۆیــسنجەقە، کاکــە (عەلائــەددین)ی کــورد
مـــەردی سەربەســـتی ڕەوشـــتو، دیــاری یەزدانمـــە
پایـــەیی بـــەرزی، دەکـــا دەرمـــانی دەردو ئـــارەزوو
غایـــەیی تـــەرزی ئـــەوە، ڕوتبـــەو نیـــشانەی شـــانمە
یـەك، مــولازم بـوو لەکۆیـە، ئێستە تـەموین ئـەمر ئـەکا
کاکــە (مــەحمود بــێگ) ی ســەروەر، ڕەهبــەری هۆزانمــە
بــۆ هــەموو کــاری وەتــەن، ئــەو بۆتــە شــایانی ســوپاس
بـــۆ هـــەموو بـــیری لـــەجێی بـــاپیرەوو باوانمـــە

نووسەری بەردەستی حاکم، کـاکی خـۆم (عەبدولـصەمەد)
جێـی هومێـدو سـەنگەری ئـەم کـوردی سـەرگەردانمە
ئـەو جـەوانی تێگەیـشتوو، کاکـە( ئەسـوەد)، ئـەوتوجارِ
ئـــارەزووی ســـەربەرزیو، نەقدینـــەیی خێرانمـــە
وا لـــە دیـــوانی (عـــەزیز ئاغـــای غـــەفوری زادە)دا
ڕۆژو مـــانگو موشـــتەری‌و زوهـــرە، لەســـەر عەردانمـــە
گـــوڵ دەمـــێنو، دڵ گەشـــێن، ڕۆژی ژیانـــە وەك بـــەهار
بـا لەسـەر ڕەگ شـێن ببـێ، ئـەم هـوزە گـەر پاوانمـە
مـن لـە ڕێـی ئـەو سـەروەرانەم، سـەر چییە، قوربانییـە!
(ڕاجیـــا)، چـــونکە نیـــازی گـــشتییان هەڵـــسانمە.

(٤)

إنَّ بَـــيتي لغتيـــق، وأعـــيشُ في مَجـــالِ
ونَـسيمُ الـدّهرِ أعيـا النـاسَ في تـشريحِ حـالي
طالَمـــا أزهقَـــني الأيـــام في زخـــفِ اللّيـــالي
لَيـــتني أعـــرفُ نفـــسي، وَيَمـــيني وشِـــمالي
لَـمْ يُجـاذِبْ مغنطيـــسي، عنـْـدَ سَـلبٍ و ثُبـوتٍ
وأرى الأحـــلام تَعـــدو الحَـــقّ في سَـــهرِ الخَيـــالِ
عِنـــدَما جـــاذَبَني الحـــبّ، وإخـــوان المَعـــالي
قَـدْ تَرَكـتُ العَيـنَ تجلـو بِالـدُّموعِ والوِصـالِ
يـا دُمـوعَ الحُـبِّ، هَـل تجـرينَ صِـدْقاً بالأمـالي؟
أمْ بِنـــارِ القَلـــبِ تغلـــينَ دراكـــاً للمَـــوالي
يـا عـلاء الـدين، يـا شَمسُ الضُّحى، غَوثُ الفُؤادِ
إنَّـــكَ المُخْـــتصّ عنـــدي، بِـــسَجايا و خِـــصالِ

یـــا أبـــا المَجْــــد غیاثـــاً، أنـــا في أنحـــس حـــالِ
لَــــو بَقیــــتُ فیــــه فــــلاّ تقــــدرُ حَمــــل الوَبــــالِ؟
تــۆ، کــه خــاوەن بــیرو زانینــی هــەموو کــارو وەرامــی
ناتــەویَ پــیر بم بەگــەنجی، یــا بگــەم هێــشتا بــە کــاڵی
تاجی سەرمی، چونکە تۆ هەر بۆم بژی، گەنجی ژیانی
چــەندە تــاری کێوکــەژ بم، دیمــەوە، دەبمــەوە مــاڵی
سەردەمێك بوو، بێ خەبەر مابووم لە گێژاوی غەمانا
ئێستە خۆشیم هاتو شەرتە، دانەنیشم بە بەتاڵی
دەســتگیری دیــتنو دونیــام نێــوەنو، نــووری تــەواون
زەنگوڵــەی دڵمــە، لــە دووریتانــە تــەڕوا ناڵــەناڵی
إنَّ (راجــــــي) بِهَـــــواکُم ذابَ یَــــــسْعی لإنْجِمــــــاد
فَعَلَــــیکُم عِــــزّ جُهْــــد، في قرانــــي وَارتِحــــالي.

### پەسنی حوسێن بەگ

کێیــــە؟ هونــــەری بــــۆ گەنجینــــە کلیلــــە
شــۆخێکە، ســەعادەت لەســەری ڕۆژی جەلیلــە
قــائیم لــە مــەقامی مەلەکاندایــە (حوســێن بــێگ)
باوکیــشی، هــەموو کــاری جەمالــە کــە (جــەمیل)ە
وەك ڕۆژە بــە زەرڕاتــی حــەقایق، لــە ســەمادا
بۆ بــەخشو عــەتا، بــەحری ســپیو، چــاوەیی نیلــە
ڕووحێکە لەناو جیسمی وەتەن، مەردی بەناوبانگ
یــاری هــەموو ســەربەرزە، هــەموو دوژمنــی دیلــە
فکــرش بــدل خلــق، چــو جــان در تــن پاکــان
معــــزول شــــده از همــــه اوصــــاف رذیلــــه

قـد أحْكَـمَ مـا يَختَـرِعُ اليـوم وأمس
مَـنْ راجَعَـهُ يَفْـرَحُ مِـنْ غَـيرِ وَسـيلَة
ایـن گـنج همـایون، بهمـین حکـم در ایـن کـوی
وَالله قَـد إخـتَصَّ بِمَجْـدٍ وَفَـضيلَة
در دائـرهٔ چـرخ بـود همچـو سـکندر
لا يَغْـرُبُ عَـنْ عِلمِـهِ أفـرادُ قَبيلَـة
لـەم گەردوشـە پـڕ شۆڕشـە، (ڕاجـی) نییـەتی بـاك
ئـەو حـەزرەتی سـەردارە، کـە بـۆ کـاری کەفیلـە.

## پەسنی ئەحمەد دڵزار

چـاوەی هونـەرو، نوکتـەیی سـیمینبەرە دڵـزار
هیـوای وەتـەن‌و جـەرگی دڵو، دڵ بـەرە دڵـزار
ئـاواتی گـەلی بـەهرەوەری کـوردە، بـە یـەزدان
کـوورەی هـەموو زنجیرەیـی بـێ جەوسـەرە، دڵـزار
گەنجێکـە، لـە دیـوانی ئەدەبـدا هەڵیـداوە
تیمـاری دڵو سـپڵو هـەناوو سـەرە، دڵـزار
ئەسـتێرەیی ئـاواتی درەوشـا لەسـەمای کـورد
هـەر وەك منـی ماتـەمزەدە تێکۆشـەرە دڵـزار
ئـەو تـازە نـەمامی وەتەنـەم، بـۆ بـەری خۆشـی
وا پێگـەییوە، کـانی گـوڵو زێـوەرە دڵـزار
بـیری لـەدڵو گـوێی ئودەبـا، گـەر بـچەقێنێ
هێنـد تیـژە ئـەڵێی نـووکی ڕمو نەشـتەرە، دڵـزار
دەسـتووری ژیـانی گەلەکـەی دائـەڕژێنێ
بەشـکو نەتـەوەی تـازەرو ئەسـکەندەرە، دڵـزار

چیمە لە شکسپیرو، لە ڕۆستۆن و، لە گۆتە
گەنجینەیی کوردانە، کە دەرهێنەرە دڵزار
(ڕاجی)! تۆ بڵێ نووری دوو چاوو دڵو جانە
هاوخوێنی منو کوردە، ئەدەب پەروەرە دڵزار.

**پەسنی ڕاجی لەلایەن ئەحمەد دڵزارەوە**

ئیمڕۆکە لەناو ئەهلی ئەدەب سەروەرە، ڕاجی
خاوەن خەدەمو تەختو سوپاو ئەفسەرە، ڕاجی
بەبرێکە، هۆژەبرێکە، لەمەیدانی ئەدەبدا
مانەندی نییە لەم وەتەنو لەم دەرە، ڕاجی
بۆ زینەتی ئەندامی بوتی شیعری گەلی کورد
ئوستادی هەموو خشڵو چەکو زێوەرە، ڕاجی
ئەو، گەورەترین گەوهەری سەرئەفسەری شیعرە
مەشهوورە لەناو گشت شوعەرا، ئەشعەرە ڕاجی
تیشکی هونەری شیعری ئەوەند ڕۆشنە، چەشنی
پرشنگی گەلاوێژو مەهـ و ئەختەرە، ڕاجی
گەنجێکی ئەوەند بەهرەوەرو واهییە، حەتتا
هاوبیری شکسپیرو عەلی حەیدەرە، ڕاجی
بۆ نیکییو دەرخستنی ئەم کۆمەڵە کوردە
غەمخۆرو مشوورگێڕو عەجەب ڕەهبەرە، ڕاجی
بەم ئاگری پڕ میحنەتە سووتاوە، بەیەزدان
کوردێکی جگەرسۆزو وەتەن پەروەرە، ڕاجی
(دڵزار)! وەرە تۆ بێژە، بچرپێنە بەگوێی گشت
پێغەمبەری زومرەی ئودەباو هونەرە، ڕاجی.

## پەسنی گیوی موکریانی[1]

**(١)**

ڕووناکـی چـاوم، هەتـاوی مـاڵم
کاکە (گیو) گیان، نرخ و فەساڵم
لەســایەی تۆوە، هەوێنـــە کانم
دەوڵەتــم تەواو، نەورۆزە ساڵم
چەرخم لەگەڕدا، ســـەمابازە قەد
لە عەردی ڕەنگین، نەمان لات و بەد
پایانــی نادا، خۆشــی ڕەسم و حەد
خەرمانی خێران، لە کشتوکاڵم
ئەگەر کزیشــم، کەســێ نایەوم
لەباوەشــی غەم، ئێســتە ناخەوم
شەرتە بۆ وەتەن، هەرگیز نەسرەوم
بفرۆشـــم لەڕێی، ماڵ و منداڵم
چیـمە لـە ئاتۆم، لـە هایدرۆژین
لـە گازی خنکێن، لەگەڵ ئۆکسجین
کە کارسازی هەق، سازاندی بۆم ژین
نارێــکە دوژمن، ڕێکە هەواڵم
نۆرەی بەهارە، بە زەوق و شادی
مێرگ و هەوارە، سەرو ئازادی
تازە خەڵســـتام لە نامرادی
(ژیکۆ) گوێ بگرە لە گاڵەگاڵم.

---

١ ناوی تەواوی مامۆستا گیوی موکریانی نووسەر و زمانزان و ڕۆژنامەنووس (عەبدوڕڕەحمان سەید لەتیف شێخ ئیسماعیل خەزایی)یە. لە ساڵی (١٩٠٣) لە شاری مەهاباد لە دایک بووەو لە (١٩٧٧/٧/٢٤) لە موسڵ کۆچی دوایی کردووەو لە هەولێر لە گۆڕستانی (ئیمام محەممەد) ئێژراوە.

(٢)

دانیشتووی هەولێرە، زمانپەروەری کوردان
ناسراوە لەناو کوردو عەرەب، (گیوی موکریان)
چەند ژیرو، هونەرمەندو، گیان سووکە لە ڕوودا
چەند بەرزو، ئەدەب پەروەرو، خاوەن دڵو گونجان
تێکەڵ بەهەموو مەردومو، دووریش لە سیاسەت
هانایی هەژارانو، پەرستینەری یەزدان
چەند خۆشە لە تەبیاتی هەموو کەس، وەکو خۆراك
چەند توندە لەسەر جستەیی دوژمن، وەکو سندان
پۆل پۆل ئەوا دێنو دەچن نووسەرو زانا
تا بینە قوتابی هەرەتو فەلسەفە لێدان
نەمدیوە، براکەم وەکو ئەو میهتەرە یەکدڵ
زۆر دوورە لە حزبانو، نێزیکیشە لە خزمان
هەر ڕەهبەری دڵپاکییو، هەر هەمسەری زانست
ئەو ماوەتەوە ئێستە، کە وەستاوە لە مەیدان
پیرۆزە لە ئەو، تازە کە چاپێکی کریوە
ڕۆژنامەیی سەر تەختو، سەراپەردەیی دیوان
بێجگە لەوە چەند ساڵە لە فەرهەنگی خەریکە
ڕێکدانی وەها نەبووە، لە ئێوانو لە دیوان
(پشکۆ)! وەرە تۆ پێکەنە، وەك خونچە بپشکوو
دڵ گەیوە بە ئامانجو، سەریش گەیوە بە کێوان.

(٣)

## نامەیەك بۆ گیوی موكریانی

براکـــەی خۆشەویـــستم، (گیـــو)ی کـــوردی
دەزانم بـــۆ وەتـــەن ئـــازاو مـــەردی
کـــە ئـــاوی تێگـــەڕا، ئـــەم گیانـــە وشـــکە
بـــەدەن خـــواردی، بـــە ســـافی و بـــە دوردی
لـــە دیـــوانی وەفـــادا، یادگـــاری
لـــە مەیـــدانی هونـــەردا، گـــرد و گـــوردی
لـــە تـــۆ زیـــاتر، ســـەرو مـــاڵم نـــەماوە
کـــە داخـــی هـــۆزە هەرچـــی هـــەمبوو بـــردی
دڵـــم پـــڕ ئـــاخ و هێـــشی کـــوردو کاڵـــە
کـــە نـــاڕێکی بـــوو، هەرچـــی هـــاتو کـــردی
شـــەوی لێکجوایـــەزی کەوتۆتـــە چـــاوان
هـــەموو نووســـین درشـــتن، تـــا بـــەوردی
ئـــەوی بـــڕوا بەســـەر بـــەحری مـــرازم
ئەگـــەر گیانیـــشمە ســـا ئەیکـــەم بـــە پـــردی
دڵـــم خنکـــا، لـــە ڕێگـــەی خـــاك و خـــۆڵی
جگـــەر ســـووتا، لـــەتاوی دارو بـــەردی
شـــەوو ڕۆژ، دێتـــە گـــوێم لـــەم خـــاك و گەنجـــە
ســـەدای هـــاوارو، بـــانگی ئـــاهی ســـەردی
لـــە ڕێـــی مەقـــسەد، هـــەتا کوڵـــەی ببیـــنم
لـــە چـــاوانمی ئەکێـــشم تـــۆزو گـــەردی
لـــە خـــاکی ئێمـــە، دوژمـــن چـــەتری هەڵـــدا
چ ئاسمانێکـــە وا هـــەورازە نـــەردی؟

وەتەن! چبکەم لە تۆفانی بەڵادا؟
کە ئەشکی چاوی من بوو، گەردی شەردی
براکەم، چاوەکەم، ڕۆحی ژیانم
مەفەرموو، (ڕاجیا) لەم حاڵە مەردی.

## وەڵامێك بۆ مەلا ئەحمەد[1]

عەلەیکەسسەلام، شاگردی شیرین
خوا بەرزت بکا لە زانین و دین
تەفسیری خەونی شیعرو مەسنەویت
جوان تێبکۆشە، بۆ هەوزو زەویت
پەلە پەل مەکەو، کورتی مەهێنە
دوایی بیرکەوە، هیچ دامەمێنە
هەووەڵ عەروزت، شایانی تەقدیر
شاگردی باش بەو، دوور بە لە تەزویر
تەرازووی شیعران، زۆر تەریقەیە
دەرسی هەرە زل، هەر سەلیقەیە
لە هەموو عیلمێك، تا زۆر بزانی
لە جەولانگاهی شیعرا جوانی

١ بە (مەلا ئەحمەدی سیوەیلی) ناسراوە، لە ڕۆژی (١٩٥١/٩/١٠) بەمەبەستی خوێندنی مەلایەتی سەردانی شاری کۆیەی کردووە، لە ساڵی (١٩٥٢) ماوەیەك لەلای (ڕاجی) لەگەڵ چەند فەقێیەکی دیکەدا دەرسی خوێندووە. لەڕۆژی یەك شەممە ڕێکەوتی (٢٠٠٤/٧/١١) لەمیانی سەردانێکیدا بۆ شاری ڕانیە بە خزمەتی گەیشتەم و گەلێك زانیاری بەسوودم سەبارەت بە (ڕاجی) لێوەرگرت. مامۆستا گێڕایەوەو وتی: (شەوێك لە خەونمدا مامۆستایەك دەرسی عیلمی عەرووزی پێ گوتم، منیش نامەیەکم بە شیعر بۆ مامۆستا ڕاجی نارد، ئەویش بە شیعر وەڵامی دامەوە). شیاوی گوتنە تاکو ئامادەکردنی ئەم دیوانە کە ئەمڕۆ ڕێکەوتی (٢٠٠٩/١٢/١٩) یە، مامۆستا مەلا ئەحمەدی سیوەیلی لە ژیاندا ماوەو لە شاری سلێمانی دادەنیشێ. ئیسماعیل ڕاجی.

ئەگەرچــــی شــــیعر بەوێنـــــەی بووکـــــە
بـــەڵام نـــەك هـــەموو بووکێــــك ڕوح ســــووکە
تــــام و بـــــۆن خـــــۆش بـــــیَ و ، ژیـــــرو ڕازاوە
مەترســــــــە ، بیخـــــە دیـــــوانی شـــــاوە
ئەحمـــەد! هۆنـــەر بـــە ، نـــەك شـــاكی لـــە چـــەرخ
لەگێـــچەڵ دەرچــۆ ، بـــە عـــەقڵ و بـــە كـــەرخ
ســـەلامی بـــەرزم بـــۆ مـــەلا (حەمیـــد)
مامۆســـــتای بـــــەرێز ، تـــــالعی ســـــەعید
كـــاك (عەبدولفـــەتاح) ، ســـەلامی لێكـــە
لەخانــــەی ســــۆزا ، پێكـــی بـــۆ تێكـــە
نـــــەزام جێتـــــان (كەڵكەسماقـــــە[1])
مانگتـــــان لەبـــــەینی بــــەدرو میحاقـــــە
هیـــــوام لـــــە گـــــەنجان ، تێگەیـــــشتنە
ئینجـــــا مـــــــــشوورو پێگەیـــــــشتنە
تـــامی لـــە دونیـــا نـــەكردووە ، (ژیكـــۆ)
هـــەر بـــۆ حـــەقایق ، ئـــەكا جوســـتوجۆ.

## پەسنی گوندی عەودالان

هێـــزی قـــودرەت بـــوو هەڵیـــدا خێـــوەتی شـــین ، ئاســـمان
دەســـتی حـــوكم و حیكمـــەتی خـــستە نیزامـــی ئینس و جـــان
پـــەردە پـــەردە ، بـــورج و قادرمـــەی كـــەواكیب هـــۆنرا
كـــوورە كـــوورە ، عـــەرد و ئـــاوو بـــاوو ئـــاگر داخـــران

٢ گوندێكە لە قەزای دوكان و مەڵبەندی بزووتنەوەی هەقە بووە.

چەرخی عونسورخانەیی دونیا، کە هاتە جۆشی کار
هەر شتەی ڕیزێکی گرت و، ڕۆژو شەو تەرتیب دران
ئادەمی هێنایەدەر، کردیە خەلیفەی جێنشین
بۆ کەمەربەستی ئیتاعەی، گیانلەبەر مەجبور کران
تا لە مندالآنی ئەو، بەدخوو پەیابوون جوون بە جوون
هاتەدی قانوونی وەحییو، پەیڕەوی پێغەمبەران
دۆزەخ و جەننەت، ئیتر، دوو مەوقیفی ئینسانییەت
جەننەتی فیردەوسی خستە باغ و ڕاغی (عەبدەلآن)
لەمەسەری دونیایەدا، تا ئەوسەری چیبکا، وەفات؟
ئەو مەرازی ڕۆحی پاکی مورشیدانەو سالحان
دەستی ناسازی بەسەردا هیچ نەکێشراوە، ئەبەد
نەخش و تەونی عیففەت و، حیکمەتسەرایی لامەکان
بۆ نەخۆشی دڵ دەواو، بۆ نیزامی عەقڵە جۆش
نیشتمانی بیروڕا، دیوانی هەر ڕەمزو بەیان
پێی گەیاندن چەندە پیرو پێشەواو دەستگیر
تێی گەیاندن فەیلەسوف و شاعیرو شانامەخوان
پێم وتی: ئەو جەننەتە لاهوتییە، کاخی جهود
کافریش گەر بێتە وێ، ناچێتەدەر بێ ئیمتیحان
(شێخ عیصامەددین) لەنەسلی (شێخ ئیسماعیل)، هەڵات
ڕۆژی ئەووەڵ نەوبەهارو، قیبلەگاهی جیسم و جان
ناکرێ باسی کوڕانی، کاکە (فەتتاح و، کەریم)
کاکە (عەبدولقادر)یشە، دوورە زەننی موفسیدان
گشتیان خاوەن کەرەم، سەبباروو، دڵ نەرم و عەفیف
گشتیان خاوەن علوم و فەنن و هەر نرخی گران

وان سەعادەتمەندی دونیاو دینو عەقڵو، بەختو تەخت
یەك ڕەئیسی دینو، یەك دنیاوو، یەك مابەینی وان
هەر كەسێ بۆ خۆی بچێ بچنێ گوڵی باغی مەرام
با بچێ، بۆ خۆی بیناكا، كۆشكو قەسرو ئاشیان
حەوزو جۆگەی، كەوسەرو هەنگوینو شیرو ئاوی ساف
جگ بەوی خەونێكی نابینی ئیتر ڕۆحی ڕەوان
بۆچی شێت نابن، ئەوانەی دەركراو لەو جێگەبن؟
بۆچی نەمرن بێ ئەجەل دوژمن بەگیان سەختیو دران
بۆ حەقائیق سەرفرازو، بۆ مەسائیب دڵنەواز
یەكدگیرو، یەك سوباتو، یەك مشوورو یەك نیشان
این همه مزرعه خواهد بجولانگاه عشق
دختر از حق شناسیدن به زندهو مردەگان
از صبا رفتو رسیدی بلبلان كفتُ شنید
در حیا چشم گلان چون غنچەزاری بوستان
بر هوای هر چه شد امد بدین عشرت سرا
از هوا سودا سرو، دل مستو گوش از امتنان
لَنْ تَرى في رَسْمِها رَمزاً مُشيناً، فاستَمِع
شاكراً يَزهو بها الكَونُ الزمان والمكان
إنَّ ما في صنعتي ليس لها شِبهُ وجود
إنَّ ما في عِبرتي لَيسَ بها شَيءٌ يُبان
تابەكەی (ژیكۆ)، وەكو چاوەش نەڵێی باریكەبەند
ناگەیە وسفی تەواوی موشكیلەی جوغرافیان.

١٩٥٤

## شیوەن بۆ کۆچی دوایی
## مامۆستا مەلا تەیب ئەحمەد بەهانەدین

چ شـــۆرێکە ئیلاهـــی؟ ڕۆژی واوەیـــلاو گریانـــە
بەشـــەر پـــڕ شۆڕشـــە، عالـــەم، خـــەریکی ئەشـــکبارانە
بـە بـەردو دارەوە، ئـەم خاکـە وا هەڵـچوو لـەکوڵ، هـاوار
سـەدای ئەملاکـە، ڕۆڕۆی جیننـە، قوڕپێـوانی ئینسانە
لـە جەننـەت هـەڵکراوە چلـچرای ئـەرواحی مامۆسـتا
لـە ئێمـە شـیوەنە، شـایی‌و نیـازی حـوورو غیلمانـە
ئیمـامی تـەیبی ئەحمـەد بەهانـەددین، حەقیقـەت نـۆش
بەرەحمـەت فرسـەتی دەسـگیرە، گەرچـی لێمـە پەنهانـە
کـوژاوە شـوعلەیی ئـەهلی مونـا، لـەم دەیـری سـەوداسـەر
سـەری شـاهان، لەبـەر پـێ، بـەردەبازی جیسـمی بـێ جانـە
لەعالەم چوو، ئەسـاسی عیلم‌و شەرع‌و فـەننی ڕەنگاوڕەنگ
مەگەر ئێسـتا لـە فیردەوسـا، خـەریکی دەرسـی قورئانـە
وەلی عـالیم، عـەلی عـارف، ئەنیسـی دەنبـی پێغەمبـەر
لـەبورجی مـەغفیرەت خورشـیدی تابـانی جیهـان بانـە
لەسـەر عالـەم، زیـارەت واجیبـە بـۆ تـاهیرەی توربـەت
کـە بـۆنی جەننەتولمـەئوا، لـە ئـەترافی نومایانـە
هـەتا دونیایـەکی تـر بۆمـە دێنـێ، چەشـنی ئـەو زاتـە
بـە دائـیم خـۆی غـەریقی بـەحری قوڕپێـوان‌و ئەفغانـە
ئیمـامێکی وەهـا هـۆنراوی قـورب‌و سیلسیلەی فـەتوا
کـە ڕۆیـی، بابگریـێ هەرچـی ئـەهلی عەهـدو پەیمانـە
ئەسـەف بـۆ مورشیدی کامیـل، دڕێـغ بـۆ پـیری ئیدراکان
لەسـەر تەختـەی کەراماتی، کـە ئێسـتەش بـادە نۆشـانە
بنـازم کەوکـەبی بـەختی، (موحەممەد)، قـوڕڕەیی چـاوی
لەڕێگـەی ئـەو ئیمامـە، وا خـەریکی عیلم‌و عیرفانـە

خودایە، ئەو چرایەی کز نەکەی تا ڕۆژی ئاخیر دێ
کە بۆ دینی موحەممەد، ڕەنگو ڕەونەق، شوعلە پەخشانە
بە لوتفی تۆ مونەووەر بێ، لە خوتتەی عومری بەرخوردار
کە باغی عومرو ئەخلاقی، سزای ئەرواحی شاهانە
ئەگەر (ڕاجی) تەماشاکەن، دەزانن گەنجی تەئریخی
وەکو تووتی لە جەننەت، وا بەشی دوو لوتفی ڕەحمانە
ئیمامی مینبەرو، میحرابی وەرعو، جامیعی تەقوا
لەڕۆژی دوانزەمی جومعەی ڕەجەبدا، (بازی غوفرانە)[1].

## سوپاسێکی سەروەری
## بۆ کاکەزیادی حەمە ئاغای کۆیە

(١)

دونیا پڕی جوودو هونەری کاکەزیادە
عالەم هەموو سوێندی بەسەری کاکەزیادە
گەنجێکی وەتەنپەروەرو سوڵتانە لەکۆیە
گەنجینە، هەموو جیلوەگەری کاکەزیادە
بورهانی دڵی کوردییو عەقڵە، لە دەماغا
مەردیو ئەدەبیش بەهرەوەری کاکەزیادە
فەرشی بەری پێی عەردە بە مافوری گیاو گوڵ
شۆخێکە، سەما چەتری سەری کاکەزیادە
تیژاوی ژبانی گەلە، دەستووری هەموو هۆز
شیرین لەبی هیوا شەکەری کاکەزیادە

١ (بازی غوفرانە)، بە پێی هەژمارکردنی پیتەکانی ئەبجەد دەکاتە (ساڵی ١٣٥٦ کۆچی) بەرامبەر بە ساڵی (١٩٣٧ زایینی). بەڵام دەبێ لەکاتی هەژمارکردندا بە (بازی غفرانە) بنووسرێ کە ڕێنووسی دیوانەکەیە. واتە (مامۆستا مەلا تەیب)، لە ڕۆژی هەینی ڕێکەوتی (١٢/ ڕەجەب/ ١٣٥٦ ک) کۆچی دوایی کردووە.

کـــانی هونـــەرو دادو عەدالـــەت، لـــە جیهانـــا
دیـــــوانی پـــــڕو موعتەبـــــەری کاکـــــەزیادە
هەرچــی بەخەبــەر هــاتو، ئــەوەی مــاوە لــە خــەودا
چـــاوی بـــەخودا هـــەر لـــەدەری کاکـــەزیادە
چــیمە لــە ســتالینو، لــە مارشــاڵو، لــە چەرچــڵ؟
هیتلـــەر خـــەدەمو بادەگـــەری کاکـــەزیادە
شـــایانی ســوپاســی گــەلی کوردانــە، بەیــەزدان
فیردەوســـی بـــەرین، ڕێ گـــوزەری کاکـــەزیادە
لــوتفی ئــەوە تــاجی ســەری ئــەم میللەتــە، (ڕاجــی)
وا لـــوتفی خـــوداش، تـــاجی ســـەری کاکـــەزیادە.

(٢)

**لە درێژەی پەسنی کاکەزیاد دا**

هەمــوو عــالەم لەڕووی بەختو مــرادە
دڵــی یاران بە دیدەی شــەوق، شــادە
هەمــوو بــازاڕی دوژمن، وا کەســادە
زەمیــن ڕووناکیــو، جەژنــی بیــلادە
که ڕۆژ بازی سەری کاکەزیادە
شەهی ئیقلیمی کوردانە، بەیەزدان
کە هەر ئەو خاوەنی نانە، بەیەزدان
هەموو فەزڵی لەدیوانە، بەیەزدان
تەلەکتریکی شەبوستانە بە یەزدان
کە زوهرە دڵبەری کاکەزیادە

(سولەیمان)ی عەلەمداری جیهانە
(فلاتوون)ی حەکیمو، دڵستانە
موحیتی عیلمو عیرفانی زەمانە
فەری جوودی، وەکو دەریایی پانە
سکەندەر نۆکەری کاکەزیادە

لە تەئریخێ، کە دونیا دانراوە
مەلەك، جندو پەری، ڕیزە کراوە
نەمامی نۆبەرەی ئادەم ڕوواوە
زەمان ڕۆڵەیکی وای نیشان نەداوە
بڵێم گەر هەمسەری کاکەزیادە

بنۆشن، ئەی گەلی کوردی قەڵەندەر
بە قەرڕابەو، بە بادەی کاسەیی سەر
بە ئاوازی بڵندی میرو نۆکەر
وەکو بولبول نەواکەن، پیرو نۆبەر
کە جەژنی کیشوەری کاکەزیادە

سنووری نیشتمانم، باغو ڕاغە
بلووری دۆستانم، سافو ساغە
دڵی دوژمن، لە سەد جێگاوە داغە
لە بن هاتن، چ قەومی قورمساغە
کە چەرخم، ڕەهبەری، کاکەزیادە

هەموو بەزمو نیازو کامە ئیمڕۆ
هەموو زەوقو کەزەی پێنامە ئیمڕۆ
هیوای دوو لێوی ساقیو جامە ئیمڕۆ
سەروکاری گەلو ئەنجامە ئیمڕۆ
لەساحەو سێبەری کاکەزیادە.

## له پەسنی کۆیەو کاربەدەستان

خـــاكی ولاتـــی (کۆیـــه)، بەرچـــاوەکەی بـــەهارە
هـــۆنراوی ئیـــشوکاری، لـــه چـــاومدا دیـــارە
هۆزێکی وا بـه پێشچوون، وەك پـیری بـیرو دڵخـوون
بـه تێکۆشـین‌و دەرچـوون، شـێرو پڵـنگ‌و مـارە
بـۆ کیمیـــای ئیـــداریی، قائیمـــەقامی عادیـــل
(شـامیل بـەگ)ی جگـەردار، شـابازو شاســوارە
بـۆ ئیـستیلای حقـووقی، (عەلائـەددین)ی حـاکم
لـەم کۆمەڵـەی بـه ناوبـانگ، ئـەو کـانی ئیـشوکارە
بۆ ئیندیفاعی میللەت، ڕۆڵەی (حیکمەت ئەفەندی)
مـدیری مـەکس‌و گـومرگ، ڕۆحـی دڵ‌و دەمـارە
مـدیرەکانی زانـین، سەرچـاوەیی هومێـدن
لـەم مـەردە سـەروەرانە، ئـەم کـوردە بـەختیارە
ساحێب نفووسی کۆیـه، (جـەمال ئاغـای حەوێزی)
بـۆ ئینتیزامـی میللـەت، پـڕ کۆشـش‌و لـەبارە
زەخـیرەداری خێـزان، تـەمرینی نـاوە ئیمـڕۆ
فـەقیرو دەوڵەمەنـدان، هـەموو دەکـا ژمـارە
شـورتەی ئەگـەر ئەناسـن، چ دائیرێکـه، بیڵـێم!
بـۆ نـەخش‌و تـەونی میللـەت، جانـداری جـان بێدارە
سەربەسـتی ئیـشتمانی، تەجنیـدی سـەر بڵنـدە
وەك موغنەتیـسی ڕۆژە، یـان کـەهرەبایی شـارە
ئاغـا لەگـەڵ ئـەهالی، بـه لوتـف‌و چـاوەدێرن
بـارانی فلـس‌و دینـار، لەبـەر دەسـی توجـارە

مقیاسی بەیعو بازاڕ ڕاستو تەواوە، بکرێن
پێویست، لەسەر دوکانی بەقاڵە یا عەتارە
ئەم ڕەبتو زەبتە وابێ، چیمە لە چەرخی دەوران؟
ئەم عەدلو دادە مابێ، بۆچیمە ئیستیمارە؟
سەری خۆشو دڵی خۆش، (ڕاجی) لە کۆیە ماوە
پێشکەش ئەکەم سوپاسم، تا ماوم لەم کەنارە.

## شیوەن بۆ کۆچی دوایی
## سەید ئەحمەدی خانەقای کەرکوك

لە ئیسلاما، ئەوی ئەمری خودا بوو
بە چاپی فەرزو سوننەت داڕژا بوو
ئەزەل، کارێکی هێنایە دروستیی
دروستی کردو، پڕ سوودو بەها بوو
هەیوولای کردە ڕاوێژی سەروکار
بە ملیۆن بەرگو ڕەنگی ئەخشرا بوو
ئیرادێکە هەمزێنی عیلمو قودرەت
کە ئینسان، چاکترینی ماسیوا بوو
ئیتر بۆیە موکەللەف بوو بە ئیمان
ئەخۆشخانەی هەموو دەردو بەلاّ بوو
کە مامۆستایە، بۆ تەحلیلو تەرکیب
مەوالیدو عەناسیر، کیمیا بوو
لە ڕووی پێغەمبەرانو، فەیلەسوفان
ئەسەرخانەی ڕەووشتو بیرو ڕا بوو
زەمانەی هاموشۆ، مێژووی کە ئاژۆت
لە مابەینی بەشەر، نیسبەت پەیا بوو

لــە تــەك پێغەمبــەری‌و، نافــامی بــێ بــەر
دەمــێ ناشــتی، دەمــێ شــۆڕو هــەرا بــوو
لــە نەســلی خاتــەم‌و فــەخری ڕیــسالەت
حوســێنی ســەییدی ئەحمــەد خانــەقا بــوو
کــە هەشــتا ســاڵە عــومرێکی ئەنەخــشان
خــەریکی ڕاهـ و ڕەســمــی مــستەفا بــوو
ئــەدیب‌و، فەیلەســوف‌و، عــەدل‌و، عــالیم
ســەخی‌و، سەربەســتی کــۆڕو، موقتــەدا بــوو
زوبــان چ بڵــێ؟ لەناســینی تــەواوی
کــە ئوعجوبــەی تــەواوی ئــەولیا بــوو
لــە عیلمــی نــەفس‌و، هێــزی موغنەتیــسی
.................................. [1] بــوو
لــەکاتی گــەنجیو پــیری، بــەرەو پــێش
لــەناو شــاری دڵانــدا، کــەهرەبا بــوو
هــەتا ئــاخر هــەواری خزمــەت‌و دیــن
ئــەوی کــردی، بــەبێ فــێڵ‌و ڕیــا بــوو
هــەتاکو جــەژنی قوربــان، ڕۆژی دووشــەم
ســەرو مــاڵ‌و دڵ‌و گیــانی فیــدا بــوو
کــە ئیحرامــی شــکاندو، ماڵــەوای خواســت
ئــیتر مــاڵی موســڵمانان خــەرا بــوو
لــە دونیــادا، کــە تەدریــسی تــەواو کــرد
خــەریکی جامیعــەی دارولبــەقا بــوو

١ بەهۆی تەڕبوونی دیوانەکەوە ڕەش بۆتەوە. بۆمان نەخوێنرایەوە.

بـڕژین، کاکـە (حوسێن‌و کاک موحەممەد)
لەناو ئەمو دائیرەی کانگەی وەفا بوو
ئەوانیش هەر یەکەی، ئەلحەمدولیللا
بەڕنگەی باب‌و باپیران ڕەزا بوو
لە ئەخلاق‌و، ڕەوشت‌و، تێگەیشتن
هەموو خەڵکی لەوانرا شارەزا بوو
هومێدن بۆ گەلی کوردان‌و عارەب
لەگەڵیان بێ، ئەوی لوتفی خودا بوو
بەجێی هێشتین، هەموومان، باوکی مەرحووم
لە جەننەت جێنشین‌و، دڵنەوا بوو
لەگوێی (ڕاجی) زرینگا ساڵی کۆچی
بەفەڕ شادی بەهەشت‌و، ئەولیا بوو[١].

## شیوەن بۆ کۆچی دوایی
## شێخ نورەددین حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادە

لە دونیادا، ئەوی دەردو بەلا بوو
بەشی میراتگرانی ئەنبیا بوو
گرانباری علوم‌و خولق‌و خوو بوون
قیاسی وان‌و خەڵکی، لێک جیا بوو
لە خانەی دواوە، تەزیەت نادرێ قەت
ئەگەر لەم خانەدا، تەزیەت درا بوو
کە پیاوێکی هونەروەر، کۆچی فەرموو
لە جەننەت سەت چرای بۆ هەڵکرا بوو

٢ ئەم نیوەدێرە، بەپێی هەژمارکردنی پیتەکانی ئەبجەد دەکاتە (١٣٧١ کۆچی) بەرامبەر بە ساڵی (١٩٥٢ زاینی)، بەڵام دەبێ لەکاتی هەژمارکردندا بەم شێوەیە بنووسرێ (بە فەڕ شادی بەهشت‌و ئولیا بو). کە ڕێنووسی دیوانەکەیە.

بــه عیلمــی ئــهم جهلیزادانــه، دونیــا
پــڕاو پــڕ موغنــهتیس‌و کارەبــا بــوو
یەکایــەك، نابیغــەی عــیلم‌و ئــەدەب بــوون
لــەوانرا دڵ پــڕی زەوق‌و ســەفا بــوو
کــە نــوری دیــن بــوو، (نــورەددین جــەلیزاد)
ئــەویش هــەر یــەك وەکیلــی مــستەفا بــوو
ئــەویش، ئــەم خانەدانــەی وا بەجیهێــشت
ڕەوان بــوو، مەعــشەری بــاب‌و بــرا بــوو
گەیــشتە دوا هــەواری خزمــەت‌و دیــن
بــە ئیــستیحقاقی خــۆی، وەســڵی خــودا بــوو
خــەریکی دەرســی دیــن‌و، زەوقــی ڕۆحــن
هــەموویان، نــازو نیعمــەتیان ڕەوا بــوو
هــەواری وانــە، قــەت هــاواری نابــێ
کــە زاتێکــی وەکــو ســەعدی تیــا بــوو
ئــەدیب‌و، عــالیم‌و، بــەرزو بــەناوبانگ
هــەوێنی بــیرو هــۆش‌و کیمیــا بــوو
خــودا ئــەم خانەدانــەی تێکنــەدا قــەت
لــە ناوچــاوانی وانــە، دڵ گوشــا بــوو
بمێنــێ‌و، پێبگــەیێنێ کاکــە (مەســعود)
ئــەوی پێویــستی عــیلم‌و ئیرتیقــا بــوو
کــە جێگــەی فــەخری کــوردو (کــۆ)یــە، ئیمــڕۆ
هــەموو ڕوتبــەو نیــشانەی ئاشــکرا بــوو
چ گــەنجێکی خەزێنــەی بــیرو هۆشــە
گەشــەی چــاوی، هــەموو تــەگبیرو ڕا بــوو
لــە عیلمــی دیــن‌و، ئیــستیحقاقی ئینــسان
بــەڵێ، خــاوەن شــەهادەو شــارەزا بــوو

لەجێگـــەی بـــاوك‌و مـــامی، وەك مـــساوی
لـــەڕووی جـــەبری خەســـارەی گـــەل تـــەبا بـــوو
كـــەلێنی تـــێ نـــەبوو، ئەلحەمـــدولیللا
كـــە شـــێخ قـــەومی بەجێهێـــشت‌و، ڕەزا بـــوو
بمێنـــێ كـــاك (عـــەلی)، گـــەنجی بەقیمـــەت
دووای شـــێخ، ئـــەو بناغـــەی داڕژا بـــوو
بڵـــێ (ڕاجـــی)، لـــە تـــەئریخی وەفـــاتی
بەدیـــداری بەهەشـــتی‌و، فـــەوزی شـــا بـــوو[1]
بـــە بیـــست‌و نـــۆی زی قەعـــدە، چـــوار شـــەب[2]
وە بیـــستی ئـــابی غـــەربی، ڕۆژ پیـــا بـــوو[3].

## بۆ كۆچی دوایی (ئەحمەد) ناوێك

لەچـاوەی كەوسـەرا شـۆرا، لەسـەر دڵ هـەر غوبـارێ بـوو
لەچـۆڵی ماتـەما دەرچـوو، شـكۆفەی خونـچەزارێ بـوو
هـەتا تیغـی هـەوەس ئەیدایـە بـەر مـەودایی دڵـداری
وەكـو سـۆفی بـەدایم تانـەجۆ بـەد نیـشوكارێ بـوو
كـە كەوتـە زەمزەمـەی شـادی لـەڕێی دڵبـەر پـەناهی دا
بـەدەم تـاری تـەرەب جـامی ڕژاوی دەسـتی یـارێ بـوو
تكایـە خـاكی پـێڵاوی شـەهی ئیقلیمـی جیـسم‌و جـان
لـە زەڕڕاتـی هـەوادا، عاشـقانە شەرمەسـارێ بـوو

١ ئەم نیوە دێڕە بەپێی هەژمارکردنی پیتەکانی ئەبجەد دەکاتە (١٣٧١)، بەڵام دەبێ لەکاتی هەژمارکردندا بەم شێوەیە بنووسرێ: ( بەدیداری بهشتی‌و، فوزی شا بو)، کە ڕێنووسی دیوانەکەیە.

٢ ئەم نیوەدێڕە بەپێی هەژمارکردنی پیتەکانی ئەبجەد دەکاتە (١٩٥٢)، بەڵام دەبێ لەکاتی هەژمارکردندا بەم شێوەیە بنووسرێ: ( بە بیست‌و نۆی ذی قعدە چوار شب)، کە ڕێنووسی دیوانەکەیە.

٣ ئەم نیوەدێڕەش بەپێی هەژمارکردنی پیتەکانی ئەبجەد دەکاتە (١٩٥٢)، بەڵام دەبێ لەکاتی هەژمارکردندا بەم شێوەیە بنووسرێ: (وە بیستی آبی غربی، رۆژ پیا بو)، کە ڕێنووسی دیوانەکەیە.

لەداوی کاکوڵی گوڵ، دەرکەنارو، ناوی سەییادان
بەدیدەی شوکربینی کامە دیدە، خووی شکاریێ بوو؟
کە مەی نۆشی، لەجامی نەشکەیی گوفتاری (کاك ئەحمەد)
بەبێ خود، هاتەگیان، گەرچی ناقۆڵا فیراریێ بوو
لەمەو بەدواوە، خامم کرد بە دورجو بورجی گەنجینەی
ئەوی تا ئێستە هەر ساتێ دیاری بوو، دیاریێ بوو
موزافی من ئەما، دڵ، بیبە سا چی لێدەکەی؟ بیکە
ئەلا (کاك ئەحمەد)ی گیانپەروەرم، ئەم بارە تاریێ بوو
قەلا ناڵێم دزیویە، خۆی چووە دڵ جێگە قایم کا
هەتا ئێستا، کە بێ بەختانە هەر ساتێ لەشاریێ بوو
لە قەبریشا، وەچاکە لەو دڵە هەر ڕەحبو توویا کەم
کە مەیخوارە لە جامی هەق شوناسی، بەختیاریێ بوو
لە باغی گفتوگۆتا، سەر گەڕا ئەو مەرکەزە، گیرای
بە ئەم زوعفە، لەژێر ئەو بارەدا، چۆن ئیستیواریێ بوو!؟
خودا ڕەحمی لەگەڵ کرد، ئیمتیسالی ئەمری تۆی دایە
هەتا ئیمڕۆکە سەرگەشتەی بەلاریێ یا دەلاریێ بوو
نموونەی هاتە خزمەت، تەجرەبەی یاری ئەکرد، وەرنە
ئەوی ناردوومە بۆ تۆ، گەرچی خۆش بوو، ژەهری ماریێ بوو
هەموو هەنگی خەیاڵم کردە وەقفی تۆ، لەگەڵ باوەڕ
کە ڕۆحیش هاتە خزمەت موشتەری خۆی، بۆ نیساریێ بوو
گیانی عیلمو عیرفانە بەکێشان، نەشکەیی (ئەحمەد)
بە گوستاخی، لەباخی لوتفی ئەو، (ڕاجی) هەزاریێ بوو.

## پەسنی تاهیر ئەفەندی

هەرکەس، هونەرو فرسەتی ڕووی کۆمەڵی دیبێ
چاوی لە دوای لوتفو ئەواکەی چەلەبی بێ
هەر کەس وەکو من، عاجزو تیمارە لە دەس غەم
چارەی نییە لەم وەرتەیە، ئیللا بە لەبیبێ
حازر لەدەرو ژووری سەخاتن، بە عموومی
ئامادە بە خواهشتە، چ زانا، چ غەبی بێ
بۆ بەخشو عەتا، کۆمەڵە سا دوژمنو یارت
تێراوی ڕەوای بەختە، چ گەورە، چ صەبی بێ
وەك شاخی[1] سنەوبەر، هونەرت گردو بلاوە
وەك بەحری دوڕو گەوهەرە ڕەشحەت ئەدەبی بێ
پڕ هێزە وەکو گەنمو، بەلاغت وەکو شەککەر
گەر فارسییو، کوردییو، تورکیو عەرەبی بێ
(ڕاجی) مەکە ئەندێشە، لەناو گەردوشی دەوران
ئەمدیوە وەکو (تاهیر ئەفەندی)، چ ئەجیبێ!!.

١ شاخ: لق.

## نامەیەك بۆ (زێوەر) ی شاعیر بەمەبەستی سەردان

گیـــانی ژیـــانی کـــوردی قەڵەنـــدەر
هیـــوای وڵاتـــی بـــەرزو مونـــەوەر
مـــەردی بـــە پێشـــچوون، پـــیری نیـــشتمان
فەیلەســـوفی کـــورد، حـــەزرەتی (زێـــوەر)
تکـــای نـــەژادی هـــۆزی بـــەئاوات
بـــە بـــەخت یـــاری، وەکـــو ســـکەندەر
شەهەنـــشای وتـــار، نـــازۆتی وەتـــەن
نۆکـــەجینی دڵ، ...............................[1]
بـــۆ زیارەتتـــان، خـــۆی پێـــشکەش ئـــەکا
(راجـــی)، کـــە ســـاتێ ببـــێ بـــەهرەوەر.

---

١ لەبەر ڕەشبوونەوەی هەندێك وشەی ئەم لەتە دێرە بەهۆی تەڕبوونی دیوانەکەوە، بۆمان نەخوێندرانەوە.

# هۆنراوەی ئایینی

## (١)

## (ستایشی یەزدان)

ئەی بەناوی پاکی تۆم، بۆ هەر مەرازێ ئیبتیدا
ئەی بە حەمدو شوکری تۆ، هەر نیعمەتێکم دڵ گوشا
ئاسمانت کرد، قوببەی عالەمی جوودو وجوود
ئاگرو ئاوو هەوار خاکت نیشاندا، ماسیوا
ساردو گەرمو، ترش‌و شیرین، موجەب‌و سالیب هەموو
ئیشوکارت خستە مەودای مەقنەتیس‌و کارەبا
خۆت کە زانا بووی، ئیرادێکی هەوڵ هێنایە کار
نیسبەت‌و جۆری وجوودی گشتی نەشیا، دارژا
دینەمۆی مانا، بە مێشک‌و دڵ، لە قازانج‌و زەرەر
پاتری گیان پڕ ئەکا دونیا لە ئاوازو سەدا
تۆ هەبووی‌و کەس نەبوو، کردەت هەبوو، بنکەت حودوس
حیکمەتی عیللەت بڵێم چی بێ بەرانبەر تۆ، خودا؟
هەر بە ئەمری (کُنْ فَکان) بۆ قاعیدەی خەڵقت نواند
چەندو چۆنی ئەووەڵ‌و ئاخیر لە عیلمت ئاشکرا
چونکە ئەتناسن بە حەق تۆی خاوەنی کەشفی وجوود
قەت تەواو ناکەن سوپاست، ئەنبیاو ئەولیا
گەرچی (ڕاجی)، لەم هەموو ئەسراری تۆیە نابەڵەد
وا لە مەقاپی ڕەحمەتت، کەوتۆتە حاڵی حەلوەلا.

١٩٥٠

(٢)

**( مێژووی پێغەمبەرایەتی و کورد )**

ڕۆڵەیی ئادەم، یەکەم، بۆ گشتی میللەت پێشەوا
خاتەمی پێغەمبەری کردۆتە ئەنگوستی بەقا
چونکە ئادەم هاتە ژین، منداڵەکانی پێ بەپێ
لێکجیابوون، هەر یەکەی یەك جۆرە کاری خستە ڕا
تا لەڕووی زانستو فەن، ئایین و ڕێکی چوو لەناو
هاتە ڕوو پێغەمبەرێك و، ڕێکوپێکیی ڕێکخرا
ویش کە ڕۆیی بۆ مشوورگێڕانی بەرگ و عەیش و نۆش
هەر کەسە دەستی درێژ کرد، بۆ سەرو ماڵی برا
چی قەڵەندەر بوو، لەهێزی دەستدرێژی دا هەڵات
ویش وەڵاتێکی تری کرد ئاوەدان و پڕ بەها
هەر کەسێ دوور کەوتەوە، کارو زمانی دابڕی
(عَلَّمَ الأسماء) بە مێژووی ئادەمی ڕاوێژ ئەدا
تا زەمانی حەزرەتی (نووح)، ئیش لە ڕێزەی تێپەڕی
هەرچی ئیشی خوێنمژی بوو، بلقی تۆفان قووتی دا
نووح بەهۆی کەشتی، لە (جودی)ی ئێمە گرتی لەنگەری
دابەزی هۆزی هونەرپەروەر، لە کوردستان خزا
پێ بەپێ زۆر بوونەوە، دیسان بە خاك وەربوو، هەرا
ڕاستو چەوتو، زۆرو کەم، دیندارو بێ دین تێك قڕا
تا (خلیلُ الله)، لە دەستی هۆزی خۆخۆری هەڵات
گەییە لای مەککەو مەدینە، ماڵی کابەی کرد بینا
کاکە (ئیسماعیل)ی گەنجی کردە قوربانی، ئیتر
یەك بەرانی دوگ زلی کردە بەلاگێڕی خودا
گەر بزانی، کابە بۆتە حەججی چوارقوڕنەی جیهان
ناوی زەمزەم هەڵقوڵا، بۆ دڵبەری مەروەو سەفا

گەر ئەیاننناسن ئەمانەن باوك و باپیرانی کورد
هەر ئەوان زنجیرەیی پێغەمبەرانن، ئاشکرا
تا موحەممەد، شاهی ئافاقی سەعادەت هاتە ڕوو
تەفرو توونی خستە زوڵم و بوخل و جەهل و نیعتیدا
ئایەت و ئایینی حەققی بۆ دەهێنا جوبرەئیل
بۆیە خزمی پێسی خۆی کوشتن، قومانداتی غەزا
بیست و سێ ساڵ کۆششی ئەو، بوو بە سەرمایەی ژیان
وەحدەیێکی موشتەرەك، پیرۆزە، بێ فێڵ و ڕیا
هەروەکو بارانی ڕەحمەت، بەرڕو بەحری لێك وەشاند
تا لەسایەی وی ژیان بۆنی بەهەشتی تێ گەڕا
کوردو عارەب، تورك و فورس و، هیندو یۆنان و فەرەنگ
یەك وشەی کردن بەیەك، پێکچوو ئەزان و شارەزا
چونکە قانوونێکی بەرزی بۆ بەشەر یەکسەر نواند
کەس دەمی هەڵنایە بگرێ ڕەخنە تا ڕۆژی جەزا
ئەو زەمانانەی کە ئادەم دایە دونیا بێ زیان
هەر کەسێ حەزکا دروستە، گشتیان، خۆی فێر ئەکا
چی ئەوێ فەخری ڕیسالەت؟ جگ لە خاوێن و نەجات
ئاوەدانی، یەکدڵی، ژینێکی بێ ڕەنج و بەلا
ئەو بەهەشتەی خوا ئەفەرموێ، ئاخیرەت بۆ پیاوی باش
پیاوی باش بن، ئێستە بچنە ئەو بەهەشتەی دڵ گوشا
گەرچی بیری کورتە (ژیکۆ)، خۆشەویستی کردگار
لێی ببورە سا لەقاپیت، کەوتە هاوارو تکا[1].

١٩٥٠

---

١- ئەم نیوەدێڕە بە پێی هەژمارکردنی پیتەکانی ئەبجەد دەکاتە (١٩٥٠).

(٣)

## (سەنای پێغەمبەر)

دوڕڕی هەتیوی یەکییەتی، هەوا بە دەشتو شار ئەکا
لەسەر سەری گیانو دڵ، قەراری حەق نیسار ئەکا
گوڵێک لە باغی ڕوومەتی هەموو بەهەشتی پێوەیە
چڵێک لە مووی شەوکەتی، لە نیشتمان شکار ئەکا
لەسەمێرخوزارو ئاگری خەلیلە دەستەچیلەکەی
وڵاتی عارەبو عەجەم، پڕی لە نەوبەهار ئەکا
بڵێ: بناغەیی هەموو وجوودو ژینە تا ئەبەد
زەنگو زرنگی بەرزییە، لە عالەما دیار ئەکا
جیهان پەناهی ئادەمی، وەجاخی گوڵشەنی وەتەن
لە زەنگو ڕافی جوبرەئیل سەرخۆشی هۆشیار ئەکا
بە نووری پاکی کارەبا، گوڵوڕی خاڵی هیممەتی
لە شووشە داڕژاوی دڵ دەلیلی ئاشکار ئەکا
لە پشتی کوردەوە، کە بوو بە پشتیوانی عارەبی
سەما بە شێری مەغریبەو، بە ئاسکی تەتار ئەکا
بە بیری بەرزو غیرەتی، هونەر ئەخاتە جۆشەوە
لە کانگەکانی کاردا، (بەد و نەبڕ) بژار ئەکا
سیمورخی قافی مەعریفەت، کە نیشتە تەختو تاجەوە
سەماو زەمینو ماسیوا، بە عیشق بەختیار ئەکا
حدودو ڕەسمی حیکمەتی، کە خستە دەفتەری وەلام
خەتمی دەفاتیری سەدو بیستو چوار هەزار ئەکا
سبوتو سەلبی عەدلی ئەو، بزانە ڕیزەگیرە چۆن
کە ڕوو ئەکاتە چاکەوە، پاوانی ئیحتیکار ئەکا

لــە رۆژی نەگبــەتو غــەما ، کیفــاحو عوشــرەتە کــەوا
بــە وەحییــو دەســتو مــوعجیزەی، وجــود ئیفتیخــار ئــەکا
کــە دەســتی پــاکی عیززەتــی، بخاتــە کــاری بەخشــشا
بــاران‌و بــەحرو مــانگ‌و رۆژ، روو زەردو شــەرمەزار ئــەکا
کەســێ لــە ریــزی هاتــەدەر، چ کــەس بــە خــۆیی نــاگرێ
بــێ شــوێنەوارو دەربــەدەر، لــە ســاتێ ســەت هــەوار ئــەکا
خزمــی خــەراپی مەککــەیی، کــە چوونــە بــیری بــێ ســەمەر
بزانــە یــاری غــاری چــۆن لــە دەوروپــشتی غــار ئــەکا
فــاروقی حــەق‌و زەندەقــە، لەگــەڵ شــەهیدی خانــەدان
(عــەلی) ئەکــەن بــە حەیــدەرو، هــەوا بــە زولفــەققار ئــەکا
لەکارەســـاتی هیجرەتــــا ، مەدینــــە ســــامی تــــێ رژا
بــە ئــەوس‌و خــەزرەجی لــە رێــی خــوداوە ئینتیــسار ئــەکا
وەغــایی خەنــدەق‌و ئوحــود ، خــەتی حونــەینی پــێ ئەبەســت
لــە ســاڵی هەشــتەما (صــەنەم) لــە کەعبــەدا فــیرار ئــەکا
سروشتی پاکی ئینــس‌و جن، لــە بیــستنی عــەجیبی حــەق
بــە نــوری بــاوەڕو هونــەر، سوپاســی کردگــار ئــەکا
پــەنای هــەژارو بێکەســان، کــە رشــتی هــەوری رەحمــەتی
خەراپــە مەســتو مــست ئــەکاوو چــاکە چــەنگوبار ئــەکا
لــەکاتی دادو ســەفوەتا، بــە رۆژو شــەو کــە جــاڕ ئــەدا
هــەتا خــولامی رەش لەســەر منــارەدا کــەبار ئــەکا
شــەمایلێکی وا یەکــەم، لەعالــەمێکی نــوێ‌وو کــۆن
گیــان ئەکاتــە بولبــول‌و، نــەوایی گوڵعــوزار ئــەکا
شــەرتێکی مــات‌و بــێ هــەرا، چــووە حــوزوری لامــەکان
وەلام‌و شــەرتی پــێ درا، کــە عیــصمەت ئیختیــار ئــەکا

پەرۆشی قەومی خۆیەتی، لە تەنگنایی مەحشەرا
هەتا بە قەومەکانی تر، شەفاعەتی قەتار ئەکا
بەخاسو عامەوە سەناخووانی دەرگەیی ئەون
کێشو تەرازووی جودی ئەو، ئەکو لە ئینحیسار ئەکا
ڕەتی بەڵاو شەعوەزەو، ڕیاوو زوڵمو سیحر ئەکا
بە قەول ئەعوزووان دەوای دڵانو چاوەزار ئەکا
لە دائیرەی ئەدەب ئەگاتە ئاسمانی نۆیەمین
بە جۆشی عیشقەوە سەری لە باوەشی نیگار ئەکا
کە تێکەڵی سەفایە ئەو، چ باکی ئەم فەنایەیە؟
ئەچێ لەپێشەوە سەرەی نفوسی خۆی ژمار ئەکا
کە بانگ ئەکاتە ئومەتی، تا فەوج فەوجو، تیپ بە تیپ
لە ڕێی ئەجاتو مۆژدەوە، ژیانی پایەدار ئەکا
لە ئەعتی پاکی موحتەرەم، (ژێکۆ) کە ناگاتە لیام[1]
بە نیوە ئیلتیفاتی ئەو، لەمێژە ئینتیزار ئەکا.

١٩٥١

(٤)

سەوزی چەمەنی ژینو، خودا یارە موحەممەد[2]
بۆنخۆشو، گەشو، ڕەونەقی گوڵزارە موحەممەد
تاجی سەری حەقپەروەرو مەحبووبی ئیلاهی
نووری دڵی سەرگەشتەو بیمارە، موحەممەد

١ ئەم نیوە دێڕە بە پێی هەژمارکردنی پیتەکانی ئەبجەد دەکاتە (١٩١٢) کە ساڵی لەدیکبوونی ڕاجی یە، بەڵام دەبێ لەکاتی هەژمارکردنىدا هەردوو وشەی (نەعتو موحتەرەم) بە ڕێنووسی عەرەبی بنووسرێن. بەم شێوەیە: (نعت، محترم)، کە ڕێنووسی دیوانەکەیە.

٢ لەشوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (سەوزەی چەمەنی ژینو، خودا یارە موحەممەد).

بنچینەو سەرچینەیی حوکمو ئەدەبو دین
دوژمن بەسەری شێتو کەرو هارە، موحەممەد
دورِی سەدەفی بەحری موحیتی سەمەدانی
قەترەی کەرەمو رەحمەتی جەبارە، موحەممەد
بۆ ژینەوەو، مەحکەمەیی رۆژی قیامەت
پێناوی هەموو هۆزو، تکاکارە موحەممەد
ئەمک بۆ عەرەبی مەککەو ئەترافو مەدینە
بۆ گشتی بەشەر، مەرهەمی ئازارە موحەممەد
بۆ یەکیەتی ئینسانو، ژیانێکی بەخۆشی
خۆی موددەعییەو، شاهیدی کردارە موحەممەد
ئەو، کۆمەڵی ئەحزابو شەیاتینی شکاندن
بۆ لەشکری حەق، سەروەرو سالارە موحەممەد
بەو حیکمەتی قورئانییو، ئیلهامی خودایی
شاهێکی بلند حوججەتو گوفتارە موحەممەد
ئەو پێشرەوە بۆ ئومەتو، سەرجوونە لە عالەم
خاوەن کەرەمو هیممەتو رەفتارە موحەممەد
بەو زاتە ئەنازم، لەمژیانی دوو جیهانا
دەرمانی غەمو دەردی دڵو زارە، موحەممەد
(راجی)، بەسە رووزەردییو، سەرچەوتییو خولدان
تا رۆژی دوا، هەر بلێ هاوارە، موحەممەد.

١٩٤٧

(٥)

## پێنج خشتەکی لەسەر هەڵبەستێکی (دڵزار)[1]

ئەصڵی هونەرو، فەصڵی هەموو ڕازە موحەممەد
تیشکی سەحەری ڕۆژی پڕ ئاوازە موحەممەد
مێشکی صەدەفی کۆمەڵی دەم سازە موحەممەد
شۆخێکە لەناو عالەمی مومتازە موحەممەد
خاوەندی هەزار ئایەتی ئیعجازە موحەممەد

نوورێکە لەناو کیشوەری جانان، نییە حاجیز
گەنجێکە لە بۆ نەوعی بەشەر جائیزو فائیز
شاهێکە لەسەر تەختی مەقاسید نییە عاجیز
مانەندی لە ناو کۆمەڵی خووبان نییە هەرگیز
سەرچاوەیی حوسنو ئەدەبو نازە موحەممەد

گەر ژاڵەیی نیسانە، وەگەر ئاگری سوورە
گەر عونسوری ئینسانە، وەگەر سوورەتی موورە
سەربەرزە لە ڕووی، چونکە هەیولایی حزوورە
ڕەنگینە بە ڕوخساری، ئەڵێی پرتەوی نوورە
مەخموورە بە چاو شاهیدو شەهبازە موحەممەد

بۆ قەدری بەشەر، چاوی سیای گرتووە بەژنی
سەروی بە هەوا خستووە، بەرزی خووە بەژنی
سینەی قەفەسی عیلمو، نموونەی مووە بەژنی

---

١ ئەم پێنج خشتەکییە لە دیوانە دەستنووسەکەی (ڕاجی) دا نییە. لە دیوانی (دڵزار)ەوە وەرمانگرتووە. دیوانی دڵزار. ئامادەکردنی: دڵزار، پێداچوونەوەی: ئازاد دڵزار، چاپی دووەم. بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی ڕۆشنبیری هەولێر. ساڵی ٢٠٠٦، لا ١٨٩-١٩٠.

وەك شەتڵی سنەوبەر، بە هەوا هەڵچووە بەژنی
ڕێك کەوتووە ئەندامی بـە ئەندازە موحەممەد
بەم ئەرزی لـەبەو گەردەنی بـەرزو دڵی داهی
بەم پەرچەمی پڕ هالەوو، بەم ڕوومەتـی ماهی
بـەم ڕیزە گوهەر، ڕیزە ددانەو سـەری جاهی
بەم تیری موژەو، شیری برۆو، سونگی نیگاهی
خاوەندی سـوپاو لەشکرو سەربازە موحەممەد
کولمەو لەبەکەی، پرتـەوی دوو عالەمە بە خوا
نـووری قیـدەمو، بـەحرەودرو خاتەمە بە خوا
زنـجیـرەوو شـیرازەی بەنی ئـادەمـە بە خوا
هەرچەندە بکەم وەسفی جەماڵی، کەمە بە خوا
گەنـجێکە لەناو ئادەمیـیا شـازە موحەممەد
جان خادیـمی دەرگانەیەتی، بـێ خورو بێ خەو
دڵ عاشـقو پەروانەیەتـی، ڕۆژو ئەگەر شـەو
تۆش هەروەکـو (ڕاجـی) بە خوا مەحوی لە پرتەو
(دڵزار) مەبە غافڵ لە جیهەت مەدحو سەنای ئەو
بـۆ ڕاهی نەجات، مەتڵەبو دڵخوازە موحەممەد.

(٦)

تابنــــدە، وەکـــو ڕۆژی دڕەخـــشانە موحەممـــەد
تـــاجی هونـــەرو، ســـێبەری ئینـــسانە موحەممـــەد
شـــەرحی دڵو، بەنـــدی جگـــەرو، ڕەونـــەقی جانـــە
ئـــەو مەرکـــەزی پـــەرگاری هـــەموو کانـــە، موحەممـــەد
دەستووری گـەلی کـۆن و نـوێ، نەسـخی بەسـەر هـات
قـــانوونی حەکیمانـــەیی قورئانـــە، موحەممـــەد
هـــەر پادشـــەهێ کەوتـــە فـــەناو، میللـــەتی قـــڕ بـــوو
ئـــەو میللـــەتی ســـەرکەوت و، لـــە دیوانـــە موحەممـــەد
گیـــانی منـــە، ســـەربازی غوبـــاری بـــەری پێتـــە
جـەرگ و دڵـی مـن پێشکەش و قوربانـە، موحەممـەد
ئـــاواتی هـــەموو هـــۆزی هـــەژارە، لـــە جیهانـــا
چـــاوەی کـــەرەم و بـــەرزیی ئیحـــسانە موحەممـــەد
سەرچـاوەیی ژیـن (ئـامێرو ئـاهی)، بـە دوو عالـەم
قیبلـــەی بەشـــەرو کەعبـــەیی دەورانـــە، موحەممـــەد
ئەو مەزهـەری ئیلهامـە، لەگـەڵ وەحیـی سـەماوی[١]
بـۆ عـەدلی هـەموو مەحکەمـە میزانـە موحەممـەد
سـەر لەوحـەیی ئایـاتی هونەرمەندییـە، هـەر خـۆی
ئەنـــدازەوو، شـــیرازەوو، بورهانـــە موحەممـــەد
نوورێکـــە لـــەناو بـــەرگی بەشـــەردا، کـــە دیارە
بـــەرگی بەشـــەرو ســـاتیری نوقـــسانە، موحەممـــەد
(ڕاجـــی) بەفیـــدای خـــاکی دەرت، لەنگـــە زمـــانی
بیبەخـشە لـەڕووی ئـاگری دووخانـە، موحەممـەد[٢].

---

١ لەشوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (ئەو مەزهەری بنیادەمە تێکرا. بە سەعادەت).

٢ لەشوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (ناگاتە حەقی وەسفی تۆ لەم خانە. موحەممەد).

(٧)

**( ئامۆژگاری )**

گـــەر موســـڵمانی، مەدۆڕێنـــە دڵـــی تـــازەو لەمێـــژ
بگرە ڕێگەی شاهیدیو، حەججو، زەکاتو، صەومو نوێژ
بێنـــە بڕوایـــی بەیـــەزدانو مەلـــەك، واتـــەی پـــەیام
نـــاردراوو، ڕۆژی هەســـتانو، بـــڕاوەی ڕاســـتو لێـــژ
گەر خەریکی چاکە بی، هەر بۆ خودای کە، بێ ڕیا
تۆش نەبینی، ئەو ئەتۆ ئەبیـــو ئـەبینێ، هیچ مەوێـژ
هەرچـی لێـت پـەرژین کـراوە، خـۆت بپـارێزە لـە ئـەو
چـونکە گـشتی لێـك ئـەکا، بنیـادەم ئەبهارێتـە گێـژ
دز مەبـە، تـاڵان مەکـە، بڕیـاری خـاوێن بگـرە دەس
بـۆچ دەخـۆی تـووك، بۆچـی ناخۆی پـاکراوی بێ قرێـژ؟
تـۆش مەبـە مـامی تەژەنـدەر، هـەردوو قاچیان بڕیـەوە
هەر بەقەد پێویستی خۆتکە، (پێ لەسەر ڕایەخ درێژ)
ڕۆژی هەســتان، کـێ ئـەزانێ، کـەی بـە گـۆڕێ وەرئـەبێ؟
پێت بڵێ (ڕاجی) نیـشانەی؟ گـچکە ئەبنـە گـەورە نێـژ !!.

١٩٤٧

(٨)

لـــەقاپیی غیرەتـــی تـــۆدا، ئەوەنـــدە مـــاتو دامـــاوم
بـەخوێنی جـەرگو دڵ، ئێـستا، حەسـوودی وا دەبـا چـاوم
دەلیلولحـــائرین تاکـــەی، شـــەفیعولموزنبین تاکـــەی؟
بنـــاڵم بـــەم هـــەموو دەردەو، بتـــۆڕێ بـــەختی وەســـتاوم
کەسێکت خۆشدەوێ مـەردی دوو خانـەی دیـنو دنیـا بـێ
لەخانـــەی ئـــاخیم ناگـــەم، کـــە لێـــرەش هـــەڵکڕوزاوم

لەبەر (مَن یتَّقِ اللهَ)، گەلێ ئیشم فڕێداون
لەگەڵ (یَجعَل لَهُ المَخْرَج)، ئیتر بۆچی فڕێدراوم؟
لەلای مەولا، (مَفاتیحُ الغیوب)و غەیری تێناگا
لەئێستاوو دوواییدا، وەرە فریایی گەرداوم
کە عیسا موژدەیی: (یأتي مِنْ بَعْدي إسْمُهُ أحْمَد)
بە قەومی داوو مەن هاتم، لەمەیداناوو هەستاوم
پەرستیم زاتی هیممەت بەرزی تۆ، بێ وەی کە بتبینم
لە بەحری عیشقی مەردیتا، نوقوم، وەك بەردی بن ئاوم
(ألَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكْ، وَضَعْنا عَنْكَ أوْزارَكْ)
(رَفَعْنا ذِكْرَكَ الأعْلى)، بەناوت، چەندە بەدناوم
گەلێ پەرپووتو فەرتووتم، خەریکی سووتی ناسووتم
نەگەیە کاخی لاهووتم، لە ئەووەل خەتوە جێماوم
دەمێ قرچەی هەناوم دێ، لە کوورەی دەردو دڵداری
دەمێ لەرزین لە ئەندامم دەچێ بۆیە پەشۆکاوم
(فَسُبْحانَ الذي أسْرى بِعَبْدِ مجمَعا أقْصى)
لەئاگردانی سینەمدا، وەکو (پشکۆ)، ئەجوولاوم.

(٩)

یارەب! چ گەداحاڵو، پەرێشانی جەفا خۆم
یارەب! چ گرفتارو، کەمەربەستی خەتا خۆم
نەمبوو لە حەزەر وەسفی سەفا، خزمەتو ئیحسان
مەجبووری هەواو بیدعەتو، بێڕەنگو بەها خۆم
ئەو ڕۆژە، کە من دێمە نەزەر باخی حیابات
بێ بۆیی گوڵو یاسەمەنو سەروو سەبا خۆم

ئەو وەختە لەسەر ڕێمە، شەرارەی دەمی زیندان
بێ ئاوی سەرئەفرازییە، سووتاوی جەزا خۆم
من، لایەقی هەر ئەرزە عەزابێکی گرانم
پڕ فیسق و ئەمەل، بێ عەمەل و زیکری خودا خۆم
مەیلم ئەبوو یەك لەحزە، لە دیوانی عیبادەت
سەرگەشتەیی بازاڕی فرۆفێڵی فەنا خۆم
فیکرم بە هەبا مەسرەفی ئەتواری دەغەڵ کرد
پامالی بەلای شەش جیهەتی ڕۆژی لیقا خۆم
عومرم گوزەری، گشتی، لە ئەحوالی تەرەبدا
ئەی بێ ئەرەبی مەجلیسی دیوانی بەقا خۆم
ئەفعی ئەبەدو، نیعمەتی عوزما، چوو لە کیسم
ئەی پڕ خەتەری چۆڵ و بیابانی هەبا خۆم
ببەخشە بە ڕووی (ئەحمەد و، یاسین و، موحەممەد)
لەم ڕێگەیی تەقدیسە، عەجەب، بێ سەروپا خۆم!!
ببەخشە بە گوڵزاری خەلیل و، کەرەمی نووح
ئەی دڵ بەگڕو، غەرقی خەجالاتی سیا خۆم
ببەخشە بە مووسا و، دەمی حەزرەتی عیسا
ئەی کوشتەیی سەد ساڵەیی بێ دەست و عەسا خۆم
ببەخشە بە خاکی سەمەری ئادەم وحەووا
ئەی ڕوو ڕەش و پەژموردەیی بێ سوود و حەیا خۆم
ببەخشە بە ئەسحاب و، بە ئال و، عولەمایان
ئەی دەفتەری جەهالییە، دوشمن بە خەتا خۆم

یــا ڕەببــی! ئــەتۆ غــافیری عیــسیانی لــە (ڕاجــی)
یـــاڕەببی! چ ڕوو بێنمـــە دەرگـــاهی ڕجـــا، خـــۆم؟!.

(١٠)

یـــا موحەمـــمەد، عەنـــدەلیبی باغـــچەو گـــوڵزاری تـــۆم
عاشـــقی کەعبـــەو ئـــەجاتی ڕێگـــەوو ئاســـاری تـــۆم
بێکەســـم، کـــردم دەخالـــەت، ڕەحمـــەتی تـــۆ بـــێ، خـــودا
دائیمـــا هـــەر چـــاوەنۆڕی شـــوعلەوو ئـــەنواری تـــۆم
حـــازری چـــەرخی شـــەهادەت بـــووم، لـــەدیوانی ئـــەزەل
بـــۆ ئەبـــەد، میزانـــی عەهـــدو نیـــسبەتو دیـــداری تـــۆم
دڵ برینـــدارم، بـــە نالـــەی گـــەرمو ئـــاهی ئـــاگری
ئینتیـــزاری مەرهـــەمێکی لێـــوی گوڵـــشەنکاری تـــۆم
ئـــیمو، هـــەم، گـــەر خـــاکی ئـــەرزی ئەســـفەهانم، یـــا عێـــراق
هـــیچ ئـــەبم، مـــەربووتی خـــاکی پـــایی جەننـــەتزاری تـــۆم
مەنبـــەعی فیکـــرو خـــەیاڵم، کـــرد لـــە مەســـتیدا خەســـار
تۆبـــە بـــێ ســـەدجار، کـــە ئەمـــشەو دەمـــزەدەو گوفتـــاری تـــۆم
یـــا حـــەبیبوڵڵا، ئـــەجاتم، خاســـە کەوتـــە دەســـتی تـــۆ
کـــەممی بـــێ میقـــدارو، کـــەیفی بـــێ ڕوخو خونخـــواری تـــۆم[1]

---

١ ئەرستۆ لە کتێبی (گوتەکان المقولات کاتیگۆریاس)دا پێیوایە لە بیرسانسی (علم المنطق)دا (١٠ دە) گوتە هەن، ئەوانیش بریتین لە؛
١ گەوهەر الجوهر. ٢ چەندێتی الکم. ٣ چۆنێتی الکیف. ٤ شوێن المکان. ٥ کات الزمان. ٦ خستنەسەر الاضافة. ٧ ڕەوش الوضع. ٨ ڕەوشی کاتیی هەیەتی الملك . ٩ کردار الفعل. ١٠ گۆڕین، کارتێکردن الانفعال.
(ڕاجی)یش لەم هۆنراوەیەدا ناوی هەر (١٠) گوتەکانی هێناوە، بەم شێوەیە؛
١ کەممی بێ میقدار = چەندێتی. ٢ کەیفی بێ ڕوخ = چۆنێتی. ٣ خونخوار = ڕەوش. ٤ خەستە = ڕەوشی کاتیی. ٥ زەمان = کات. ٦ مەکان = شوێن. ٧ مونفەعیل بوو مولکی دڵ = گۆڕین، کارتێکردن =

مونفەعیل بوو مولکی دڵ، بردەی زەمان، خستەی مەکان
هەر مەوزانی جەوهەری پڕ حیکمەتی ئەسراری تۆم
دەم بە دەم، تەبشیری تۆ، دەرمانی دەردو غەم دەکا
چارە چارەش، دەردەداری دیهەشتو ئینزاری تۆم
ڕەندو، بێباکو، تەڕدەنباکو، سەفاکەش بووم، دەمێ
ئێستە شوکرانە لە ئەزمی گەوهەری ئەشعاری تۆم
بێکەسێکم، چوومە قاپی ڕەحمەتت، ئەی خۆشەویست
هەروەکو (ڕاجی)، تەڵەبکاری مەیی میدراری تۆم.

(١١)

وەحدەتە شەرتی مەحەببەت، پەیڕەوی پێغەمبەران
ڕوو لەچاکە کردنە، خۆ تەرکی ڕاوێژی کەران
کێ منی هێنایە دی، هەر ئەوشە ئیشم پێ ئەکا
بۆچی سەربەستم لەکارا؟ چونکە سەرمەستم لە کان
ئەو کەسەی بیدا هیدایەت، شەرح ئەکا سینەی لە دین
ئەو کەسەی ڕێی لێ بگۆڕێ، ڕەق ئەکا دڵ، وەك گیان

٨ بردەی زەمان = کردار. ٩ حەبیبوڵڵا تۆ (پێغەمبەر د.خ) = گەوهەر. ١٠ پڕ حیکمەت = خستنەسەر.

بەلای (ئەرستۆ)وە بێجگە لە گوتەی (گەوهەر) کە گوتەیەکە خۆبەخۆ هەیە. نۆ گوتەکانی دیکە گوتەی ڕووکەش و ڕواڵەتین و لە گەوهەردا هەڵگیراون و بوونەتە نیشانەکانی گەوهەر و بوونێکی سەربەخۆ و خۆبەخۆیان نییە. شیاوی گوتنە کە (کانت ١٧٢٤ ١٨٠٤) ڕەخنەی لە گوتەکانی ئەرستۆ گرتووە و پێیوایە کە ئەو گوتانە گوتەی ئەنتۆلۆژین و. لەجیاتی ئەو (١٠) گوتانەی ئەرستۆ (١٢) گوتەی ئیپستمۆلۆژی داناوە. (هیگڵ)یش وەکو یەك ڕەخنەی لە گوتەکانی کانت و ئەرستۆ گرتووە و زێتر لە (١٠٠) گوتەی هێناوەتەوە. هەروەها بیرسانانی (پۆرت ڕۆیاڵ)و (جۆن ستێوارت مل) یش بەتوندی هێرشیان کردۆتەسەر گوتەکانی ئەرستۆ و ڕەخنەیان لێگرتووە.

سەرچاوە: دەروویەك بۆ ناو بیرسانسی. وەرگێڕان و ئامادەکردنی بەکوردی: ئیسماعیل ڕاجی، دەستنووس.

کێ هەیە دادو شەفاعەت کا، هەتا ئیزنی نەدا؟
کێ نەکاتە شاھ و،کێ شارابەرو، کێ پاسەوان؟
کێ ژیانو رزقی عالەم بەش ئەکاو، بێبەش ئەکا؟
بۆچی هێندێك شادمانو، مەن ئەخۆشو دڵ بەژان؟!
لێی ئەگۆرێتو، دەقاودەق ئیش بکاو، عاجز ئەبێ
لێرە ناگونجێ، ئیتر، وێنەی کەلاشو ناشەوان
کێیە حەزکا خۆی ببێو، حەزکا لە بۆگەن بوونی مەرگ؟
سەیرە بازاری خوا، سەرسامیی سەوداگەران
فەلسەفەی دینو ریسالەت، حیکمەتن بۆ مێشكو دڵ
هەر لە دونیا ئاشکرایە، هەردوو خانووی ئاوەدان
نافرۆشێو ناکرێ، موحتاجی پارەو پوول نییە
ئەیشکێنێو، ئەیوەشێنێو، ئەیژمێرێ ئان بە ئان
چاو بدە (نَحْنُ قَسَمْنا بَيْنَهُم)، باش تێ ئەگەی
یەك ئەبێ، یەك ترسنۆك، یەك رۆستەمی مازەندەران
گەر ئەزەل پیلان بگێرێ، مەن بەکێ بەربار ئەبم؟
بۆچ ئەمانەتیان نەکێشاون، زەمینو ئاسمان؟
مارو مێروولەش مەحەببەت ئەگرنو، یەکتر ئەخۆن
شێرو رێوی، بەورو کەروێشکیش، هەموو قودرەت سەران
پێسە سەودایێکە مێشکی ئێمە ئەشکێنێ وجوود
پێکمان دوژمن ئەکاتو، ناوبژی نادا وچان
هەر ئەمن چاکی ئەناسم، دەوڵەمەندی بێ شەریك
کاکە (ژیکۆ)، ئاخۆ ئینسانێك ئەچێتە لامەکان؟!.

❊❊

# هەمەڕەنگ

## أ- جووت سەروا

### (١)

### (نەورۆزی ساڵی ١٩٦٤ – دەنگی جوتیاران)

کە نەورۆزە ئیمڕۆ لە ساڵی نوێ
بەرامبەر وەڵاتت، دەشلکە گوێ
ببیەو، بنووسەو، بکۆشە بەهێز
لە هۆزت ببەستە مەبەستت بەڕێز
بە خاوەنکە گوڵزارو ئاوو زەویت
برازێنەوە هەر بڵندو نەویت
بە خزم و جیران، بکە پەیڕەوی
هەموو بیری بەرزو کسان کە کەوی
بکە خزم و هۆزت تۆ ئامۆژگار
بچێنە لە خاکت هەموو چەشنە دار
بکێڵە زەوی و زار، جۆماڵ بکە جۆ
لە سامان و بەرهەم، پڕیکە مەکۆ
بەکاری گرینگت، بگێڕە مشوور
بە چنگی پڵینگت، بکێشە لە دوور
هەموو جۆرە پنجێک بچێنە لە باغ
لە بێ میوەیی، قەت مەخۆ ئاخ و داخ
لە هۆزت بتەخشێنە، هەر هێزی خۆت
بە بۆشی مەهێڵە خەتێک وەردو شۆت
بە کۆمەڵ، وەڵامی بدە نیشتمان
مەپرژێ لە ترسی بەدو دوژمنان

بەری ساڵی تازەت کە نەورۆزە، هات
نەڵەنگیّ لە ژێر بار، شانی خەبات
لە دوژمن بە تەنگ بێنە دنیای پان
دڵی دەربکەو، نیتر مەیدە وچان
نەزانن کوڕی نووحو زەردەشتی تۆ
وەجاخی خەلیلی، بەبێ گفتوگۆ
کە بەدگۆی وەڵاتت خزانێ لە ڕۆخ
نەخوازن دەرێنن دەمارت لە مۆخ
وڵاتت چلۆن بوو، بەدەست تورکەکان؟
خەریك بوون نەهێڵن، چ ناوونیشان
لەگەڵ ئینتیدابو، سوپای ئینگلیز
لە دوو ڕووی وشانی (فکُنْ، یا پلیز)
دوای وان، کە شاهیی قەراری درا
سلێمانی، بەیداخی لێ هەڵکرا
بە چەندێك دەسیسەی بەدانی لەعین
شکا مافی کوردی بە زامو برین
لە ڕێگەی نومەم، کورد بە (فەیسەڵ) درا
خیانەت کەوتە ناو هۆزو خزمو برا
بە(عەبدولهیلاك)[1] و بە (نوری سەعید)[2]
جەهەندەم تکای کرد بە(هَل مِن مَزید)؟

---

١- عەبدولهیلاك: مەبەست لە (عەبدولئیلاه)ە کە (وصی) مەلیك فەیسەڵ بوو، چونکە ئەو کاتە مەلیك فەیسەڵ تەمەنی بچووك بوو.

٢ سەرۆك وەزیرانی عێراق بووەو، لەدوای دامەزراندنی حکومەتی عێراقەوە چەندین پۆستی جۆراوجۆری پێدراوە.

لە پاش وان شۆڕش بە چواردەی تەمووز
شەریکایەتی بوو بەنان و خەپووز
کە لایدا لە ڕێ، (قاسم[1])ی شەرپەرست
بە مستێکی کوردی، هەمووی چوو لە مست
لە ڕووی ساڵ و نیوێک، چ سامانی خاك
کە بێگانە بردی و، تەقەو سووت و لاك
نەسووتان چیاو دەغڵ و دان و گیا
نەسوورا شەڕێکی بڵند، سەر نیا
لە هیچ هات و کاتێ، سوپا سەرنەکەوت
هەموو کاری (قاسم)، بە شۆڕش بوو چەوت
ئەدەی دەستی پیست لە ئاواتی کورد
ئەگینا خەیاڵێ ئەکا خاش و ورد
ئەوەند جاش و جۆشکی لە(عەفلەق)[2] کڕی
هەمووی لێ بووە بوغم و ئاخر شەڕی
کە کەرگەل بەرەڵڵای خاکت کران
بە تۆپین خزانە مەزات و مەیان
لە بەعسی جەڕاب و، دەفەی عەفلەقی
لە دەریایی کوردی، دڕاوو تەقی
لەگەڵ ئەو هەموو کۆمەکەی شەرق و غەرب
نە (قاسم)، نە بەعسی، نەگەیشتن بە ئەرب

---

٣ مەبەست لە (عەبدولکەریم قاسم)ە، ڕێبەری شۆڕشی ١٤ تەمووزی ١٩٥٨ و یەکەم سەرۆك کۆماری عێراق، کە کۆتایی بە ڕژێمی پاشایەتی هێنا لە عێراقدا.

٤ مەبەست لە (میشیل عەفلەق)ە، یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی.

ئەگەر دەس بخەیتە یەخەی کوردو کال
بەلا هەلمەرێژە لە ماڵو منال
بەخێوکە بە کوردی هەموو ئارەزووت
ژیان بەهرەوەرکە، لە نابووتو لە بووت
ئەوا دەرکەوت چەند نیشانەی بەهار
بریسکەی هەواو، تریسکەی هەوار
لەناو تافو بافا، گوڵو لالەزار
هەمووی رێکخراوە، چ لادێ چ شار
سەری مافی کوردی، بلند بوو لە خەو
لە مەیدانی هەقدا، بەرەڵلان جەلەو
بدە تۆ بە هێزت، ئەوژمو تەکان
بەووڕێنە سەر خۆت، خولی ئاسمان
خەباتت بکا با برا پێک تەبا
کە هیچ شت بەراتت لە رێ لانەبا
بە شادی بکەن سەر، کوڕانو کەنیشك
نەبێ باکی هێزت لە بارانو تیشك
ریازەت بکەن، پەل قەوی پالەوان
پزیشکە ریازەت، بە دەردی گران
بە مێژوو ئەناسرێ سەرو کاری کورد
بە راوێژی خاوێن، بە کرداری گورد
بەلێ کوردە، ئەندامی چەسپاوە رێك
کە بۆ پیاوی ئاقڵ تەواوە وشێك
بە دوو چاوی تیژو، رەشو کاڵو بز
لەناو چاوی خەلکی، گران چەشنی مز

لــــه بەخـــشین و بـــەرزی منـــالێش تـــەواو
بــــه دەریـــایی زانـــین، هـــەموو ئـــاودراو
ســــەراپایی کـــوردی ئەناســـم بـــه خـــەڵك
لــــه کوردانـــه، عالـــەم وەریگرتـــووە کـــەڵك
بــدەن پـــاڵ بــه یــەك، ڕاپــەڕن نــەرم و ســووك
بکـــەن کـــاری دوژمـــن، لــه هــەرلا چـــرووك
بکۆشـــن لـــه پارتییـــەوە، تـــا بینـــه گـــەل
لـــه دەس دەرنەچـــێ بـــا ســـامان و هـــەل
ئەوانـــەی خەڵـــەت بـــوون، بیانگێڕنـــەوە
ئەوانـــــەی دیــــارن، مەیانـــــشێرنەوە
ئەگـــەر جارِســـیی کـــرد، یـــەکێ ســـەر چـــەوت
بـــسووتێنه جـــەرگی، بـــه تیـــژاوو نـــەوت
بــــه ڕاســـتی بنۆڕیـــــه کـــــارت لـــــه ڕێ
وەڵامـــی خـــەباتت، لـــه بـــیرت نەچـــێ
برازێنـــــەوە دایکـــــی نیـــــشتمان
وەك بـــووکی تـــازە، لـــەماوەی زەمـــان
ترازاوەکـــــانی ئەباکـــــه بـــــه یـــــەك
بــه زانــین کــه نــەکرا، بــه زۆری کوتــەك
لــه کیــژو کــوڕان، کامــەران بــێ وەڵات
سیاســـەت بگـــۆڕن، بـــەپێی دەســـتەڵات
بکـــەن یـــادی بـــاپیرە (کـــاوە)ی نـــەمر
مەکـــەن ڕێوشـــوێنێك لـــه شـــۆڕش بـــزر
هـــەموو ســـاڵی تـــازەت کـــه نـــەورۆزە دێـــت
بـــه خۆشـــی و گەشـــی، جەژنـــه پـــیرۆزە لێـــت

بە نامادەیی، بەرزو ئازاد بە
ئیتر تا هەتا پڕ بەدڵ شاد بە
بپوورە لە(ژیکۆ)، لە کورتیو هەڵە
کە نابێ لە دونیا، جوان بێ پەڵە!!.

(٢)

**(دڵسۆزیو ئامۆژگاری بۆ نیشتمان)**

هاو گەل، هاو وڵات، برایانی کورد
بە ڕێگای وەتەن، بڕۆن ئەرمو ورد
چاوێك هەڵێنن، ببینن چرا
سەربەرز ئەموونێ بەشەو ئاشکرا
گیاو سەوزەوات، ڕوو لە هەورازن
هەر لە ڕووی سروشت، ئەو هەوا خوازن
لە وێنەی خۆتان بکەن تەماشا
دانراوە سەر لە ژووری باڵا
خەڵکی لە بەرزی هەموو بەختێون
بۆچی هەر ئێوە سەرەو نشێون؟
تەمام سەرەو ژێر ئەگەر بنێژی
بە خوا قەت بەری نابێ بچێژی
تێن دەن بە خۆتان، بجووڵێنەوە
لە دەستی دوژمن مەتووڵێنەوە
وەکو مێشەنگوین شارت بینا نێ
گەورەیی خەڵکی مەکرە بە نانێ
دوژمن لە جێگات شارە زەرگەتە
ژەهری چزووی ئەو، پڕی جەرگتە

ئـەی کـوردی غـەمبار، غـەمخوارت نییـە
یـارو دیـارو دیـدارت چـییە؟
بـاغو ڕاغـی تـۆ، زەوی‌و هێلانـە
بـە تـاپۆی دوژمـن، لـە تـۆن بێگانـە
دایکـی ولاتـت دوژمـن هـەڵیگرت
چـاکی تێبگـە قـەی کـەمو کـورت
گـەورەی ئەجنـەبی، زڕبـابی ناپـاك
چـۆن پـێ بگـەیێنێ، دایکبـرای چـاك؟
حاشـا وە کـەللا، گـەر نـەفس‌و شـەیتان
بـۆ تـۆ بێنـە سـەر ڕەوشـت‌و گونجـان
دەریـا هەڵـستا، بکەونـە پەلـە
لـە وشـکی هـەوا، مەکەونـە مەلـە
بـێ داك‌و بـاب‌و، هـەموو هـەتیون
دەروون تـەپیو، قامـەت چـەمیون
نـەخۆش‌و سـیلدار، بـێ وەسـیل دارن
بۆیـە دەربـەدەر لادێـوو شـارن
سـیلدار هەواڵـەی هـەوا چـۆڵ ئـەبێ
نەخۆشـی ئێـوە، بۆچـی مـۆڵ ئـەبێ؟
بـێ تـەدبیرو ڕاو، شـەرینگەو تـەبیب
لـەناو مـاڵی خـۆت، بـووی گـۆڕ غـەریب
میکرۆبـی ڕۆحـت نایێنـە کوشـتن
مەگـەر بـە خـۆراك، یـاخۆ بـە شوشـتن
سـاغییش بـە بوونـە، گـەورەش بـوون منـاڵ
چێشتتان گـەرم‌و سـارد، سـوێرو تیـژو تـاڵ

پێشچوون بێننە پێش، دەسکەن بە ئەعمال
(همَّـةُ الرِجـالْ، تقلـعُ الجبـالْ)
هەر کەس بە پێی خۆی، پیشەی جیا بێ
تا ڕەگی ئیشتان، ڕیشەی چیا بێ
هەموو مەیانێك، وتراوی ئەوێ
هەموو زەمانێك، پیاوی ئەوێ
لە بێ کرداری، تا بێ کڵاون
لە ڕۆژی گەرما، سەر هەڵکزاون
لە سەرمای شەویش، پەیدا عەلامەت
فڕکەن چڵمو لیك، بگرن هەڵامەت
گوێتان بئاخنن، بۆ مێشکی بە ئاو
هەتا بەکاربێ پیوازی پیشاو
مەبین وتەی کەس کە نابەراوە
بچووکی خۆشتان بهێننە ڕاوە
ئەبینن باران، لە غەیمو هەورە
زۆرە، بە تەن کەم، بە ئاقڵ گەورە
ڕووتو ڕەجاڵی خۆتان مەهێڵن
خزمەتکاری ڕووت، هەموو بە فێڵن
ئەی دەوڵەمەندان دەسکەن بە بەخشین
بەرگێك بپۆشن، ژیانی نەخشین
زوو بگرە مەیدان، پشت مەدە دوژمن
ماری ڕەش بە کلك ئەچێتە ناو کون
پشتێنی چوستی خێرا ببەستن
لە ڕووی کارزار، ئازا بوەستن

بۆ پەشتیوانی یەکتر بن دلێر
مێرد کە زۆر بوون، ئەدڕن پێستی شێر
خاکتان بە مەعدەن، بە زێڕو زەبەر
بە تیژاوی هۆش، ببن بەهرەوەر
چەکو ئەسلەحەی لێ دابرێژن
تەمامی فیکری تێدا بنێژن
پیرەژن، کەپەک ئەگرێ بە هێلەک
ئاردی ساغ ئەکا بە نانو نمەک
خۆ پیاون ئێوە، زوو بگەن بە کام
کاکڵ دەرێنن لە گوێزو بادام
یەک با لەسەربێ، وەک ئاش، یەک لە بن
لە بەینی دوو بەرد بهاڕن دوژمن
هێندێ بۆ هێندێ، پێ لێ نەخشێنن
گورزی بە حوججەت قەت ناوەشێنن
زینهار، گەورەکان بسپێنەتی نیفاق
پاڵ بدەن بە یەک، بگرن ئیتتیفاق
تەماعی شەخسی بنێن بەلاوە
قازانجی قەومیی، نووری دوو چاوە
یەک دەوڵەمەندو، یەک ڕووتو بێ حیس
ڕیشی تەماعکار، بە کینگی موفلیس
خودا بە گوێرەی کارتان ئەکا
کە ڕێک بن، بە بەخت یارتان ئەکا
تا خۆتان لە خۆ تێک ئەدەن، خودا
لێتان تێک نادا، کوردی لێکجودا

هێندێ لە عێراق، هێندێ لە ئێران
هێندێ لە توووران، بوون ماڵ وێران
بووڕادەی ئاڵتوون، نایێتە لێرە
تا نەخرێتە جۆش، ئەی بابە پیرە
بووڕادەی پۆلاش، فووی لێکە ئەیبا
کە پاڵی پێکدا، تفەنگیش نایبا
بڕوانە لیوەو خاکی قەڵەندەر
کە کۆمەڵ کران، ئەبن بە سەنگەر
زاناو خوێندەوار، حیکمەت شوناس بن
سەر بەرزی ژیان، ئەهلی قیاس بن
لە ڕووی سیاسەت، پەروەردەکەن ژین
بە عەدڵو ئینساف، لە سەر ڕووی زەمین
ڕۆژ هەر ڕۆژێکە، بە چوار فەسڵی ساڵ
سێسەدو شەست جێ، دێنێتە بن باڵ
ڕۆژ خۆی سوڵتانو، فووڵ وەزیرن
دوازدە بورجەکان هەموو دەبیێن
شەوو ڕۆژەکان هەروەکو میللەت
هێندێ بە دەوڵەت، هێندێ بە زیللەت
بە بوونی سەنعەت بیووژێننەوە
لە دەرگەی خەڵکی مەنووژێننەوە
وا جاڵجاڵۆکە، جاو ڕایەڵ ئەکا
حەزرەتی شێخیش حەمایەڵ ئەکا
کرمی ئاوریشمو، کرمی قەرەقاج
ئاوریشمو کەژ کەن، تۆش ببیە لاج لاج

جێـــی پێکەنینــــە، نـــەك  جێـــی گریانـــە
بـۆ هەرچـی کـوردە، نـەك  چـی ئینسانە
ئـــەوەی شـــێخ گێـــڕای بـــەناو ســـەروەران
نـــە خـــوا فەرموویـــە، نـــە پێغەمبـــەران
(توبـــوا الی الله) لـــە لای شـــێخ نییـــە
ســـــوودی تەریقـــــەت، بـــــزانم چـــــییە؟
شـــەیتانی ئینـــسان بـــەنی ئادەمـــە
شـــەیتانی جنـــدان، بۆمـــە زۆر کەمـــە
هەڵمەخەڵـــەتێن بـــە مـــەکرو بـــە فـــێڵ
سەرچـاوەی ڕوونتـان، هـەرگیز مەکـەن لـێڵ
وەرنـــە ئیـــشوکار، تێکۆشـــن بـــە دڵ
بنێـــژن ســـونبول، بـــچنن تـــازە گـــوڵ
گـــەر ناشـــتوانن ئیـــشی بـــە تەنقیـــد
ڕازیـــم لـــە ئێـــوە، حـــەتتا بـــە تەقلیـــد
پێویـــــست ئـــــەزانم لەســـــەر بـــــەحرەوەر
ئـــەمری بـــە چـــاکەو، نـــەهی لـــە مونکـــەر
گەرچـــی مـــەتتا زۆر مـــاوە لـــە بـــازاڕ
مەبێـــژە (ڕاجـــی)، چـــیدیکە گوفتـــار
ئـــەوەك پێـــت بڵـــێن، لـــە قـــاتو قـــڕی
مێـشکی مـەی بـردو، گـەرووی خـۆی دڕی!!.
١٩٣٧

## (٣)

## (باسی چۆنییەتی چەرخ و کردەوەی هۆز)

کاکە، بۆت بکەم باسی زەمانم
گوێ ڕابگرە لێم، ئارامی گیانم
چەمان بەسەرهات، یارو یاوەران
گوڵو یاسەمەن، هەموو هەڵوەران
دنیا بە پایز گەڕا سەرانسەر
تیا کە گوم بوون مەردی بە جەوهەر
ملیۆنو ملیار، بەژمێرە لەك لەك
نییە نەرمو گەرم، مەگەر بەستەڵەك
دین بۆ ترووسکەو هۆنینی بەشەر
تاریك بوو، پەساو، بڵاوبوون گەوهەر
کوا گەنجەکانی نیشتمان لە شان؟
کوا میرەکانی، هەموو پاڵەوان؟
کوا دەوڵەمەندی خێوی فەقیران؟
کوا دەسمایەیی ڕەعیەو ئەسیران؟
کوا ڕۆژی ڕووناك، لە ڕووی بێبەشان؟
کوا تاریکە شەو، لەسەر ڕووڕەشان؟
کوا قەی شیرین، لەناو ئەدیبان؟
کوا نانو هەنگوین، بۆ دڵ غەریبان؟
کوا سۆزو ڕەحمو، بەخشینو کۆشین؟
کوا عەدلو ئینساف، بەکۆمەڵ نۆشین؟
میللەت هەراسان، بێ نانو بێ ئاو
برسیو تینووشن، هەموو چوونە داو

نـــەما مەرحـــەبا، لـــە نێـــك تـــرازا
وەك خـــاڵ‌و خـــوارزا، مـــام‌و بـــرازا
هـــەولی ژیـــان‌و، بـــیرو تەربییـــە
لـــە هـــۆزی نـــەمرۆت، نـــیتر هـــەر نییـــە
خـــەڵكی بـــە قرچـــوو، بـــە قـــەرزو قۆڵـــە
دڵ لـــە ڕاســـتی دڵ، دەڵێـــی ســـەهۆڵە
بـــە بـــێ یارمـــەتی‌و، بـــەبێ كۆمـــەڵی
ســـووتای ئـــاگری، كـــوڵای مەنجـــەڵی
وەتـــەن، ئـــەتۆ بـــووی قـــازانج‌و مایـــەم
دووای داك‌و بـــاب، بـــوو بوویـــە دایـــەم
بـــەخێوت كـــردم بـــە دەســـتوبردی
تـــو خـــوا لەبـــەر خـــەڵك، تـــۆ بۆچـــی مـــردی؟
منـــاڵی ڕەنگـــین، هـــەمووت بـــە جێهێـــشت
لـــەزاری عالـــەم، جـــوان وەك بنێـــشت
تفـــوو، ســـەد تفـــوو، لـــە چـــەرخی ناپـــاك
بـــچووكی سەرخـــست، گـــەورەی خـــستە خـــاك
حـــیرس‌و تـــەماع‌و، گونـــاهی ڕێ دا
دونیـــا جەهەنـــدەم، بـــەرە لـــەوێ دا
ڕێگـــای تەقـــەلا، هـــەر كـــەس لـــە خۆیـــە
لـــە كـــردو كۆشـــی، بـــڕۆ بڕۆیـــە
خـــاوەن نەتـــەوەی ســـەنگین‌و ڕەنگـــین
هـــەموو گـــیرەوەی غـــەم‌و دڵتـــەنگین
خرۆشـــاوی جـــەم، شـــەپرزەی قـــڕی
منـــاڵی ڕەنگـــین، هـــەمووی زگ دڕی

دەوڵەمەند کە دی، فەقیر نانی بوو
سواری سەری بوو، گرانجانی بوو
بە جۆرێکی وا دڵی ئەشڵەژێ
کە بۆی هەڵکەوێ، ئیتر ئەیکوژێ
ئەگەر قارونو، ڕەی و، نەمروودە
بە تووڕەکێک جۆ، ئەمجا حەسوودە
هەڵوع تێر نابێ، تەرەس برسییە
بۆ دەوڵەمەندان، نەفسی نەفسییە
ئەگەر توجاری خاوەن موغازەن
لە پووڵ پەرستی، هەزار ئیجازەن
قوڵیشت ئەبڕێ، نانیشتە نادا
ئەگەر ماڵیشت گشتی پەنادا
ئەیوێ بە جارێ برووتێیەوە
تاکو بە هاوار، زووتر بێیەوە
ئەگەر بازرگان، بزورگە کاری
بۆچ پاکو پیسی، ئەخاتە زاری؟
درۆو سوێندی زل، بە بێ ژمارە
لەسەر فلوسێک، ئەکا تەمارە
وەکو عەتاری دەماغ پەشۆکاو
بە بۆی غالییەو، عەترو قاوەو چاو
بە فلسێ کڕی و، بە دینار نییە
مەقاڵی تۆوچا، برا، چار چییە؟
بە سیپەو سندووق، حەشاری داوە
ئەڵێ لە (هیند)یش، بەخوا نەماوە

بەقاڵ، پیشەتە پەقلە فرۆشی
لەگەڵ ئەفەندی، بۆچ مەی ئەنۆشی؟
سەلەمو سووتت، بۆچ وا لە باوە؟
یان لە ڕێی تەماع، ئەستۆت شکاوە؟
تەرازووت بە فێڵ، ئیزرەم، ئەلیدرەم
خۆیشت، بەحۆقەت ئەچیتە ناو دەم
ئەمەندە خوارو پیسو پەلیدن
وەکو جەهەننەم، (هل من مزید)ن؟
عەللافی پڕ لاف، بۆ دانەوێڵەك
ئەکڕێ بە کوڵو، ئەیدا بە هێڵەك؟
سەرڕای هەموو شت، وا تێئەکۆشێ
لەجیاتی گەنم، هەرزن ئەفرۆشێ
کاکە! بەرناگر، یانی نانەوا
چاکی بناسە، مەغزووبی خوا
مەقاڵێکە نان، هەمووش هەویرە
ئەڵێ ئیزرەمەو، مەیرە پەنیرە
حاجی! بە قوربان، ئەڵێی پەپوولەی
بۆچی لە دووی نان، حەریفی توولەی؟
بە سوێندو حیلە، خەڵکت بڕینگ دا
مەگەر تێکت نەهات بە کێنگ دا
مەلەك، بەم هەموو سافیو شەفافە
نادەم بە زانین کردی خەلافە
نۆرەی مەلایە، کە خۆشم مەلام
وا ئەمبزێوێ، زگو ئینتەلام

نانم کە جۆیە، پێخۆرمە پیواز
با هەڵبدێرم، لە سەد کاوو ڕاز
مەلا مەلا بێ، حیکمەت شوناسە
هەموو قسێکی پڕی قیاسە
بورهانی قەوی، ماددیو مەعنەوی
سافو لەسەرخۆ، تا بتکا نەوی
لەهەر هەوارێ، تۆ لێی بپرسی
نەبێ لە تیغی تیژی بترسی
لە هەموو دەریا، مەلەی بزانێ
خولەی بەشانێ، خلەش بە بانێ
مەلای نەزانا، حەریفی شێخە
بۆ ڕێی گاوری، بێ تێوە ڕێخە
بۆ لوقمە نانێ، دینی ئەدۆڕێ
نەبێ قیامەت، وەك گا بقۆڕێ
لەبەر کەسادی، خووی نەخوێندنە
ئەوجا تا مەرگی، درۆکردنە
کاکە! بەخێوکەن مەلا چاکەکان
تاکو نیشان دەن، ڕێبازی ژیان
دین، بۆ ژیانو خۆشیو مورادە
ئەگەر خاکیشت، ڕووتو بێ زادە
مانای دینی تۆ، براو بابییە
گەر ئەوامیرو، گەر نەواهییە
مەقسوودی خوا، لەدین بۆ بەشەر
بەرێکی بژیو، ببی بەهرەوەر

هەرچی لە پێی، کەللەی نەتاسێ
کە خۆی بناسێ، خوداش ئەناسێ
لێت ئاشکرایە، وەکو ڕۆژو مەه
(مَنْ کانَ لِلّه، کانَ اللهُ لَهُ)
عیبادی خوا، ساحێب ئیمانن
موبەززیر هەموو برای شەیتانن
دەرهەق یەك نەبن خاوێن و دڵپاك
نابینن بەچاو، ڕۆژێکی ڕووناك
دوژمن زەفەرتان پێ نەبا هەردەم
خۆتان ببینن کورانی ئادەم
چی پێغەمبەران هێنایانە ڕوو
هەر ئەوە هەوێن، بۆ ڕەوشت و خوو
(ڕاجی) بەگشتتان ئەڵێ برا بن
هەتا ڕۆژو شەو، موشکیل گوشا بن.

(٤)

(گەشتێك بە گوندەکانی دەشتی کۆیەدا)

بە باسێکی خۆش، وا دێمە یاری
نیشانەو ناو، هەدیەو دیاری
لە ڕۆژانی گەش، لە مانگی نیسان
کە هاتە گیرسان مێلاقەو نیسان
حاجیلەو بەیبوون، هەلالەو سونبول
هەمووی درەوشا، بە دەم خەندەی گوڵ
بریقەو هەوا، دنیای کردە دەشت
وەرنە مێرخوزار، بە مناوی بەهەشت

لــه هــەر جــێ دەچــی، لەگــەڵ چــاوی یــار
(جنّــــــةٌ تجـــــری تحتهــــــا الّنهــــــار)
لەگــەڵ کــاك (عــەزیز[1])، وامــان دا قــەرار
بــچینە (تەقتــەق)، لەبــەر نــیش‌و کــار
ناگـــا، ڕێکخـــرا ئەســـپو ســـوپا
چـــاپووك ســـواران، بـــە تـــەپڵ‌و ســـەدا
لــە دێــی (خەرابـــە)، هـــەتا شیوەســـوور
بـــە ســـەیران‌و ڕاو، لـــەنێزیك، لـــە دوور
بـــە تاومـــان بـــڕی هـــەورازو نـــشێو
کــەس بــاکی نــەبوو، بــە فیــل‌و بــە دێــو
شــەو چــووینە (گــەرمك)، لای (کوێخــا حوســێن)
چــەند خزمــەتی کــرد، بــە هێــزو بــە تــێن
بـــەڵام لـــە گرمـــەی هـــەورو تریـــسکە
عالـــەم ئەســـوورا، وەکـــو بریـــسکە
ســـبەینێ بـــەخێر، چـــووینە (موخـــەڕڕەس)
بـــارانی بـــەتاو، کردینییـــە ئـــەخرەس
ئێـــوارە چـــووینە (باغـــەجنێر)، بـــەناو
فاتیحامـــان خوێنـــد بـــۆ گـــەنجێکی لاو
ســـبەینێ بـــەعام، هاتینـــە (تەقتـــەق)
دەنگـــی پێکـــەنین، وەك حـــاجی لەقلـــەق
مـــولازم ئـــەوەڵ کاکـــە (حامیـــد بـــەگ)
دەمـــاری دوژمـــن دەردێنـــێ لـــە ڕەگ

1 مەبەست لە (عەزیزی سالّح ئاغای غەفوری) یە کە گەورەو ئاغای گوندی (خەرابە)و چەند گوندێکی دیکەی دەشتی کۆیە بووە.

(محەممەد رەمزی)، مەدیری بەناو
خزمی خۆمانە، بەبێ چاوو راو
سێ شەوو سێ رۆژ، بەزمو بادە بوو
مەجلیس گولاو پاش، ساقی سادە بوو
بەزمی چاوەشان، سەدای چەغانە
هێنایە لەرزین، دڵی زەمانە
هەر شەو لە ماڵێک، بە بەزمو یاری
دینارو درهەم، بەتاو نەباری
بڕیار درا وان، بچێن بۆ (خەرابە)
کۆمەڵ تێکەدان، بێ پرسو جوابە
دەس وەبانی چەم، قەرارە یەک دەم
حاکمی کۆیەش بێ، دوور لە دەردو غەم
تاقم، وەربوو بۆ (مەلا زیاد)
هەموو نقوستان، هەر مەلا، زیاد
خەبەرمان هەنارد بۆ (کوێخا حوسێن)
مەدیرو زابت، قۆمیسەر کە دێن
سەر لە ئێوارە، سووار بوون عەگید
بۆ دێی (خەرابە)ی ئەمینو رەشید
تاقم بەجارێ کرا بە دوو شەق
یەکێک بۆ کۆیەو، یەکێ بۆ تەقتەق
کێ مابوو لەدێ؟ سوواری سەرکەش
هەر منو ئاغا، لەگەڵ دوو چاوەش
سبەی سەر لە زوو، بێ شوێنو مەجال
کرایە سەرمان، رەسمی ئیستیقبال

تا ڕەخشم زین کرد، پۆشیم نەبەردی
پێم نایە ڕکێف، بە دەستوبردی
دەهۆڵو زوڕنا، کەڕی کرد فەلەك
لام وابوو هاتن بە سەیران، مەلەك
وەمزانی لەشکر، چوار دەوری گرتین
لە ناو نەوازیل، ڕەنگە بە قڕ چین
کە دیتم ئاغا لەگەڵ دوو چاوەش
وەستاون لە ڕێم، بەبێ درۆو غەش
فەرموو با بڕۆین، بە پیر کۆمەڵە
مەرکەز (گەرمك)ە، خۆ مەکەن هەڵە
ئاغا بۆ پێشواز، بە قەترەو بەغار
پاشواز ئەمن بووم، لە گەشتوگوزار
دوو چاوەش لە بەین، (عوسمان‌و کەریم)
دەهۆڵو زوڕنا، بوو بوونە نەدیم
دەکوتران لە ڕێ، وەکو ڕەعدی پڕ
ئێمە بە لاوك، ئەسپان مرەمڕ
ڕێبوار ئەیانەدی کە ئێمە لە دوور
ئەیانوت چاوەش هاتن بە دەستوور
کە ئەیانزانی ئاغاو مەلان
خەجاڵەت ئەبوون، تێکڕا ئەشلەژان
هەر لە (کانی ڕەش) تاچووینە (کارێز)
تووشی سەد کەس بووین، بەڕێزو بێ ڕێز
لە (کارێز)ەوە تاوەکو (گەرمگ)
هەر چوار سوواری چالاك‌و چاپك

لەوێ دابەزین بە شەوق و بە ژیر
هاتن زابت و مەئموورو مودیر
لەوێش نان خورا، نانی نیوەڕۆ
سوواربوون هەموو، لە ڕووی جستوجۆ
هەتا (کانی ڕەش)، هاتین بە سەیران
تەسپی مامزگر، بە باڵی تەیران
فیقەی دووزەلەو، دەهۆڵ و سازی
مەلانیکەتی خستە ڕەمبازی
بۆ ئیستیقبالی حاکمی دیوان
چوونە (قولقولە)، یەعنی بەر مەیدان
پێکدی شابوون و، تۆقەو دەس لە مل
چاوی ڕۆژانی پڕ دەکرد لە کل
ئەمجا گوشادیی، هەتا (خەرابە)
بێ قەیدو شەرت و، سوئال و جوابە
هەموو دابەزین، هۆزی دلێران
لە نەشئیمەنا، هاوتایی شێران
(ڕاجی) لە یەزدان ئەپارێتەوە
کە عەیبی کوردان بشارێتەوە.

**( دەمەتەقەی نێوان فەقیرو دەوڵەمەند )**

**-لەسەر داخوازی کاکە زیادی حەمە ئاغاو،**

**حاکم عەلائەدین ئەحمەد نووری نووسراوە-**

بە ناوی خودای فەرمانڕەوا بێ
خێوی کائینات پشتو پەنا بێ
سوپاسو سەنای بێ عەددو پایان
تا ڕۆژی ئاخر، شایانی یەزدان
مەکینەی کاری هەموو خستە کار
نەوەک گیاندار، هەتا بەردو دار
بە پێی توانین، هەمووی دابەشی
لە ڕوویی زانین، دایە سەرکەشی
دەستوورێکی ڕاست بۆ بەرانبەری
گوڵو دڕکو داڵ، ئاقڵیو کەری
زاناو نەزانا، تاریکو ڕووناک
ئەستێرەو درەخت، عاسمانو خاک
دەریاوو بەڕیا، وشکیو تەڕایی
ماسیو سووسمار، کوێریو بینایی
زستانو هاوین، بەهارو پایز
هەورازو نشێو، دڵخۆشو عاجز
زوهرەو موشتەریو، مەریخو زوحەل
مانگو ڕۆژ، ئیتر، ژیانو ئەجەل
گەرماو ئاگر، شەختەو بەستەڵەک
گوڵەی نابەڵەد، دوو چاوی بەڵەک

قــــرژاڵو ڕەقـــەی، لـــە ئــاو قـــەرار دا
گلخـــۆرەو وڵـــەی لـــە خـــاك دیـــار دا
پێـــروو و تـــەرازوو، بـــە حەوتەوانـــە
هـــەر حەوتـــە ئیـــشێك ئەکـــەن کێـــشانە
بـــۆت بکـــەم باســـێك، ئەگـــەر ئـــەبینی
لـــە بـــیرت نەچـــێ، هـــەتا لـــە ژینـــی
ڕۆژێ، فـــــەقیرێك وەکـــــو ســـــەمەندێ
وەســـتا لـــە قـــاپی خـــۆش دەوڵەمەنـــدێ.

فـــەقیر: لێتـــان تێـــك نـــەدا، خـــودای بـــێ ئەنـــدێش
شـــتێکی ڕەوا بیـــــنن بـــــە دەروێـــــش
وەڵامیـــــان نـــــەدا، تـــــەقولبابی کـــــرد
یـــەکێ دەرپـــەڕی، تـــفو بـــابی کـــرد.

خوڵام: کـــابرا چـــیت دەوێ، دەرگـــا مەشـــکێنە.
فەقیر: هەرچـــی خـــودا دای، ئـــەوم بـــۆ بێنـــە.
خوڵام: خـــوڵام چـــۆوە ژوور، گـــەورەم، فـــەقیرە
عـــــەودالّی نـــــانو، ژاژو پـــــەنیرە.
دەوڵەمەند: پـــاروو لـــە دەم دا، کـــاکی دەوڵەمـــەن
بـــڕۆ دەریکـــە، جـــادووی مـــەکرو فـــەن
بڵـــێ، خـــوا بـــدا، مەوەســـتە لێـــرە
لـــە مـــاڵی ئاغـــا، بخـــۆ کـــولێرە
خـــوڵام پێـــی دەگـــوت، چـــی ڕاســـپێرا
فـــەقیر دەڕۆیـــی خێـــرا، بـــە خێـــرا

ماڵی یەك و دووی، هەموو پشكنی
برسی مایەوە، بەخۆی و ژنی
غەریب، ڕووت و قووت، تەنووزایەوە
هەتا بەیانی ئەكرووزایەوە
ئەمڕۆش تا ئێوار، گەڕا لە ماڵان
گەڕیدەی هەموو دیوان و داڵان
هانای بردەبەر كۆنە فەقیران
پێیان ئەبەخشی وەكو وەزیران
تەسادوفی كرد، ڕۆژێ لە ڕۆژان
كەوتە دیوانی پۆڵا كرۆژان
ئەو دەوڵەمەندەی خولام لەبەر دەست
وا دانیشتووە، سەربەست و سەرمەست
ملیۆن و ملیار، پارە ئەژمێرێ
قازانجی پێرار، بابێ بەخێرێ
ژمارەنووسان، لەبەر دەست و پێ
وەكو كەوڵی مەڕ، لێی دابێ ئەسپێ
هەموو لەخۆشی زەردەی فلووسن
نیبەت و فائیز، بە جەبر ئەنووسن
لاق و پەراسوو، بە قوتەب و میحوەر
سەر بە دائیرەی عەردی مونەووەر
ساحەی باغ و ڕاغ، مەساحەی ئەكەن
سێ و چوار قوڕنەو، درێژ و میعیەن
دەوڵەمەند بە فیز تەماشا ئەكا
لە قازانجی ساڵ، هەر حاشا ئەكا

فـــەقیرە ڕووتـــە، خـــۆی پـــێ نیـــشان دا
غەرگـــەی فـــەقیریی دابـــوو بـــە شـــان دا.

فەقیر: لێتـــان تێـــك نەچـــێ، ســـامانو ســـەروەت
بەشـــی فـــەقیران، دەسمایـــەی دەوڵـــەت.

دەوڵەمەند: بـــڕۆ خـــوا بـــدا، بـــابم هـــیچ نییـــە
ڕاوەســـــتانی تـــــۆ، لێـــــرە بۆچـــــییە؟
زلـەی مـل ئەســتوور، بـۆ خـۆت عەمـەل کـە
مـــاڵو منالـــت، دووری ئەجـــەل کـــە.

فەقیر: وتـــی مـــــن زلم ، ملـــم ئەســـــتوورە
بـــۆ نـــانێکی تـــۆ، جـــەرگم تـــەنوورە
بـــێ جـــێو بـــێ مـــەکان، زارو ئـــاوارەم
ئـــەوا ئـــەمبینی، هێنـــدە بـــێ چـــارەم
کـــاتی منـــاڵی، بـــە ڕێـــوو جـــێ بـــووم
خێوی موڵكو ماڵ، سـوار ئەسـپی شـێ بـووم
چـــەند ئیحتیـــشامو، شـــەوکەتم هـــەبوو
لـــە تـــۆ زیـــاتر دەوڵـــەتم هـــەبوو
خـــاوەن ئەســـڵی پـــاك، ئـــەژادی گـــەوران
منـــی فـــەقیر بـــووم، لـــە چـــەرخی دەوران
بـــە ڕاوو ســـەیران، شـــەوو ڕۆژی مـــن
بـــە بـــەزمو ئـــاواز، گـــەل ئـــامۆژی مـــن
بووبوومـــە قـــارۆون، بـــەلافو گـــەزاف
حیرســـم پـــەیا بـــوو، هـــەتا کێـــوی قـــاف
دینـــم لـــە بیرچـــوو، ئەســـاســی ژیـــان
فرێمدایـــە ژێـــر ســـێبەری (بـــێ)یـــان

فرێمـــدا ئــەوەی فــەرمووی لــە قــانوون
(حَتـــی تُنفقـــوا مِمّـــا تُحِبّـــون)
لـــە ناکـــاو، بـــەڵا بەســـەرما ڕژان
خـــوێنی دەمـــارو جـــەرگو دڵ، پـــژان
بـــەختی بڵنـــدم، ســـەرەو نـــشێو بـــوو
بـــاری بـــچووکم، بـــە وێنـــەی کێـــو بـــوو
ئـــاوارەی کـــردم، خـــودا لـــە ســـارا
چـــاك بـــوو نـــەیکردم بـــە عـــەردی خـــارا
ئێـــستا، بـــە عیلمولیـــەقین ئەیناســـم
هـــەردەم لـــە حەمـــدو شـــوکرو سوپاســـم
عـــیلمو دیـــنم بـــێ، بێبـــاکم لـــە نـــان
هـــەموو ڕۆژ ڕزقـــم ئـــەدا بێگومـــان
ئـــەتۆش پـــێم ئـــەدەی، هاوقـــەرانی مـــن
لـــە مـــاڵی مـــەلا، ئـــەدەن نـــانی مـــن
دوعـــای زۆر باشـــم ئـــەمن بـــۆ کـــردی
(لێتـــان تێـــك نەچـــێ)، تێبگـــە بـــە وردی
هێنـــدەت خۆشـــییە، لێـــت وەرنەگـــەڕێ
ئـــەگینا نەگبـــەت، پێـــت هەڵدەگـــەڕێ.

دەوڵەمەند: دەوڵەمەنـــد هاتـــە وەڵامـــی فـــەقێ
بـــۆ تـــۆ دەس نـــادا، پـــیرو دەســـتگیر
بـــڕۆ بـــە ڕێـــی خـــۆت، هـــیچت نادەمـــێ
حیکایـــەتی کـــۆن، گوێـــشت نادەمـــێ
بـــەری مـــاڵ ئـــەخوا، ئـــەوەی خەریکـــە
تەمبـــەڵی وەك تـــۆ، کەشـــکی فەریکـــە

کــێ تــۆ ئەناســێ لــەم دەورو پــشتە؟
بــە ئەســڵو فەســڵت، ســوالّت ڕەوشــتە
هەرچــی بێتــەلام، شــتێك بــستێنێ
هــەتا بــەیانی هیــچم نامێنــێ
منــیش وەکــو تــۆ ســەرگەردان ئــەبم
لــە دەرگــەی مــاڵان، گــران جــان ئــەبم.
فــەقیری هوشــیار، ئەیــدا جــەوابی
لــە ڕووی عــیلمو فــەن، حــازر خیتــابی.

فەقیر: دونیایــە دەریــای درێــژو پانــە
هــەزار دەوڵەمەنــد، ســەت پەرێــشانە
موحتــاجی بەشــدار، نیــسبەت چــڵ ئێکــە
دەبێنــكو چــلییێك، بنــكو چــڵێکە
لات وا نــەبێ تــۆ، مــن بــەخێو ئەکــەی
موحافــەزەی خــۆت لــە دەس دێــو ئەکــەی
نــابینی، شــەوی تــاری بــێ ســامان
شــەش حــەوت ئەســتێرە ئەیکــەن چــراخان
گــەر فــەقیر نــەبن، نــانخۆری زاڵان
مــاڵو مناڵیــان ئەبــەن بــە تــاڵان
بــێ دەوڵەمەنــدیش، جگــە لــە ترســان
هــەر فــەقیر هــەبن، ئــەمرن لــە برســان
هــەردوو تایەفــەش، دەوڵــەت ناتــەواو
شــەوەو بۆتــە ڕۆژ، هــەواش بۆتــە ئــاو
هــەمور کائینــات، دوو دوو بەرانبــەر
عــیلمو نــەزانین، ڕووتو تەوانگــەر.

دەوڵەمەند: وەڵامـــی دایـــە، بـــڕۆ هـــەش بەســـەر
بەگـــژما مەکـــە خـــوداو پێغەمبـــەر
دونیـــا، گـــەر کـــورتو درێـــژو پانـــە
(نـــان هـــەر ئـــەو نانـــە، ئـــەورۆ لـــە خوانـــە)
خـــەمی ســـبەینێ، گـــەر ئـــەمڕۆ نـــەخۆم
ئـــەبێ دێ بـــەدێ، کەســـاد بم، بـــڕۆم
دەبێـــکو چـــلێك بگـــرن هـــەژاران
ڕۆژانـــەش بـــدەم بـــە خێـــو ژمـــاران
لیباســـی مـــاڵو منـــاڵم بکـــەم
تـــەعامو نـــەهام، بکـــڕم جـــەم بەجـــەم
دەری نایـــەنێ ســـاڵێ ســـەرو بەر
منـــیش وەکـــو تـــۆ ئـــەبم قەلەنـــدەر
دەوڵـــەت پـــارێزیم بـــە تـــۆ نـــاکرێ
ســـەرو مـــاڵی مـــن، بـــە تـــۆ نـــادرێ
ئـــاخو داخ لەبـــەر ڕووتو دەروێـــشان
بەقـــسەی پـــان پـــان، مەمکـــە پەرێـــشان
ئـــەم چـــیرۆکانە گـــەلێك کـــراون
هـــەموو بـــۆ لوقمێـــك خـــەپووزو، ئـــاون.
فەقیر: لوقـــمەی تـــۆ تـــەنیا چـــارەمان ناکـــا
ئـــەبێ کۆمـــەڵێك، دەردم دەوا کـــا
چـــیرۆکەکانم هـــەموو حیکمـــەتن
دەوڵـــەتپارێزیو ســـامو شـــەوکەتن
خـــوا عـــەقڵو عیلمـــی گـــەلێك داومـــێ
چ بـــاکم ماڵـــە، کـــە نەیـــداومێ

مالّی دایمی، عیلمو عیرفانە
هەردەم لە پارەت، ئاخیر زەمانە
پارەت بدزریّو، میّگەلت بخوریّ
بە نانیّك نابیّ، بە فەقیر بدریّ
مەبنای ئینسانی موساعەدەیە
هەموو گوناهیّك موباعەدەیە
تا دوور تایەفە ئەفرەت لیّك بکەن
ئەوان بناغەی بەشەر تیّك ئەدەن
خۆشیو ناخۆشی، رووتیو دەولّەمەن
(لِیَبلُوَکُم أیَکُم أحسَن)
منو تۆ هەردوو تەجرەبەی خوداین
لەغەش دەرنەچین، هەردوو رووسیاین.

دەولّەمەند: خۆت لە من بەستا، پەرپووتی ناکەس
کە مالّم هەبوو، لوتفی خوام بەس
مەرتەبەم هەوراز، لەچاوی عالەم
وەکو تۆ چ کەس، نامبینیّ بە کەم
دزیو جەردەیی، ناکەم بە پیشە
وەکو بیّ ئیشان، بە جەرگی ریشە
پوولو پەنابات، لە باتمانو گەز
سەلەمو ریبا، ئەگرم بە قاقەز
کەتیرەو مازوو و خوری کە ئەکرِم
فلوس بە فلوس قازانج وەرئەگرم
بیّ وازم لە خەلّك، خەریکی کارم
غەمخواری ئیمرۆو سبەو ئیّوارم

نانیشم نەخوری، مالیشم نەچێ
بەرەواج، عەرزو حالیشم نەچێ.
فەقیر: شەرتە مەرتەبەت، بەرزی، لای خوا بێ
نەك لای عالەمی کەونو فەنا بێ
تەکەببور مەکە، هەروەکو منی
تا خۆت بەسەرخەی، ئەوسا لە بنی
ملکەچ بوو شەیتان، جێی ئاسمان بوو
نابینی جێگیر لە بن عەردان بوو
دزیو جەردەی چۆڵ، گشت کەس ئەزانێ
تۆ وای ئەدزی، کەس پێ نەزانێ
هۆقەو تەرازوو و گەزت نقوستان
مالی سەت کەس، ڕۆژ، ئەبەی بە تالان
بێ تەوەکولی، ئەگینا سەبەی
نازانی لەگەڵ خودا چی دەکەی
سەرو چاوی خۆت، کە خاوێن ئەشۆی
بە چڵکو میکرۆب، ئیتر ڕەنجەڕۆی.
دەوڵەمەند: گومان خەراپی، فەقیری ناچار
وەختە بێی بەگژ حەسارو دیوار
چیت لەمن دیوە، پێوانو کێشان
مالی هەتیوو ڕووتو دەرویشان
پیاوی یەك دونیا بوومە نەك هوما
(بَــلِ الرِجُــلُ رَجُلاهُمـا)
خزمو عەلانیق وەکو کرێکار
بە پای پیل ئەخۆن، دوو جارو سێ جار

هەر دەعوەتێکم بۆ شاو ئەمیران
بە کورتی بڵێم، بایی سەت لیران.

فەقیر: بەم قسانەی خۆت، وا ئیلزامت خوارد
بە دەعوەت، قسەی زلت رابوارد
بەرتیلو رەشوەت ئەدەی بە میان
تاکو تالآنکەی مالّی ئەمیران
نابینی فەرمووی خودای منو تو
(كُلُوا واشْرَبوا ولاتُسْرِفوا)
داوای دوو دونیا ئەکەی سەروبەر
کێ رەها ئەکەی لە دەستی هەژدەر؟

دەولەمەند: بە زمان لووسی دەڵێی جاسوسی
کتێبێك ئەبێ، ئەگەر بینووسی
بۆچ بە وەرگرتن ئەخوێنی بەیات؟
نییەتی قەناعەت، حەدیسو ئایات؟
هەر کەس بە پێی خۆی رووتو برسییە
ئیمڕۆ زەمانی نەفسی نەفسییە
تازە تێپەری، بەشەر رێك کەوێ
کار ئاشکرایە وەك رۆژو شەوێ
کاکی خۆم، منیش ئەزانم ئینسان
دەربارەی ئەکا کەلامت بەیان
(إذا مَسَّهُ الشَرُّ جزوعاً)
(إذا مَسَّهُ الخَيرُ منوعاً)
بەڵێ، ئەزاکەت هەردەم دروستە
رێی (وفَضَّلْنا بَعْضَهُم)، بەستە.

فەقیر: چــونکە بــێ شــەریك، ئــەزانم خــودا
نامــەوێ میللــەت لێــك ببــێ جــودا
بــیری لــێ بکــەن خــۆ مەکــەن غەڵــەت
لــــە(جَعَلْنَــــاکُم أُمَّــــةً وَسَــــط )
لــە ڕووی بێگانــە هــەتا دیــار بــن
بــە نــازو نیــاز، بــە کاروبــار بــن
کــە ویــستت بــرات، وەك تــۆ بــێ نــاوی
ئــەمجا کەســێکی ئیمــان تــەواوی
گــەورە ناقڵمەنــد، دەوڵەمەنــد ســەخی
بــە تایبــەتی عێــل، هــەر ئــەبێ بــژی
گــەورە بــێ نــەفام، دەوڵەمەنــد ڕەزیــل
جێتــان لــە دونیــا، جەحیــمو ســیججیل.
دەوڵەمەند: داوای قەومییــەت بــە تــۆ نــاکرێ
ئــەو دارەی چــاندت، بــەرێك نــاگرێ
ســواڵی نانــە، یــا ســواڵی جیهــان؟
عالــەمت خــستە بــەر تیغــی قــسان
ئــەم داوایــەی تــۆ، بــۆ کەســێك باشــە
ســـندووقو جانتــای پــڕی مەعاشــە
بــە پاڕانــەوە نــان پەیــدا ئەکــەی
لــە ڕووی فەنــدو فــێڵ، جنێــو بــۆ ئــەدەی؟
ئەگــەر لــە مەعــدەن، ئــاڵتون پــەیا بــێ
ســەت باقــە دەرزی، گاســنی تــێ نابــێ
دەوڵــەت چــاترە لــە بــێ دەوڵــەتی
خــودا قــەومی جــووی کــردن پــێ پــەتی

چـــونکە پێیـــــان وت خـــودا فـــەقیرە
ئێـستاش قـــومێکی غـــەزەب لـــێگیرە.

فەقیر: بـــە مـــاڵو منـــداڵ، بـــا کـــەس نـــەنازێ
هـــەر کـــەس بخـــوازێ لـــە خـــوا مـــرازێ
ئەگەرچـــی ســـەروەت ئەکـــەن ژمـــارە
(إنَّ الإنـــــسان لَفـــــي خُـــــسارَة)
خێـــری ســـەد (ألمـــال و البَنـــونَ) بـــێ
(إلاَّ الـــــذینَ آمَنـــــوا) نـــــەبێ
کاتـــێ کـــە بوویـــە ســـوڵتان نـــەتابوك
نینجـــا جوانـــە، (دَعْ مـــا یُریبُـــك)
جنێـــو فـــرۆش نـــیم، بـــە بـــێ فەنـــدو فـــێڵ
نـــانو نەســـیحەت، منـــی کـــردووە وێـــڵ
بۆیـــە قـــەومی جـــووی کـــردن نـــاوارە
هـــەتا تێبگـــەن ســـەبەو ئێـــوارە
چـــاکە بـــە کۆمـــەڵ بیناکـــەن وەتـــاغ
(مـــا عَلـــی الرَّســـول إلاَّ ألـــبَلاغْ)
ڕوو وەرمـــەگێڕن لـــە نـــاوو لـــەدین
(إنَّ الـــــشیطانَ عَـــــدوٌّ مُـــــبین)
دڵ پەروەردەکـــەن، لـــە جیـــنسو عـــەدەد
کـــە ئـــەو پـــەرداخ بـــوو، پەرداخـــە جەســـەد.

دەوڵەمەند: لـــــە ڕووی زەمانـــــە زۆرن بەهانـــــە
لێـــدە کەمانـــچەو عـــوودو چـــەغانە
هـــەتا لـــە دوورمـــە، کـــەیفی پـــێ ئەکـــەم
لـــە دووریشـــم نـــەهات، تفـــی لـــێ ئەکـــەم

رەمـــــەزان جـــەژنی ڕووت و قووتانـــــە
بـــۆ دەوڵەمەنـــدان جـــەژنی قوربانـــە
ئـاخیر شـەر نـەبی، بـۆچ وات بەسـەردێ؟
بـاخی ئـارەزووت، کـەی بـۆت بەبـەر دێ؟
نەمـــدی لـــە دۆزەخ کەســـێ بێتـــەوە
بـــۆ بەهەشتیـــشت ســـوێنم دەبێتـــەوە
هـەر خـواش دەزانـێ چـەرخی کائینـات
بۆ کـێ نەسـووڕێ و، کـێ ئـەکا قـەپات
هانـێ بیـست فلـس نـانی پـێ بکـڕە
گۆشـەی ڕیـسوایی خـۆتی پـێ بگـرە.
فەقیر: بیـست فلـسەکەی تـۆ بـە سـەد دینـارە
قەناعـــەت ئەکـــەم هـــەتا ئێـــوارە
قـــسەی پێغەمبـــەر ئەکـــەم موســـتەمەع
(عَـــزَّ مَـــنْ قَنَـــعْ، ذَلَّ مَـــنْ طَمَـــعْ)
بـە بەخـشین نـەبێ ناگـەن بـە کـانی
(إنَّ الإنـــسانَ عَبـــدُ الإحـــسانِ)
فـەرموودەی ئیمـام (عـەلی)م لـەبیرە
(أعْـــطِ مَـــنْ شِـــئْتَ تکُـــنْ أمـــيرَه
وَسَـــلْ مَـــنْ شِـــئْتَ تكُـــنْ أسـيرَه
واسْـــتَغْنِ عَنْـــهُ تكُـــنْ نَظـــيرَه)
لـە خـوا ئـەخوازم بـە فـەقرو غینـا
ڕێگـەی هیدایـەت پێمـان نیـشاندا
لـە ڕێـی مـەولا بـێن خـاوێن و وریـا
خـاوەن نـەجات بـێن لـە بـەرڕو دەریـا

لەسەر هەمووتان سوپاس و سەلام
دوعا بۆ مەرام، (وَالمسكُ ختام)
(ڕاجی)، ئەخوازێ ئاواتی کوردان
لە یەزدانی پاک، لە شاهی مەردان
ئەویش دڵسۆزی خاکی کوردانە
هەژاری بێ ماڵ، پێچکەی پردانە.
کۆیە -١٩٤٤



## ب- وتار

(١)

سوپاس‌و ستایش، شایانی کردەوەی ئەوە بۆ بەرزکردن‌و ڕێکخستنی بەشەر.

من کە هەتیوێکم لە هەتیوە پێگەیشتووەکانی کوردستانی شیرین، بە هیواییکی زۆر بەرز لەگەڵ گەورەکانی هەتیوپەروەرو نیشتمانپەرستەکانی خۆشەویست دەڵێم:-

١/ هەمووتان لە مێژووی پێشوودا زانیوتانە کە لە دوای لێشاوو لێزماتە گەورەکەی نووح پێغەمبەردا ئاوەدانی لەخاکی پاک‌و شیرین‌و ڕەنگینی کوردستان دامەزراوە بە دەس کۆمەڵێکی دڵپاک‌و خاوێن‌و ڕاست، ئەوانەی یەزدان هەڵیبژاردن بۆ ژیان. واتا لە نەتەوەی ئەوانە، پێوەستە هۆزی بەشەر بە تەرزێکی ڕێک بژیا. بەمیانەی وەستانەوەی کەشتیەکەیان لەم خاکەدا، بورهان دەکرێ کە زمانی کوردی زۆر پێشکەوتوو بووە، چونکە هۆزە بە پێشچوونەکە خاکە نازدارەکەی خۆی بەرنەداوە.

٢/ ئەم هۆزە بەهەموو جۆرێک تێکۆشەر بووە بۆ دامەزراندنی هەموو پێویستییەکی کۆمەڵ.

٣/ زۆر پیاوی بەرزو بالاّمان دەرکەوتووە کە بەڕێکخستن‌و پەرداختەی وەتەن خەریک ماون بە دەستوورێکی ژیان.

٤/ هەتا زەمانی پێغەمبەر حکومەت‌و پیاوی گەورەیان هەر هەبووە کە کۆمەڵیان ژیاندووە.

لەگەڵ هەموو تاڵییەکدا ئەم منداڵە بچووکانەی نیشتمانی ئێمە هەتیو ماون، هەتیوی بەهەر جا، بەڵام دایکە خۆشەویستەکەی شیرین شیریشمان کەوتە باوەشی زڕ باوکێکی، بەڵکە زۆر زڕ باوکی ناپاک، کە بۆ کوشتنیان تێ ئەکۆشن داخەکەم.

ئینجا سەروەران، لەبەرتان دەپاڕێمەوە:-

١/ لەسەر ئیرەی باوکەکانی پێشووتان بڕۆن.

٢/ بە تەواوی بزانن هەر ڕێکییەکی هەتانە، ئەگەر لەژێر دەستوورێکی کۆمەکییدا نەبێ سەرناکەون.

٣/ ڕێکی گەورە (حکومەت).. ڕێکی بچووك (عەشیرەت) پێویستە. کە وابێ ناشیا بەهیچ بابەتێك کە گەورە لە بچووکان نەبوورن و بەهێزی ژیری و هۆش پەروەردەیان نەکەن.

تکا لە گەوران دەکەم کە پێگەیشتوون، نەك لە بچووکان کە ناتێگەیشتوون، تکایان لێدەکەم بۆ پێگەیاندنیان زۆری دەوێ وە دەتوانن بیانکەنە هەموو جۆرە نیشانەو سەنگەرێك. وا دیارە ژیانی کۆمەڵی گەورە لەهی بچووکەوە پەیدا دەبێ (تا یەك نەبێ، دوو نابێ).

هیوامە لە پێش هەرشتێکدا (کۆیە) بژیا لەگەڵ وڵات، لەلایەکی دوایی کوردستانی شیرین لەژێر دەستوورێکی ڕەنگین.

ڕاجی
هەڵگری ئاواتی کوردستان

## (٢)

## وتەی نەورۆز (*)

سەروەران: ڕۆژتان باش، جەژنتان پیرۆز، ژیانتان خۆش.

لە ڕێی ڕەوشتەو بناغە بەستنی ئادەمیزادەوەو دامەزرانی لەم دەسکەلایە خاکەدا، بەچەند وشەیەك گوێگرتنتان تکایە.

١/ تەبیاتو نەقڵو مێژوو بڕیاریان داوە، کە ئادەمیزاد لە هەموو گیاندارێك تەواوتر دروست کراوە، هەوێنێکی یەکدگیریو کارەبایی کە لەودا هەیە لە شتی دیکەدا هێندە بەهێز نییە، جگە لەوە دەتوانێ هەر شتێکی کە لەم کانگە خاکییەدا دەربچێ بەهەموو ئەندازەیەك کەویو ژێر دەستی خۆی بکا چ مردە، چ زیندەو، لە دەوری هەرە پێشوودا ڕێگای فێربوونو تەقەلای هەر چەشنە کارێکی پێویستی بۆ کێشراوە. لەگەڵ ئەوەشدا پەروەردگاری گەورە پێ بەپێ، چەرخ بە چەرخ، پیاوی زاناو ژیرو خاوەن ڕەوشتی هەڵبژاردووە کە کۆمەڵی وەخت لە ژیانو خۆشیو پیرۆزگاری دوا نەکەون. ڕۆژ بە ڕۆژ زانینو وریایی لە جووڵە جووڵو بەرزی دابوو لە دوو لاوە: یەکەم/ زانست پەروەرەکان، دووەم/ کاربەدەستەکان. وە لە ڕۆژگاری بابە نووح (کوڕەزای ئادەم)، وەکو زانراوە یەکەمین هۆی لە ناو ڕزگاربوون (کەشتی) دۆزرایەوە، نووح لەگەڵ چەند کەسێك کە ئازا لە ڕێگای ژیانپەروەریدا بوون، سواری کەشتی بوون. لەو لێزماتە زلەدا چەند شەوو ڕۆژێك لەسەر ئاو سووڕانەوە، تا خەڵکەکەی تری تیا بەقڕ چوون، کە ئاو نزم بۆوە بەڕێکەوت کەشتی لە کێوە بچووکەکەی (جوودی)ی لە نیشتمانی کوردانا وەستایەوەو گیری خوارد، خاكو عەرد دەرکەوت، خەڵکەکە دابەزین ئاگریان کردەوەو گەرم بوونەوە، ئینجا پەلەیان کرد کە هێندێ کوختەو هێلانە بۆ دانیشتنیان دامەزرێنن، وردە وردە پەلاماری هەموو پێویستییەکی خۆیاندا، بەرە بەرە

* ئەم وتارە لە ئاهەنگی نەورۆزی ساڵی ١٩٤٧ لە کۆیە، خوێندراوەتەوە.

ئاو کەم بوو، دوورگە دەرکەوت، نەتەوە زۆر بوو، خوارووو ژوور خەڵك هەڵکشاو داکشا، وا نەزانم وەختیش هەوەڵی بەهار بوو کە پێی دەڵێن نەورۆز.

٢/ کە سەرماو بایە بەهێزەکەی حەوت شەوو هەشت ڕۆژیی، هۆزو تیرەکەی حوکمدار (عاد)ی بە قڕدا، ڕەوشتو ژینپەروەران ڕزگار بوون، وەخت ڕێگای دان کە ئاگر بکەنەوەو خۆشیی لە ئەندامو ژینی خۆیان ببینن، بێگومان ئەمە چاخی نەورۆز بوو.

٣/ (سەردەشت) کە بەناوی( زەردەشت) ناسراوە پیاوێکی زۆر بەرزو بەجێ بوو، هەوەڵجار ڕێگیری لە ئاگرپەرستەکان نەدەکرد، هەتا لە ڕۆژی نەورۆزدا بەخۆشی دڵی وان ئاگرێکی زۆر گەورەی دەکردەوە، چونکە دەیزانی ئەم ئاگرە دوو قازانجی هەیە:

یەکەم/ ئەوەیە کە هۆزەکە بە هۆش بێتەوە کە زەردەشت ئامانجێکی تەنهایی خۆی نییە، بەڵکو دەیەوێ هەموویان پێکەوە بژینو خووی ناشیرین لەو ناوەدا لەناو بچێ.

دووەم/ دەیەویست بەهۆی ئەو ئاگرەوە کە لەو ڕۆژەدا دەیکاتەوە، وێنەیەکی تەبیاتیی نیشان بدا تا بزانن نەورۆز ڕۆژێکە هەموو جۆرە گیاندارو گیاو گوڵو کانگەکانی خاکیشی تیا دەژێتەوە، بە میانەی گەرمیو تەڕی هەموو میزاجو تەبیاتی لێکوەشاوە یەکدگیر دەبنو ڕوو لە زیادی دەکەن.

ئینجا گەورەکان.. هاونیشتمانەکان.. هاوخوێنو گیانەکان:

لێتان ئاشکرایە کە نەورۆز شایانی جەژنە، شایانی کۆبوونەوەیە، شایانی پێکبەستنی هاوتەبیاتو هاوڕەگەزانە، شایانی ڕێکخستنی هەموو ئیشو کارێکە لە پێشا بۆ ئەم گەلە کوردە، ئینجا بۆ داکشاوو هەڵکشاوەکانی دوورگە. بەڵام لەگەڵ ئەوە کە هەوێن، تواندنەوە، مەیاندن، ژیان، بەرزی، خزمایەتی، تێکەڵی، جوایەزی، قاڵبوونەوە، خڵتو خۆڵ نیشانی خۆمان دەدەین لەم بەهەشتو مێرخوزاری نەورۆزەدا، داخەکەم مەرگێکی گران بەچاوی خۆمان دەبینین. ئێوەو خواتان! لەو داخە زلتر هەیە؟ لە ڕۆژی ژیانەوەت نەفرەجای مەرگت ببینی؟!! ئامانجم ئەوە نییە کە ئێوە بە ڕووتو قووتی، برسیو تینوویی، بێ چەكو بێ هێز، نەخوێنی یەکتر بڕژن، نە بەگژ خەڵکیشدا

بچن، چونکە (کەزۆر هات قەبالە بەتالە)، (کە کەسیش نەبوو ڕەجەب دەبێتە سەر پالە).

ئامانجم ئەوەیە کە ئیمڕۆ جەژنی دڵە، جەژنی گوڵە، جەژنی تەبیاتە، جەژنی ئادەمیزادە، جەژنی گیاندارە، جەژنی گیاو گوڵە، جەژنی خاکو کانگەیە. ئەم ڕۆژە بوو تەبیاتی گیانداریی بابەئادەمی هێنایە دەرەوەو، بەشی زیندەوەر پەرەی سەند، گژوگیا لە ماتییەوە ڕووی لەبەرزی کرد، هەموو شتێکی تیا سەربەستو ئازاد بوو.

گەرمیو تەڕی، هەموو جۆرە کردەوەیەك دەخەنە بەرکار، پێکەوە دەتوانن دوژمن بکەنە دۆست، دوور، نزیك بکەنەوە. ساردیو وشکی لە سەختی زیاتر نابەخشن.

ئاگری نەورۆز تەنها دەستمایەیێکی دینی نییە، بەڵکو دەزگایەکی قەبەی تێگەیاندنە بۆ (تواندنەوەو مەیاندن - تحليل و تركيب) لە هەموو سەرچاوەیێکی پێویستدا. بەڵام بەهەزار ئاخو داخو مەخاوە، هۆزە هەژارەکەی کورد بەم هەموو ڕێوشوێنو ئاگرەوە، لە ڕێ بەجێماو، لەماڵ دەرکراو، لەسەرما قەسراوە.

خەڵکی، بێ مامۆستا .. لەخۆوە هەستا .. لە ڕێ ڕانەوەستا.. لەماڵەوە پشتی بەستا.. لەبەر ئاگری گەرموگوڕ وەستا.. بووژایەوە دەس بەکارەوە.. بەگەنجی بێ ژمارەوە .. لادێیی کرێ بەشارەوە.. دەمی بە پرسییارەوە .. ڕۆیی بە ڕوویی یارەوە.. کەوتە کانگەی بەهارەوە.. غەرگەو تەزبیحو ساویلکەیی .. پیرێژنو ئەزان هەڵخەڵەتاندن.. بستە لێدانو منداڵ سووڕاندن .. بەقسەی پان پان خەڵك گریاندن .. ئەمانە ڕیشەی جەرگی پساندن!!.

| | |
|---|---|
| زەمانەم خەرتە، زمانەم کورتە | ژێریش بم، گوێم هەر لە پرتە پرتە |
| جەژنە برا گیان، یاخوا گێژەنە | بڕە و مەندەاوە، یا قووڵ، تیژەنە |
| مەلەش نازانم، خنکانم ڕێکە | مردن جارێکە، یار هەر یارێکە |
| گیانلەبەر هەموو بەکاردروستی | بەچووکی خۆیان هێنایە مەستی |
| لە نەورۆزی گەش، ڕۆژو بەرخۆلە | چادریان هەڵدا، لە ڕوویی هەستی |
| هەموو تێگەیین، مارو مێروولە | هەر کەس ڕێسی خۆی تەنیوو ڕستی |

هەر جۆرە گیا، ڕووی کردە بەرزی    بــەرەنگی گــوڵان، مەنــدیلی بەســتی
بەشــی داروبار، بەجاحێڵو پیر    مێیەی بە بەرهات، نێـر، گـوارە گەسـتی
پرۆتـۆن لەگەڵ ئـەلیـکتـرۆنـی    هـەمـوو ئیـشی خـۆی گرتۆتـە دەسـتی
هەوارگەی پیـرۆز، بەخۆراکی شین    دایــە ســپی شــیر، شــیرینو خەســتی
دورنـدە، هەمــوو مل پانو قـەڵەو    هەرچــی تێهەڵــدا، لــەناکاو خــستی
لە ڕووبارەکان، ســەرکەوتن ماســی    ژاری تــێ بــاوە، بــۆچ ڕادەوەســتی؟
چەنـد قەلەندەرو هەژار بوو، خەڵك    تــۆ بــێ درنــشەی، بەرە بــە مــستی
چەند ڕۆژی نەورۆز هاتو، بەســەردا    لەخــەوی شــیرین، نەمــدی هەڵــستی
کارو زانینت، ڕەوشــــتو ڕێکیت    هەمووت هەر دەمەو، قسەی بە قەستی
بە چاو لێکەریــت، ڕازیم برا گیان    چــونکە لەگــەڵ دڵ، تــۆ بەرهەڵــستی
دەماخــت وەکو بادامــی پووچەڵ    خــەڵك بــاخی تــۆی پێــوا بــە بــستی
(پشکۆ) کوژاوە لە کوورەی خەمان    فرۆشــا، لــەناو بــازاڕی چوســتی
باوەشــێن کرا، بەدەســتی کرپاڕ    شـتی پـێ جۆشـاند، بـە چڵو شەسـتی
تونکلی فرێندا، تا بــوە خۆڵەمێش    واتــە، نــەیبینی مەیــدانی ســستی.

هەر بژی نیشتمان .. هەر بژی کۆیە.. هەر بژی قائیمەقام.. هەر بـژی کۆمـەڵی دانیشتوان.

ڕاجی میکایەڵی
کۆیە - نەورۆزی ساڵی ١٩٤٧

# فەرهەنگۆك

( ئـ )

ئاباد: ئاوەدان، ئاوا.

ئابادی: ئاوایی.

ئاپۆرە: گەمارۆ، کۆمای خەڵك پێکەوە .

ئازموودە: ئەزموێنراو، تاقیکراوە.

ئازوردەم: ئازاردەر (فرمکار، تەماعکار).

ئاسار : شوێنەوار.

ئاسیاب: ئاسیاو ، ئاش.

ئاشقەرلو: شەیدای ڕاو ڕاوکار.

ئاشوب: ئاژاوە گێچەڵ.

ئاشوفتە: پەرێشان، شێواو.

ئاغووش: باوەش.

ئافاق: کۆی (افق)؛ ئاسۆ.

ئافتاو: هەتاو.

ئافەت: بەڵا، لەناوبەر، پەتا.

ئاقیبەت: دوایی، سەرەنجام.

ئالودە: هۆگر، متووگر.

ئاڵۆزەر: ئاڵۆزکێن، ئەوەی شت ئاڵۆز دەکا.

ئاماج: ئامانج، مەرام.

ئاهو: ئاسك.

ئاهووان: کۆی ئاهوو.

ئاوەگر: ئاومالکە.

ئاوێتە: هاوێشتە، (خۆم ئاوێتە ماڵی).

ئایینە: ئاوێنە.

ئەتراف: دەوروبەر، ئەملاولای دەموچاو.

ئەجکا : ئەتکا.

ئەخبەس، اخبث، پیسترین.

ئەخرەس، اخرس، لاڵ.

ئەدهەم: کۆتـو زنجیر.

ئەرس، أرث، ئاشووبنانەوە، ئاژاوەنانەوە.

ئەژدەر: کوڵە مارێکی ئەفسانەییە.

ئەستووك: ئەستوورك، کولێرە.

ئەسپەر: بەروانکەیەکی وەك زرێ وایە لەکانزای تەنك دروست دەکرێ.

ئەسرین: فرمێسك.

ئەسکەنجە: گیرگە، گیرە.

ئەســەل، الأثـل، جـۆرە دارێکـە، تەختەکـەی زۆر ڕەقو پتـەوەو تەشتی دارینی لێ دروست دەکرێ.

ئەسیر، اثیر: پایەبەرز، شکۆمەند.

ئەشکباش: سەرما.

ئەعجاف: لەڕو لاواز، برسیو بێ برست..

ئەغمام: غەمو پەژارە.

ئەفروز: ڕووناکی، ئاگر هەڵکردن، گڕگرتوو.

ئەلا: ئامرازی ورياکردنەوە. واتە: بزانەو ئاگاداربە.

ئەلتاف، الطاف: کۆی (لطف) ، دڵنەرمی.

ئەلەستی: دەفرێکی بەنرخە وەکو کریستاڵ.

ئەلەم: ئازار.

ئەلویداع: ماڵئاوایی کردن، بەخوا سپاردن.

ئەلیـرەم : یەکەیەکی کێشانو سەنگ کردنە.

ئەمەش: ئێمە.

ئەنـدوە: ئاه و خەفەت.

ئەنگۆزە: بەری درەختێکە.

ئەنگەز: کەتیرە.

ئەنگوش: ئەنگوست، پەنجە.

ئەنگووت: پشکووت.

ئەنگیز: خۆشییەکی بەردەوام.

ئەنیس: هاودەم، هاوڕاز.

ئەوج: ئەوپەڕی بەرزی شتێك.

ئەیاغ: بەرماوە، بێ برەو .

ئوفق، افق: ئاسۆ.

ئونباشی: سەرکار، سەرلق لەناو لەشکرو سوپادا.

ئونس، أنس: ڕابواردن، هاودەمی، هاودەنگی.

ئۆغەن: بەشـی چـوارەمی مـاوەی چـلەی زسـتان، نـاوی سەرماو وەیشوومەی زستان.

ئیحتیراز: پارێزکردن، خۆ بەدوور گرتن لە شتێك.

ئیذتیاب، اکتیاب: توانەوە.

ئیزتیراب، إضطراب: تێکچوون.

ئیستینتاق، استنطاق، بە قسەهێنان.

ئیستیلا، إستلاء، دەست بەسەرداگرتن.

ئیغتیراق، اغتراق: خنکانـدن.

ئیکسیر: گەوهەرێکە بۆ گۆڕینی کانزا، وەك (گۆڕینی مس بۆ زێر).

ئیلتیجا، إلتجاء: پەنابردن.

ئیلتیهاب، إلتهاب: داگیرسان، سووتانەوە.

ئیلتیفات: ئاوڕدانەوە. لە ئەدەبدا بریتیە لە گواستنەوەی شێوەی قسەکردن لەشێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی دیکە، وەك

لەم دێرە شیعرەی (مەحوی)دا، کە شێوەی ئاخاوتنی
لە نادیارەوە گواستۆتەوە بۆ کەسی ئاخێوەری یەکەم،
(زوبانــــی لالە، بۆحەیرانە، حاڵی بۆ پەرێشانە
لەسۆسەن دەفکرم مەحوی، لەوەصفی نێرگس‌و سونبول).

ئیما: ئاماژەکردن لەرێی سەر دانەواندنەوە.

ئیمتینان، إمتنان: سوپاسگوزاری.

ئینتیساخ، إنتساخ: ڕەشبوونەوە، لەناوچوون.

ئینتیباق، انطباق: ڕێکی.

ئیندراج، اندراج: تێهەڵکێش کردن، تێخستن.

ئینتیقام، انتقام: تۆڵەکردنەوە.

( ب )

بانیس: بێ جێگاو لانەواز، کڵۆڵ.

ڕاغ: ڕاخ، گردو بەرزایی سەوز لەگیا، مێرگ‌و چەمەن.

باد: با.

بادی سەبا: بای بەرەبەیان.

بادە: مەی.

بارەزی: باری درکە زی.

باف: گەڕانەوە.

باڵۆرە: گۆرانی هەڵدانی کوڕو کچ لە جیا، جۆرە دەنگێکە لەگەروودا دێتە دەرێ، بەجووڵەی پەنجە دەنگەکە دەگەڕێتەوە.

بالق: سەرەتای قۆناغی هەرزەکاری، تاو تێکەڕپاو.

بالیف: سەرین ، سەنگیا.

باو: باوك.

ببووسم: ماچ بکەم.

بناگۆش: بنە گوێ.

بە بڕووت: بەهەرمێن، بەنرخ.

بە کوللی: بەگشتی.

بتهێمە: بێمە.(بتهێمە باوەشت).

بەبێ جورم: بەبێ تاوان.

بەتابی من: بەتاوو تینی من.

بەت، بط: مراوی.

بەخولا: بەخودا.

بەخولا: مەبەست لەخولانەوەیە، بەخولانەوە.

بە داگا: بەدایکەوە.

بەدر: مانگی چواردە.

برزۆڵ: برزانگ مژۆڵ.

بژ: بڵاو.

بەڕ: وشکانی، دەشت، بەز، (لاکێش تەختە بەڕە).

بەربەت: ئامێرێکی مۆزیکە وەکو (عود) وایە.

بەرپای: لەبەر ئەو ، ژێر پێی.

بەرگەشتە: گەڕانەوە.

بەرودۆش: دەست لەملکردن‌و بە سینگەوە نووسان.

بەچە: بەچکە.

بەچە تەرسا: بەچکە گاور.

بەستەك: بەستن ، جووڵە لێبڕ.

بەگەردش: بەگەڕخستن، بەدەوریا سووڕانەوە.

بەگردی: بەکۆمەڵ.

بەلاش : بەخۆڕایی.

بەلەك: بووزو بەلەك.

بەڵاڵوك: میوەیەکی سووری ترشە، ئاڵوباڵو.

بە مە: بە ئێمە.

بەنەفشە: وەنەوشە.

بەندەقە، بندقیة: تفەنگ.

بەنگ: بەنج.

بەهانە: بیانو، مەهانە.

بەهەبا: بەفیڕۆ.

بەی: بەهێ.

بەیتی عەتیق: ماڵی کۆن، وێرانە.

بەیدەق: سەربازی یاری شەترەنج (پیادە).

بەیداغ: ئاڵا ، پەرچەم.

بەیرەق: ئاڵا ، پەرچەم.

بورج: قوللە.

بورهان‌و قیاس: دوو زاراوەی زانستی لۆژیکن.

بوت: کیژی دڵبەرو شۆخ‌و شەنگو شەپاڵ.

بوودوجانەو جەلجەلووت: ناوی دوو جۆر نوشتەن.

بوڕادە: وردەی هەر کانزایەك.

بوم: کوندەبەبوو.

بۆشناخ: پۆشتە.

بیدعە: ئەریتی نوێ باو، تازە داهێنراو.

بیمار: نەخۆش، زامدار.

بیماران: کۆی بیمار.

بێز: قێز ، لێب.

بێ پۆش: بێ سەرپۆش، دیارو نەشاردراوە.

بێ عەدەد: بێ ژمار.

بێ مەفەر: بێ دەرەتان.

بێن: بۆن، بۆ.

بێ نەزیر: بێ هاوتا.

( پ )

پاڵوز: بەشێکە لە شەش بەشەکەی زستان.

پەچە: ڕووبەند، ڕووپۆش.

پەڕاگەندە: دەربەدەر.

پەروەرش: پەروەردە.

پەرسۆز: پەرسووتێن، هەڵپرووزێن.

پڕ شکاف: پەرش و بڵاو، داتەکاندن.

پردی هەڵزەلین: پردی جیننەمت، پردی سیرات.

پەژموردە: ژاکاو.

پەشم: ئاوریشم.

پەشیزە: دراوێکی کۆنی بەنرخە، وەکو ئاکەی زیوین بۆ سەر پۆشین بەکاردێت.

پنج: بنەگیا، ڕەگ و ڕیشە، بنکی بەستراو.

پەڵاس: پالاس، بەڕە، ڕایەخی جگ لەماڤوور.

پەیت: توند.

پەیک: وەڵامبەر، نامەبەر، تەتەر.

پەیکان: نوکێکی تیژە دەخرێتە سەر ڕم و تیر.

پوستان: مەمک.

پۆڕ: پان و پۆڕ ، بەرین، ناوی جۆرێکە لە باڵندە.

پۆڕینە: وەک پۆڕ، خەت خەت و خاڵخاڵاوی.

پیسە، بیزە: جۆرە دراوێکە.

( ت )

تا تا: جیا جیا.

تاب: تاو، تاودان.

تات: تاشەبەردی گەورەی لاکێشەیی.

تار: تەرەبوو، دابڕاو، ئامێرێکی موزیکیە.

تار: ڕیشاڵ ڕەگ.

تاری: تاریک.

تاری عەنکەبووت: تەونی جاڵجاڵۆکە.

تاف: هەرەت.

تاق: تاك تەنیا.

تاق: دەلاقەیەکی شێوە کەوانەیی لەناو دیوار.

تاڵووکە: پەلەپەل. بە پەلە.

تالیعی بەیزا: بەختی سپی، گزنگی هەتاو.

تانەجۆ: تانەگۆ، توانج گر، توانج بێژ.

ترنجۆك: جۆرە نەخشێکە لەسەر ماڤوور دەکرێ.

ترووس، تُرس، درع: قەڵغان، زرێ.

تەب: تا، لەش گەرمبوون بەهۆی نەخۆشیەوە.

تکا: ڕجا.

تکا: ڕژا.

تلیانە: سەبەتە، لە شووڵی داری بی دروست دەکرێ.

تەبەر: تەور، بیور.

تەبەه: ئاڵۆزکردن، نادیارکردن.

تەبیات: سروشت.

تەجەللا: درەوشانەوە، دەرکەوتن.

تەخمین: نرخاندن، خەملاندن، قەبلاندن، قرساندن.

تەرەب: ئاهەنگ و خۆشی.

تەرەبناك: دڵخۆش، خۆشگوزەران.

تەڕڕار: گیرفانبڕ، دز و ڕێگر.

تەشریح: شیکردنەوە، توێکاری.

تەشقەڵە: شەڕفرۆشتن، گەڕپێکردن.

تەعنە: ئانووت، ئانەو توانج.

تەعەب: ماندوو بوون.

تەغافول: گەشبینی.

تەك بە تەك: بەتەنیشت یەکەوە.

تەکلیس: بوون بە قسڵ و گەچ، بەڵغ گرتن.

تەلاش: پووازی دار.

تەلاش: هەوڵدان، تەقەلا.

تەنقید: ڕەخنە لێگرتن، شەن و کەو کردن.

تەم تەنوار: خەرمانەی نور، تەمی ڕووناکی.

تەما: نیاز ، ئاوات.

تەمەننا: ئاواتخوازی.

تەمغە: مۆر.

تەن: گیان، جەستە، لەش.

تەنستان: ئاوەدانی مرۆڤ ، زیانگەی ئادەمیزاد.

تەهەمتەن: ئازا، دلێر، نەترس، ناسناوی ڕۆستەم بووە.

تەهریس: وردکردن، هاڕین.

تووبا ، طوبی: خۆشی، کامەرانی، مژدە، ئامرازی خواستنی خۆشی و کامەرانی، ناوی دارێکە لە بەهەشتدا.

توە: تۆیە، (بۆ توە، یا دارو بەردو وەحشییە ڕاجی)

توحفە: دەگمەن، دانسقە، شتی بە نرخ و جوان.

توورباخ: خاك. (وشەیەکی تورکییە).

تووڕە: بسك و کەزی، ئاوچەوان، گەندەمووی ئەملاولای چاو.

تووڕە: مۆری سوڵتانی کە ناوو ناسناوی پاشای لەسەرە.

تووڵ، طول: درێژی.

توولە: سەگی بچکۆلەی ڕاو.

تۆق: گیرە، تەوق.

تۆراخ: ماستی ناو لێ گیراوی شویت تێ کراو.

تۆقە: تەوقە، دەست لەناو دەستنان.

تەیاترۆ: تەماشاخانەی سازندەو سەماکەران.

تیتاڵ: قسەی گاڵتە، تاین و توێن کردن.

تیراز، طراز: جۆر، شێوە، تەرز.

تیشە: تەشوێ، تەشو، ئامێرێکی دارتاشییە.

تیك: درز، قلیش، قەڵش.

تینەت: خاکستەر، قوڕی خیلقەت.

تینتوە: تیتك، پرچی درێژ.

تیشوو، تێشە: زاد، نانەبەرە، پێداویستی و خواردنی سەفەرو ڕێگەی دوور.

تیفل، طفل: منداڵ.

تێك سرماو: تێك سمراو، چوارشانە، دامەزراو.

تیماو: گیرۆدە، کەسێك کە سەر لە شتێك دەرنەکا.

تیهو: زەرکەو.

( ج )

جان: روح، گیان، جوان و لەبەر دڵان.

جان: کۆی جن جنۆکە.

جاویدان: نەمری.

جبوە جبایە: باج و خەراج.

جەبر: هەڵبەستنەوەی ئێسکی شکاو.

جەبین: ناوچەوان، تەوێڵ.

جەراب: شتێکە وەکو کوندە وایە بۆ پەڕینەوە لە ئاو.

جەزب: حاڵ لێهاتنی هەوادارانی تەریقەت.

جەفا: دەردەسەری.

جەفاخوردە: جەفاکێش.

جەلە: ڕستەیەکی وەکو قیشەکدانە منداڵانی لادێ لە گیای گڕگاز (گڕگازیلە)دروستیان دەکرد.

جەڵد: داری حەد، لێدان بەدار، (زاراوەیەکی شەرعییە).

جەمات: کۆمەڵ.

جەماڵ: جوانی.

جەمەر: پشکۆ، بەنگر، پۆلو.

جەنان: تاریکی شەو، دڵ، کرۆك، نهێنی.

جەنە: غەزرین، مانگرتن.

جەیحون: ڕووبارێکە لە باشووری خۆرئاوای ئاسیا. لەچیاکانی پامیرەوە هەڵدەقوڵێ و دەرژێتە دەریاچەی ئاراڵ.

جدەو: جۆرە نەخۆشیەکە لە ئەنجامی زۆر نیش پێکردن تووشی گوێنرێژ دەبێ.

جگ: جگە، بێجگە.

جند: جن، ئەجندە، جنۆکە.

جونبوش: بزووتنی زۆر.

جۆش: قوڵپی ئاوی گەرم.

جیاز: کەرەستەو شتومەکی بووکێنی.

جیلوە: دەرکەوتن، خۆنیشاندان، ڕازاندن، ناوی کتێبێکی ئایینی کوردانی ئێزدییە.

جین: جن، ئەجندە، جنۆکە.

جینان: کۆی جەننەت، بەهەشت.

( چ )

چاپك: چاپوك، چالاك.

چا نیە: چاك نییە، باش نییە، چا نیە.

چاوی تالیعبین: بەختناس، جادوگەر.

چەرست: تۆوو ناوکەو برێشکەی تێکەڵ.

چەغە: چڤە، وشەی دەرکردنی سەگ.

چەقەن: شوێنێك لە چیا، وشك و برینگ و بێ ئاو.

چەلەبی: گەورە پیاوی دەوڵەمەند، بەگزادە (وشەیەکی تورکیە).

چەماو: چڤیایی، لارەوەبوو، چۆمی گچکە.

چەمبەر: کەمەر، کەمەربەند.

چەمەن: چیمەن، باخچە، هەرێز.

چەنگ: ئامێرێکی موزیکیە.

چەنگ: چنگ، پەنجە دەست.

چەوگان: گۆچان.

چراغ: چرا.

چوخس: بێ پارە.

چوغڵ: بەزۆری زۆربە.

چیهرە: چارە.

( ح )

حەجیب: دەرگەوان، پەردەوان.

حەدەق: کۆی (الحدقة) ، گلێنەی چاو.

حەزەر، حضر: نیشتەجێ بوون، شارنشینی.

حەزەق، حذق: زیرەکی و بیرتیژی.

حەزەن: دڵتەنگی و ناخۆشی.

حەسرەت: ئاه و ئەندووە.

حەشامات: کۆمەڵی خەڵك.

حەشەم: بەردەست و کەنیزەك.

حەضیض، حضیض: ئەوپەڕی نزمی.

حەز، حەظ: بەخت.

حەللاف: کەسێك کە سوێند زۆر دەخوا.

حەل: كردنەوە، چارەسەر.

حەمباز: بازدان.

حەنزەل، حنظل، گوژاڵكە تاڵ.

حەيا: نابروو.

حوبارا: ناوى باڵندەيەكە.

حودى، حوذي: عەرەبانچى، ئەوەى گاليسكەى ئەسپان لێدەخورێ.

حور: حۆرى، پەرى، كيژەكانى بەهەشت.

حوسن: جوانى، شۆخ‌و شەنگى.

حيرفە: پيشە.

( خ )

خار: درك.

خارا: بۆ كار ئامادەبوو، ڕاهاتوو لە كار.

خارا: درگاوى.

خاشاك: كاوگۆتەڵ، وردەى دار، پەروپووش.

خاقان: ناسناوى پاشايان.

خاكسار: خاكەسار، بەلەنگاز، داماو، هەژار، بێچارە.

ختتە: وشەى دەركردنى پشيلە.

خرجە: كاڵەك، گندۆرە.

خرجە خرج: داكرۆژين‌و كرۆژتنى هەندێك خواردن.

خرسى: لاڵ، بێدەنگ، زمان بەستراو، سست‌و تەمەڵ.

خەتوە، خطوة: هەنگاو.

خەجەل: شەرم.

خەد، خدّ: رووومەت.

خەدەنگ: تيرى ڕاست.

خەرابات: وێرانە.

خەرام: ژنى باڵابەرزو باريكەلە، بە وەفا.

خەراميدەن: لەخۆبايى.

خەرتەلە: گيايەكى لاسكدارى بەهارانەيە، زۆر خواردنى دەبێتە مايەى گێژبوون.

خەرقە، خەرگە: باڵاپۆشى پياوچاكان، جبە.

خەرگ: قوڕ، خاك.

خەرووس: كەڵەشێر.

خەريدەمەند: كڕيار.

خەرۆ: بێ كەڵك، دەستخەرۆ، مايەپووچ، فريودراو.

خەرەك: ئامێرى لۆكە ڕێسيى.

خەستەك: ڕەنگى شينى تۆخ، كەوەى تاريك، خەست بۆوە.

خەسڵەت: خوو، ئاكار، تايبەتمەندى.

خەشم: تووڕەيى.

خەڵوەت: تەنيانشينى.

خشتو: لەخشتەبردن، تەفرەدان.

خلود: نەمرى، مانەوە.

خوب: خەو، خەوتن.

خواهش: خوايشت، خواست، ئارەزوو، تكا.

خورگە: دەراوى تەنگى ئاو، كە ئاو تێيدا بەتيژى دەروا.

خوررەم: دڵخۆش، دەم بە پێكەنين.

خورد: خواردن (تەمبەڵى خوردو خەوە، هەرچى لە هۆزى وازە). راجى

خورسەند: قانيع، دڵخۆش.

خورشيد: خۆر.

خومار: مەست، كەسێ كەدواى سەرخۆشى سەرى دێشێ.

خوناو: خوناف، ئاونگ، شەونم، پرپشكە بارانى نەرم.

خونسا، خنثى: نێرەمووك.

خۆشبۆ: بۆنخۆش.

خوم، خم: خم، هەش، كوپە، بۆ ڕەنگكردن بەكاردێت.

خومخانە: شوێنى ڕەنگرێژى.

خيرەد: ئەقڵ، ژيرى.

خيرەدمەند: ژير، ئاقڵ، بەغيرەت.

خيز: هەستان، هەستانەوە. (وشەيەكى فارسيە).

خيضاب: ئەو ڕەنگەى كە شتى پێ ڕەنگ دەكرێ. هەروەها بە واتاى سووركردن‌و لە خەنە گرتنيش دێ.

( د )

دالەنگى: دەشەل، دەلەنگى، ناتەواوى.

دامرام: دامركام، خەفەبووم.

دان: بەخشين، خەلە، دانەوێڵە، تۆم، ددان، بە واتايەكى ديكەش بەكار دێ.

دانش: زانست.

دايان: دايەن، ئەو ژنەى شير دەداتە منداڵى خەڵك.

درەم: درهەم، جۆرە دراوێكە، پارەى پەنجا فلسى جاران.

دەبدەبە: زەماوەندى گەورە.

دەبدەبە: مەزناتى‌و شكۆمەندى.

دەبدەبە: ميزڵدان، شيشڵدان، پڕبا.

دەجا: ژان، ئێش‌و ئازار.

دەحەوكێتەوە: دەحاكێتەوە، دەيلێتەوە.

دەرات، دەرهات: (تا ڕەگ‌و ڕيشەى بەلاوازى دەرات. راجى)

دەردەمەند: دەردەدار، لەش بەبار.

دەرقولێو: هەڵقولاو، دەرپەڕيو.

دەر، دڕ: شير زۆريى.

دەستۆيەتى: لە ئەستۆيەتى.

دەستە شکاو: ماڵوێران، فریوخواردوو، کۆڵەوار.

دەستەک: داردەست.

دەشت: جۆرێکە لە مەقامە کوردییەکان.

دەشت: ناوچەیەکی تەخت و بێ بەرزایی.

دەگرفتیم: ڕادەچڵەکێم، وەکو ئاگر گرفەم دێ.

دەغەڵ: دەردەدار، گیای بێگانە لەناو دەغڵدا.

دەل: مەکرباز، بەگریشمە.

دەل: دێڵ ـ سەگی مێ.

دڵ ئارا: دڵخۆش و دڵساز.

دەلاڵ: سەوداگەر.

دەڵەک: گیانلەبەرێکە لە ڕێوی بچووکترەو کەوڵەکەی بەنرخە.

دڵسۆز: دڵشکێن، دڵ بریندارکەر.

دڵڕوبا: دڵبەرو خۆشەویستی بەتین.

دەلیل: ڕابەر، ڕێ پیشاندەر، بەڵگە.

دەنی تەبع: بەدخوو ، چرووک، چکووس.

دەهەن: دەم.

دەهشەت: سەرسوڕمان.

دەهلێز: کارێز، ڕاڕەوی تەسک و درێژو پڕ پێچ.

دەوس: بێ تێخستن، جێ بێ، شوێن.

دەویت: بێ نامووس، قەحپەچی، کەسێ هاتوچۆی قەحپە دەکا.

دووپارە: دوو پارچە.

دوجا، دجی: تاریکی، تاریکایی.

دوڕ: گەوهەر ، مرواری.

دورج: سندوق ، ( دورجی عەقیق).

دوود: دوو ، دووکەڵ.

دوعا: نزا ، پاڕانەوە.

دوند: لوتکە، ترۆپک.

دوندان: ددان.

دەیجوور: تاریکی شەو.

دییە: خوێنبایی، خوێن بژاردن.

( ڕ )

ڕا بوو: هەستا، ڕاپەڕی.

ڕا بێ: هەستێ، ڕاپەڕێ.

ڕابی: ناوی ژنانە.

راحة الحلقوم: ڕەحەتەلوقم، جۆرێکە لە شیرینی.

ڕافزی: تیرەیەکن لە تیرەکانی شیعە.

ڕاشین: ڕاشەن، تێشووی ڕێگا.

ڕام: خۆگونجاندن، ماڵی بوون.

ڕچ: ڕچە ڕێ ، تولەڕێ، باریکە ڕێ.

ڕچ: بەستەڵەک.

ڕچیو: تەزیو بەهۆی بەفرو سەرما.

ڕەبەن: زگورتی، تەنیا ، سەڵت.

ڕەبەنی دێر: ڕاهیبی کڵێسا.

ڕەتاو: دوورخراوە.

ڕەجاڵ: ڕووت و قووت، هەژار، نەدار.

ڕەحیق: شەرابی ساف و بێ غەلوغەش، شیلەی گوڵ.

ڕەخت: فیشەکدان.

ڕەخشان: درەخشان.

ڕەدیف: پاشکۆ، سواری پشت سوار.

ڕەشحەت: پژمە، ناودانەوە، نارەقەدەردان.

ڕەش کوێت: ناوی جۆرێکە لە ئەسپ.

ڕەعنا: گوڵێکی بۆنخۆشە، ناوی ژنانە.

ڕەغەن: کۆگا، موغازە.

ڕەغیف: کولێرە ، ئەستووک.

ڕەفرەف: دۆشەک، نوێن.

ڕەقیب: بەدکارو بەکرۆکی چاودێری سەر دڵداران.

ڕەقێتە: لەش ڕەقبوون بە هۆی سەرماوە.

ڕەم: ڕاکردن، هەڵاتن.

ڕەمەق: پێخۆر، بەرکوڵ، ژینی کولە مەرگی، گیانەلا.

ڕەمیدە: ڕاکردە، ترساو.

ڕەمیم: ڕزیو.

ڕەنجوور: ڕەنجدیدە، ماندوو، مەلوول.

ڕەند: ئازا، دلێر، مێرخاس.

ڕەندی: قەلەندەری.

ڕەها: ئازاد، بەرەڵا.

ڕەهەندە: ڕەهندە، ماڵ بەکۆڵەوە، سەرگەردان.

ڕەوزە: گوڵزار، باخچە.

ڕەویزە: ڕواڵەت، ڕەنگ و ڕووی ڕووکەش.

ڕستۆن: ڕستن، (ڕستۆنکار ڕستنکار).

ڕستەک: ڕست، پەتی باریکی هۆنراو، داو.

ڕەموز: کۆی ڕەمز، هێما.

ڕەموودە: خووپێوەگر، ئالوودە، هۆگر، متووپێوەگر.

ڕوبا: فریودەر، سەرنجڕاکێش.

ڕوباب: ئامێرێکی موزیکیە.

ڕوخ: ڕوو ، ڕوخسار.

ڕوخشندە: ورشەدار.

ڕووبەند: ڕووپۆش.

ڕۆخ: کەنار ، لێوار.

ڕۆزوو: ڕۆژوو.

ڕیا: ڕووبینی، دووڕوویی..

ڕیاباز: دووڕوو، ڕووبین.

ڕیازەت: وەرزش، زاراوەیەکی سۆفیانەیە بۆ بەهێزکردنی ڕۆح و لاوازکردنی نەفس.

ڕیبا: سو، قازانج و زیادەی پارە.

ڕێگوزەر: ڕێبوار، ڕێڤینگ.

ڕیوەڵە: لەڕو لاواز، زەردەڵەی لاواز.

(ز)

زانیبە: توێنەرەوە.

زار: دەم.

زارو نزا: دەم و دوعا.

زاری: گریان.

زاهید: خواپەرست، دنیانەویست.

زاهیر: ئاشکرا.

زبارە: هەرەوەز.

زەبەر: زێڕو زەبەر. (بێ زێڕو زەبەر چیمە لە بازاڕی گرانت؟!) ڕاجی.

زەخم: زام ، برین.

زەخمەمەند: زامدار.

زەخمی سینان: زام و برینی تیر.

زەدە: لێدان، (خەم زەدە، عەشق زەدە).

زەرمەند: زێڕنگەر.

زەڕڕە: ئەتۆم، تۆسقاڵ، کەمووسکە.

زەڕڕات: گەردیلە.

زەڕی ئەحمەر: زێڕی سوور.

زڕەدار: داری بێ بەر.

زڕەراو: ڕاوی بێ بەرهەم، بێ نێچیر گرتن.

زەریە: زەریا، ئۆقیانووس.

زەعفەران: گیایەکی گوڵ زەردە لەجۆری گیا سەلکدارەکان، بۆ دەرمان بەکاردێ.

زەقەن: چەناگە، زەنەخ، چەنەگە.

زەلالەت، ضلالة، ڕێ لێ ونبوون، گومڕایی.

زەمزەمە: شایی و گۆڤەند.

زەنبور: زەردەواڵە.

زەنگ (زنج قولەڕەش)، مەبەست لە خاڵی سەر کوڵمەی یارە.

زەهری هەلا: جۆرە زەهرێکە لە گژوگیا دروستدەکرێ.

زوننار: کەمەربەند (پشتێن) ێکە گاورو فەلە لە پشتی دەکەن.

زوزەنەب، ذوننب: ئەستێرەی کلکدار.

زووینە: مێژینە، ڕابردوو، کۆنینە.

زۆرو زیب: زۆرو جوان.

زیا ضیاء: ڕووناکی.

زیبا: جوان، شۆخ.

زیوەر: بازن و مەچەك بەندی ژنان.

زی: دەوەنێکی دڕکاوییە، بۆ پەرژینکردنی باخ بەکاردێ.

(ژ)

ژیل: بن ژیل، وردەی بنکەوتوو لە بێژینگ.

(س)

سائیرە: (مەسەلەی سائیرە)، هێشتا دەنگ و باوی ماوە، بابەتی قسەوباسی ڕۆژانەی خەڵك، ڕۆژەڤ .

ساغەر: پیاڵەو پەرداخی مەی.

ساو: ساماڵ.

ساو: وشەیەکە بۆ تیژکردنی تیغ و شتی بڕندە بەکاردێ.

سپات: ڕەنگی کاڵ.

سرۆتن: سرەوتن.

سەبا: بای فێنکی بەیانیان. ناوی جۆرێکە لە مەقام.

سەبەق: لەمەوپێش . ڕابردە.

سەبیل: توووتنی پێدەکێشرێ.

سپێر: سەنگەر.

ستێژە، ستیزە: تووڕەیی، ناکۆکی.

سروشك: سرێشك، فرمێسك.

سز: سج ، زج ، زینەوەرێکی ڕەنگ قاوەییە، خوێنی مەڕو ماڵات دەمژێ.

سەتوەت: هێرشکردن، داگیرکردنی شتومەکی خەڵك.

سەخاوەت: دڵ تێری، بەخشندەیی.

سەرو: داری سەرو، سەلو، سنەوبەر.

سەرمەدی: هەتاهەتایی، بێ کۆتایی، هەمیشەیی.

سەرنویشت: سەرگوزەشتەو بەسەرهات.

سستەك: لەشگران، تەمەڵ، خاوخلیچك.

سەفاکەش: شادی بین ، خۆشگوشاد.

سەفاڵ: سووك و چرووك، هیچ لە باردا نەبوو.

سەفەهـ: ڕابواردن و بەفیڕۆدانی وەخت.

سەفوەت: ڕوون، هەڵبژاردەی پاك و چاك.

سەقەر: دۆزەخ ، دۆژ، دۆژەه.

سەقیم: لەڕو لاوازو بنێس، دەردەدار.

سەلب: زەوتکردن.

سەلسەبیل: سەرچاوەیەکە لە بەهەشت.

سەلەم: جۆرێکە لە قەرزو پارە وەرگرتن بەسەر بەروبوومی کشتوکاڵی، بەر لە پێگەیشتن‌و هەڵگرتنەوەی ئەو بەروبوومە.

سەم: ژەهر.

سەماحەت: بەخشندەیی، پایەبڵندی.

سەمەن: گوڵی یاسەمەن، زەردی کاڵ.

سەمەندۆک: پەتێکە سەگ‌و تاژی پێ ڕست دەکرێ، سەرێکی دەکرێتە ملیان‌و سەرەکەی دیکەش دارێکی پێدەخرێ.

سەمەندەر: گیانلەبەرێکی وشکاوەکییە، دەڵێن مادەیەک دەردەدات‌و ناهێڵێ بسووتێ، دژە سووتان.

سەنا، ثناء: ستایش، پێزانین.

سەندەل، صەندەل: جۆرە دارێکی بەنرخە.

سەنگەسار: بەردبارانکردن.

سەنەم: بت.

سەودازەدە: عاشق، ئەویندار.

سەیقەل: صەیقەل، لووسکراو، بریسکەدار.

سەییاد، صیاد: ڕاوچی.

سەییار: گەڕۆک.

سەییارەیی چاوت: چاوی سووڕۆکت.

سەڵمکە، سڵمکە، سملکە: ناوی گیایەکی بەهارییەو، بە شلی لەگەڵ ساوەر لێدەنرێ.

سوبات: خۆڕاگرتن.

سوپەر: قەڵغان ، مەتاڵ.

سوپەند، ئەسپەند: گیایەکی کێوییە، تۆوێکی ڕەشی وردی هەیەو دەیکەنە ناو ئاگرەوە بۆنێکی خۆشی هەیە.

سوخەن: قسەکردن، وتە.

سورەتاو: خۆرەتاو.

سورمە: کلی چاو ڕشتن.

سووزە: سووتان، جۆش، تاوساندن.

سووزەندە: سووتێنەر.

سووت: خۆڵی کاغەزی سووتاو، قوڵکەی داو تێدانانەوە.

سۆجەر: (Soldier)، سەرباز.

سۆراخ: هەواڵ پرسین.

سیاه: سیەه ، ڕەش.

سیپە: حەشارگەی ڕاوچی.

سیپەکوڕ: حەشارگەی مێران.

سیراج ، سراج: چرا.

سیکارد: چەقۆی مەیلەو گەورە.

سیمبەر: کچۆڵەی سپی پێست.

سیمین عوزار: کوڵمەی زیوین.

سینان، سنان: نووکە ڕم، سەرە تیر، ماری ژەهردار.

سینەواز: سینگ فروان، سینگ کراوە.

(ش)

شاپو شەپ: شەق‌و زللە.

شاداب: شادومان، تێرئاو.

شردی: شوشتی، شۆردی.

شە: ئامێری شێکردنەوەی موو و خوری.

شەبانە: شەوانە.

شەبگێڕ: شەوگێڕ، شەوگەڕ، ئاشێک کە تەنها بە شەوان ئیش بکات.

شەبوستان: شەوگار.

شەتەک: توند گرێدراو.

شەداو: تۆڕی ڕاوکردنی ماسی لە تەنکایی.

شەرمەسار: شەرمەزار.

شەفاف: تەنک‌و ڕوون.

شەکوا، شەکوە: سکاڵا، گلەیی‌و نارەزایی.

شەکیب: بەئارام‌و خۆڕاگر، هێور.

شەمیم: بۆن‌و بەرامە.

شەه: پاشا.

شەهتە: پشووسوار.

شەهد: هەنگوین.

شەهپەر: شاپەر.

شەهیق: هەناسە وەرگرتن.

شەودێز: جۆرێکە لە جۆرەکانی ئەسپ.

شکاف: ئاوریشمی کلافەکراو، درز، قڵیش، تلیش.

شکەن: پێچ‌و لوول‌و چین چینیی زوڵف‌و قژ.

شڵێوە: پێکەوە بارینی بەفرو باران.

شمشاد: درەختێکی ڕێک‌و بەرزو بێ گرێ یە.

شوعلە: شەوق‌و تیشک‌و ڕووناکی.

شیرازە: پەراوێز، ڕێکخستن.

شیفتە: شێواو.

شوور: ناوی جۆرێکە لە مەقامەکان.

شۆر: سۆزەی دەروون.

شۆرەت: ناوبانگ، ناسناو.

شیهابی مەن: بریسکەو پرشنگی ئاگرینی من.

(ص)

صەبی، صبي: منداڵ.

صەهبا، سەهبا، صهباء: مەی، شەراب.

(ع)

عابید: خواپەرست.

عاج: دارێکی بەنرخە.

عار: نەنگی، شەرمەزاری.

عاریز، عارض: ڕوومەت، کوڵم، لاجانگ.

عالەمسۆز: خەڵك سووتێن.

عەبەس: ڕەشبین، بێهوودە ، بەفیڕۆ.

عەتیب: گلەگۆ، گلەییکار.

عەدەم: نەبوون.

عەدو: دوژمن.

عەرز، عرض: پانی.

عەزا: پرسە.

عەزادار: پرسەبار.

عەسەس: پاسەوان.

عەقاقیر: دەرمانی لە گژوگیا دروستکراو.

عەقیق: مورووبەکی سوورە.

عەکس: پێچەوانە، وێنە.

عەما: کوێر، نابینا.

عەمباز: حەمباز، بازدانی درێژ.

عەندەلیب: باڵندەیەکی بچووکی دەنگخۆشە، بولبول.

عەنقا: باڵندەیەکی ئەفسانەییە، ناوی هەیەو بوونی نییە.

عەن قەریب، عن قريب: بەم نزیکانە.

عەودەت: گەڕانەوە.

عەوق: پەنگخواردنەوە پەنگانەوە.

عەییار: دەل، مەکرۆ، بەنازو گریشمە.

عوزار: کوڵمە ، گۆنا، ڕوومەت.

عوسرەت: ناخۆشی، تەنگانە.

عوقدە: گرێ.

عیدوان: دەستدرێژی.

عیسمەت: بێ گوناهی، دوورەپەرێزی لە گوناه.

عیوەج، عوج: خواری، نارێکی.

(غ)

غار: غاردان، ڕاکردن، ئەشکەوت.

غالییە: بۆنێکی خۆشە.

غروور: لەخۆبایی.

غەبغەب: بەرچەناگە.

غەربەنگ: گیایەکە، بەرەکەی وەك بەری خاشخاش وایە.

غەریب: ئاوارە لە وڵات.

غەریق: خنکاو ، نوقمبووی ژێر ئاو.

غەزین: مانگرتنی ئاژەڵ، تووڕەبوون.

غەزەنفەر، غضنفر: شێر.

غەصصاب، غصّاب: زەوتکەر.

غەمزە: تیلەچاو، چاوداگرتنی بەناز.

غەنناج: نازدار.

غوتتە، غطة: نقووم بوون، بە توندی گوشین.

غوربەت: وڵاتی غەریبیو ئاوارەیی.

غوصصە، غصه: دڵتەنگی.

غیلمان: کۆی غولام، کوڕیژگە، خزمەتکارانی بەهەشت.

(ف)

فامیدە: فامکردە، تێگەیشتوو.

فال: نوقڵانەی خۆشی، ڕوونبینی.

فەتارەت: فەوتانو لەناوچوون، هێوریو بێ دەنگبوون.

فەج، فج: شیو، دۆڵ، چاڵ.

فەججی عەمیق: چاڵی قووڵ.

فەحەل، فحل: زڕو بنبەر، نێرەی هەموو گیاندارێك.

فەرتووت: ناکۆك بوون، بڵاوبوون، لێکدابڕان.

فەرخوندە: پیرۆز.

فەرزین: دڕاندن، پچڕ پچڕکردن.

فەرزین: دابەشکار.

فەریب: فریودان، خاپاندن.

فەسال: ڕەزا ، ڕوخسار.

فەسیح: زمان ڕەوان، زمان پاراو، ڕەوانبێژ.

فەنا: لەناوچوون.

فەنەر: چرا، لامپا.

فرزەند: منداڵ.

فسوون: ئەفسوون، سیحر.

فشان، فشانی: بڵاوە پێکردن، پرژاندن.

فوغان: ئاه و ناڵەو گریانی زۆر.

فیراق: جودایی.

فیدیە: ڕزگارانە، ئەوەی دەدرێ بۆ ڕزگاربوون لە شتێك.

فەڕ دەوس: بێ تێخستنی بە فەڕ.

فیردەوس: بەهەشت.

فیشاڵ: درۆو دەلەسە، خۆهەڵکێشان.

( ق )

قادرمە: بەپیزە، قالدرمە، پێپلیکانە.

قاری الکف: لەپخوێن، جادوگەر، دەستناس.

قامەت: بالا.

قاوت: ناردی گەنمی برژاو، ناردو وردەی قەرەخەرمان.

قایەغ: هۆیەکی پەرینەوەیە لە زێو دەریاچەکان.

قەبالە: تاپۆی موڵك.

قەبەس: بەشێك، نەختێك، دەستەچیلە، وەرگرتنی کەمێك ئاگر بۆ کردنەوەی ئاگرێکی دیکە.

قەبیح: ناشیرین، دزێو.

قەتارە: قەتارەی سوخمەو چەفتەی ژنان کە بەتاکەی زێڕو زیو دەرازایەوە.

قەپێلك: قاوغ، توێکڵ.

قەدەح: خونچە، پشکۆژ.

قەدەح: کاسەی مەی پێخواردنەوە، پەیالە، پەرداخ.

قەدەر: چارەنووس. (ڕووداو).

قەزا: چارەنووس. (دانراوو دیاریکراوە).

قەزاز: فرۆشیاری قوماشی قەزو.

قەزو: قوماشێکی نەرمی وەك ئاوریشمە.

قەسریو: ڕەقبوونەوە لەسەرمان، ڕجیو.

قەشقیان: شووم، بەدبەختی.

قەقنەسبال: قەقنەس ئاسا، باڵەکەو.

قەلاش: دۆڕاو، مایەپووچ، هیچ پێنەماو.

قەلان: پاشماوە باقی. (وشەیەکی تورکی یە).

قەلان: کۆی قەل.

قەلانگ: ئاسن و داری سەرخوار بۆ میوە لێکردنەوەو دەرهێنانی شتی لەچاڵ کەوتوو.

قەلەندەر: هەردەگەڕ، بێکەس و بێدەرەتان.

قەلەنە: تووتنی پێدەکێشری.

قەمتاڵ: ڕەگ و بنی گەلا ڕێواس.

قەهقەهە: قاقا، پێکەنینی بەرز.

قەوس و قوزەح: پەلکە زێڕینە، کۆلکە زێرینە.

قوببە: گومەز، گومەت، گومبەت.

قوتر: تیرە.

قورعە: تیروپشك، خۆوبەخت.

قولزوم: دەریا، دەریای سوور.

قولقولە: ناوی گوندێکە لە دەشتی کۆیە، ناوێك لەهەموو لاوە هەڵقولێ.

( ك )

کاج: سنەوبەر.

کاخ: کۆشك و باڵەخانە.

کاس: وڕ.

کاسیدە: بێ بازاڕی، بازاڕی بێ فرۆش.

کام: ئارەزوو، ئاوات، چێژ.

کام: ناکام ، ئەنجام .

کام: دەف ، زار .

کاو: سەختترین شوێنی شاخ.

کەبك: کەو، درگە بۆ ڕێ ڕۆیشتنی کەوانە.

کەپوو: لووت، دفن، کەپ، بێفڵ.

کەرپووچ: خشتی سوورەوەکراو.

کەزی: هۆنی پرچ.

کەستەك: کەرسەك، کڵۆ خاکی گەورە.

کەشاکەش: ململانێ، ئاکۆکی، گوریس کێشکێ.

کەلەدار: داری داهێنراو بۆ دەوری بێژینگ و سەرەند، کەللە.

کەڵەك: کۆمەبەرد، بەردی لەسەریەك هەڵچنراو. هۆیەکی پەڕینەوە لەئاو.

کەلکیت: شانەیەکە، جۆلا بۆ سفت کردن و کوتانی تەون و چنین بەکاریدەهێنێ.

کەم، الکم: چەندێتی. زاراوەیەکی زانستی لۆژیکە.

کەمێشك: کێچ.

کەو: سەرەند، سەرەد، لە بێژینگ گەورەترەو دانەوێڵەی پێ دادەبێژرێ.

کەیف، الکیف: چۆنێتی. زاراوەیەکی زانستی لۆژیکە.

کوچك: بەرد، سەنگ.

کونجڕ: زبری و گرژی.

کونجڕ: لاپەسیو.

کۆز: شوێنێکی تەیمانکراوە بۆ داگرتنی بەرخ و کار.

کۆس: بەخت.

کۆفیە: جۆرێك لە سەرپۆشی ژنانە، تاسکڵاوی ژنان، کڵاوزێڕ.

کۆم: کووڕ ( پشت کۆم). چەماوە.

کۆه: کێو ، چیا، شاخ.

کیبر: گوناهی گەورە.

( گ )

گاپ، لاف و گاپ: خۆبادان و خۆهەڵکێشان.

گازووک: شتێک کە گاز بگرێ

گاهێ: گەهێ، جارێ، کاتێ، دەمێ، هەندێ جار.

گنخن: لەڕو لاواز، بۆن گرتوو.

گەپ: گاڵتە، گەمە.

گەج: نەناسراو، بێگانە.

گەدا: هەژار، دەرەوزەکەر، سوڵکەر.

گەرداب: گەرداو، گێژاو.

گەردوش: گەردش، گەڕان و جووڵەو سووڕانەوە.

گەرن: گەردەن، گەردن.

گەزەن: ئێشوئازار، تیغی بینەدۆز.

گەزەند: زیان.

گەزەندە: گازگر، قەپگر.

گەزیزە: ناوی گوڵێکی بەهارییە.

گەنج: کۆگا، خەزنە.

گەنجوور: خاوەنی خەزنە، خەزنەدار.

گەندوم: گەنم.

گەوارا: چاوپۆشی، بەخشین لە گوناه.

گەوارە: گەواڵە، پەڵە هەور.

گرد: گر ، تەپە، تەپۆڵکە.

گرد: کۆبۆوە ، خڕبۆوە ( گردوکۆ ) .

گرژینەوە: بزە کردن.

گروێ: گەڕ ، گول.

گریش: ناوی باڵندەیەکی برندەو درندە پیشەیە، کورتەو باڵ درێژو،چرنووک قولاپی و تیژە..

گلە: گلەیی.

گورسەن: برسی. (وشەیەکی فارسییە).

گورۆ: گرۆ، گرەو.

گوزیدە: هەڵبژاردە، پەسەندکراو.

گوژاڵک حنظل: ڕووەکێکی خشۆکە، وەکو شەمامە وایەو تامی زۆر تاڵە.

گوستاخ: ئازا، نەترس.

گوش: گوێ، گوێچکە.

گوفتم: گوتم.

گوڵخەن: دۆزەخی گەرماو، کوورەی گەرماو.

گوڵسا: وەکو گوڵ، گوڵئاسا.

گوڵعوزار: شۆخ و شەنگ، ڕوخسارگوڵ.

گوڵووک: شکۆفە، گوڵی درەخت.

گومڕا: ڕێ ونکردوو.

گوڵگەشت: سەیرانگا.

گوم گەشتە: بزربوو، ونبوو، گومبوو.

گوهەر : گەوهەر ، مرواری.

گۆ: خڕ ، تۆپ.

گۆیندە: گۆرانیبێژ، پەخشەر.

گیسوو: پرچ و نەگریجە.

( ل )

لاپ: چەپۆک.

لاجلەو: ئەسپی مەشق پێنەکراو، سەرکێش، تۆڕ.

لاغر: بێ توانا، زەردو لاواز.

لاکین، لکن: بەڵام.

لەب : لێو.

لەبالەب: تژ، پڕاوپڕ.

لەبیب: زمانزان، لەبلەبان.

لەچ: لێوی پڕو ئەستوور.

لەچەک: لەچك، سەرپۆش.

لە چکا: لە چی بکات (خەرمەنی دەردو خەمی دڵبەری (ڕاجی)، لە چکا؟!.

لەعل: مورووێکی ئاڵی گرانبەهایە، درکەیە بۆ لێوی ئاڵ.

لەعلی تیردار: یاقووتی پرشنگدار.

لەک: بریتییە لە (١٠٠٠٠٠) سەد هەزار.

لەکتریک: ئەلەکتریک.

لۆرە لەب: داری خڕو لووس بۆ پێش و دواوەی مەشکە، کە داردۆژنگی تێدەخرێ.

لیام: گلەیی و گازندەو سەرزەنشتی کردن.

لیباس: پۆشاک، جلوبەرگ.

لیقا: دیدار.

لیوە: لەو لیتە.

لێژەن: لێزنە، دەستە. ( لێژەن بە لێژەن بڕۆن)، شوێن و ڕێگای لێژو سەر بە نشێو.

( م )

مائیل: لار، خوار، حەزلێکردوو، مەیل لێ بوو.

ماتەل: مُعطّل: پەکخراو، دواخستن.

ماک: بۆماوە، زگماک.

مالم: پیاوی نابینی جولەکە.

مامڵەت: مامەڵە، سەودا.

مانەند: وەک ، بە وێنەی.

مەحمەل: کەژاوە.

مەنیوس: بێبەش، کڵۆڵ، هیوابڕاو لە شتێک.

مەتڵەب: داواکاری.

مەجریس: کۆڕو کۆمەڵی دیوەخان، مەجلیس.

مەجوس: ئاگرپەرست.

مەحەك: (سەنگی مەحەك)، بەردی زێڕ ئەزموێن.

مەحز: (محض) تەنها.

مەخلوت، مخلوط: تێکەڵاو.

مەخمەر: دەفرێکی دارینی قووڵە بۆ مەی خواردنەوە.

مەخمەر: ناوی جۆرە قوماشێکی ژنانەیە.

مەخمەر: پانەی مەیخواردنەوە.

مەدەد: یارمەتی.

مەردوود: ڕەتکراوە.

مەردوم: گلێنەی چاو.

مەرغولە: زوڵفی لوول.

مەزاق: تامو چێژ.

مەغز: کاکڵە، (مێشك، مەژی).

مەستوور: داپۆشراو، نادیار.

مەسقەت، مسقط: شوێنی کەوتن، جێکەوت، کەوتنگە.

مەشبووك: بەتۆڕەوە بوو، گیراو بەهۆی تۆڕەوە.

مەشکووك: گومان لێکراو، دوو دڵ بوون لە شتێك.

مەقسەد: نیاز، مراز.

مەلاحەت: جوانی، خوێن شیرینی.

مەلامەت: لۆمەکاری.

مەلەك: فریشتە.

مەم گردو مودەووەر: مەمك خڕو قیت.

مەملوك: گراو بە هی خۆ، دەست بەسەرداگیراو.

مەن: کێشانەیەکە، من، مەندو گران.

مەنقەل: مەقەڵی، کوورەی ئاگر.

مەه: مانگ، هەیڤ.

مەهتووك: ئەتککراو، ڕیسواکراو.

مەهد: بێشکە، لانك، گەهوارە.

مەهوەش: سەرسوڕهێن، مایەی سەرسوڕمان.

مەیکەدە: مەیخانە.

مشتاخ: ئەو شوێنەی کە بۆ هەڵخستنو بڵاوکردنەوەی تری ئامادە دەکرێ.

مفت: بەلاش، خۆڕایی.

مواسات، مواساة: دڵنەوایی.

موافات، موافاة: پێشکەشکردن.

موبەززیر، مُبذِّر: دەست بڵاو.

موتابیق، مطابق: ڕێك.

موتتەکا: سەرین، پاڵپشت، هەر شتێك پشتی پێوە بدرێ.

موترەف: بەتوانا، خۆشی بەخش، ئەو کەسەی ئەوەی بیەوێ دەیکاو ڕێگری ناکا.

موحەییا، مُحیّا: ڕوخسار، ڕوو، سیما.

موختەل: ناتەواو، لاسەنگ.

موخنیق: خنکێنەر.

موخەتتەت: نەخشە کێشراو.

موخەڵلەت: تێکەڵ کردن.

موژگان: برژانگ، بژۆڵ، موژە.

مورغ: مەل، باڵدار، پەلەوەر.

موزتەڕ، مُضطر: ناچار.

موسەففا: پاڵێوراو.

موسەڵلەت، مسلط: زاڵ، دەسەڵاتدار.

موشتەری: کڕیار.

موشتەری: ناوی یەکێك لە هەسارە گەڕۆکەکان.

موشك: مێشك، میسك، بۆنێکی خۆشە لەناوکی جۆرێك ئاسك دەردەهێنرێ.

موشکی خوتەن: میسکی تورکستانی چین.

موشکە فشان: موشك پژێن.

موشکین: ڕەش.

موفەڕڕەت، مفرط: بەفیڕۆدەر، دەستبڵاو.

موقیم: نیشتەجێ، نیشتەنی.

مونیر: ڕۆشن.

مول: شەرابی ترێ.

موهەییا: ئامادە.

مووکاری: موتابچی، کەسێ کە خەشەو خەرارو شتەکانی دیکە لە موو دروست دەکات. تیژکردنی دەمی تیغ تا ئاستی مووکردن.

مۆنجە: گەڕانەوەی بە تەوژمی ناوی ڕاوەستاو.

مۆمیا: تەحنیت، بەو لاشەیە دەگوترێ کە دەرمان دەکرێ بۆ ئەوەی بۆن نەکاو نەرزێو بمێنێتەوە.

میجرەف: سەوڵ.

میجمەر، مجمر: ئاگردان، کوانوو.

میحوەر: خولگە.

میحاق، المحاق: لاوازبوونو نزیکبوونەوە لە مەرگو ناوابوون.

میدراڕ: تەڕ، لێشاو، باراناوی.

میعراج: عوروج، بەرزبوونەوە.

میعیار: پێوانە.

مینتەقە، منطقة: ناوچە، دەقەر. منطقة الجوزاء : سێ ئەستێرە پێکەوەکەی ئاسمان.

میندەف: ئەو دارەی هەلاج لۆکەی پێ بەرە دەکا.

میهتەر: گەورە پیاو، سەرۆکی هۆز.

( ن )

نابەڵەد: نەشارەزا.

ناخام: نا خاو، کەییو.

ناخون: نینۆك.

نارەوەن: دارێکی جوانو سێبەردارو بێ بەرەو لكو پۆپی جوانی هەیە.

ناسوفتە: نەسواو، تیخی گوڵی لە هەسان نەدراو، نەسماو.

ناگوزوری: ناتەواوی، کەموکوڕی ژیان.

نافە: ناوك.

ناوان: نێوان، بەرزین، گۆی ناو.

نچمتا: لەش داهێزران بە تا یەکی سووك.

نسار: نسرم، شوێنێك تاو نەیگرێتەوە.

نم: نەم، خوناڤ .

نمو: گەشە.

نەحیف: لاواز، باریکەلە.

نەچناو: نەچنراو، ناوەچۆڕنەکراو.

نەحس: شووم، بەدوێم.

نەدامەت: پەشیمانی.

نەدیم، ندیم: برادەر، هاوڕێ.

نەزار: ڕەزیل، قرچۆك، درێژدادڕ.

نەزارە، نظارة: تەماشەوان.

نەس، نص: دەق.

نەستەرەن: جــۆرە گوڵــەباخێکی چــکۆلەیە، شــیلانی پەروەردەکراو.

نەسەق: ڕێکوپێکی، دەستوور، شێواز، ڕەوەن.

نەشیب: سەرەوژێر ، نشێو.

نەعت: وەسپ، پەسن، باسی خوو و ناکاری کەسێك.

نەعەس: خەواڵوویی، وەنەوز، خەوەکوتکێ.

نەفیر عام: چەك هەڵگرتنی زۆرینـەی خـەڵك بـۆ شـەڕ لـەدژی دوژمن.

نەفیر: بانگ ڕاهێشتن.

نەقد: ڕەخنە، دراو.

نەقیب: ئـەو سـەرۆکەی کـە ڕێکخـراوە پیـشەییەکان هەڵیدەبژێرن.

نەکەب: بەڵا، کارەسات، کۆست.

نەوازیل، نوازل: بەڵاو کارەساتی گەورە.

نەوخێز: نەوجوان، هەرەتی جەوانی.

نەودەمیدە: تازە پشکوتوو.

نەوڕەس: تازەپێگەیشتوو، ناوی باڵندەیەکە.

نووسەك: نووسەکە، مووسەکە، گیایەکە بەرەکەی وەکو بـەری گیای کونجرە (کونجرکە) وایەو بە جلو بەرگو مەرو ماڵاتەوە دەنووسێ.

نەیستان: قامیشەڵان.

نەیشەکەر: قامیشی شەکر.

نیشات، نشاط: چالاکی، چوستی، ڕۆح سووکی.

نێش: ژان، ئازار، چزوو.

نیصاب: نۆبەرە، دەستەبەربوونی ڕەوایی بۆ بڕیاردان، پشكو بەش.

نیهاد: بنچینە، نیاز.

نیهان: نهێنی، شاراوە.

( هـ )

هـاڕووتو مـاڕووت: گوایـە دوو فریـشتە بـوون خـەڵکیان فێـری سیحرو جادوو کردووەو، خوداش لە چاڵی (بابل) هەڵیواسیون. مامۆستـا مـەلا عەبدولـسەلام حەیـدەری لـە بەرنامەیـەکی تەلەفزیۆنیدا گوتوویەتی: لـە زەمـانی حـەزرەتی ئیبراهیم دوو برابوون لە دەڤەری بێتواتە، هاڕووت چۆتە ناوچەی سۆرانو گوندی (هەرووتە)ی ناوەدان کردۆتەوە.

هاڵۆز: ئاڵۆز.

هەتك: نەتك، ڕیسواکردن.

هەتیمە: پارچە پۆڵایەکی کونکونە، زێڕنگەر تاڵە زێڕی پێدەگوشێو پێی ڕاستدەکاتەوە.

هەپ: هەبە، هەپك، سەرەزانەی هەوجار.

هەدەر: بەفیڕۆدان.

هەژنۆ: هەشت نۆ (هەژنۆ ڕۆژ دەبێ هاتۆتەوە).

هەرەست: قرمێسك.

هەل دەست: دەرفەت بەدەست.

هەلوع، هلُوع: برسی، چاوچنۆكو پارە پەرست.

هەڵزەپەتا بوو: ناوسا بوو.

هەمتا: هاوتا، هاوسەر.

هەمڕەھ: هاوڕێ.

هەمس: چرپە، چپە.

هەمشەری: هاوشاری.

هەوا: ئارەزوو، ئەڤین.

هەوا: با.

هەواخوان: گۆرانیبێژ.

هوما: باڵندەیەکی ئەفسانەییە.

هۆزە: مەشقکردن.

هەیجا: شەڕ، ورووژان، ڕق هەستان، تووڕە.

هەیهات: وشـەیەکی عەرەبییـە، بـۆ دووری‌و نەهاتنـەدی هیواو ئاوات بەکار دێ.

هیجران: لێـک دابـڕان، دوور کەوتنـەوە لـە ژن بـەبێ تەڵاقدان..

هەیولا: مـاکو بنیـچەی ڕەگـەزو مـاددەی سـەرەکی هەرشتێک.

(و)

واز: کراوە.

وازە: وازهێنـاو.( ئەمبـەڵی خـوردو خـەوە، هەرچـی لەهۆزی وازە. ڕاجی)، خۆ تێ نەگەیاندن.

واژوو: ئاوەژوو، پێچەوانە.

واژوون: سەرەو بن.

وام: قەرز.

والە،( ولهان ): شێت‌و شەیدا، دێوانە.

ویساق، وثاق: پەت، هەرشتێک بۆ بەستن بەکاربێت.

وەتاخ: ژوور، هۆدە.

وەحشەت: دابڕان‌و دوورکەوتنەوە لە خەڵک.

وەرتە، ورطة: گرفتاری، تووشبون.

وەز: وەزەی، فەریکە گوێز .

وەزەن: ئارەزووی پێوەدان.

وەزی : هەڵیکرد، هات. (نەسیمی نیوەشەو وەزی). ڕاجی

وەزی: بەزی، دۆڕاو لە شەڕو مەلەدا.

وەستەک: ڕێ نەبڕ، پشوو کورت. (مەبە بارگیر سوارو نەسپی وەستەک) ڕاجی.

وەسمە، وسمە: دەرمانێکـە تێکـەڵ بـە خەنـە دەکـرێ بـۆ قـژ ڕەشکردنەوە.

وەغا، وغی: جەنگ.

وەڵاش: هاوڕێ ، هاوەڵ.

وەڵاشی: هاوڕێیەتی.

وەنەوز: خەوەکوتکێ.

ورتە: چپە، پسکە.

وڵە: مڵە، جۆبڕکە.

ویداد: خۆشەویستی، حەزو ئارەزوو کردن.

ویسال: ژوان، بەیەک گەیشتن.

ویش: نەویش.

ویقار: سەنگینی.

ویم: نـەوم. (خـوویی ویـم کەوتـە سـەرو، عیـشق بـە قووەت کە دوا). ڕاجی

(ی)

یەخسیر: ئێخسیر، دیل.

یەلهەمت یلهث: دەوەڕێ.

یەم، یم: دەریا.

## پێرستی دیوانی ڕاجی

(ز)



(ژ)



(س)

(ف)



(ق)



(ك)

(ن)

(ه)

## (و)

## (ۆ)



## (ی)

## (ێ)



## چوارین



## چوارینی تەرجیع بەند

## هۆنراوەی ئایینی

هەمەڕەنگ

أ- جووت سەروا



ب- وتار

## سوپاس و پێزانین:

بەناوی بنەماڵەی ڕاجییەوە، سوپاس و پێزانینی خۆمان دەردەبڕین بۆ ئەو بەڕێزانەی کە لە ئامادەکردنی یەکەمجاری دیوانی ڕاجی دا بەشداربوون و ئەرکیان کێشاوە، یان بەهەر شێوەیەك بووبێ هاوکاریان کردووین و هەوڵیان داوە بۆ پاراستنی دەستنووسەکان و ناساندنی ڕاجی.

سڵاو و دەروودیش بۆ گیانی پاکی بەرزی ئەو بەڕێزانە دەنێرین کە لە ژیاندا نەماون و لەخەمی بڵاوکردنەوەی دیوانی ڕاجی دا خامەی بەبڕشتی خۆیان تاوداوە:-

- مامۆستا (مەسعود محەمەد) کە کاتی خۆی پێشەکی بۆ دیوانەکە نووسیوە.

- هونەرمەندی بلیمەت (بەدیع باباجان) کە کاتی خۆی وێنەی ڕاجی بۆ بەرگی دیوانەکە، کێشاوە و دواتر فەوتاوە و لە بەین چووە.

هەروەها سوپاس و پێزانینمان بۆ بەڕێزان:-

- مامۆستا (محەمەدی مەلا کەریم) کە دوای ئامادەکردنی یەکەم جاری دیوانەکە بە شیعرەکاندا چۆتەوە و لە ئامادەکردنی ئەمجارەشدا سوودێکی زۆرمان لە ڕێنمایی و سەرنجەکانی بەڕێزیان بینی و، ماوەی چەند ساڵێکیش دیوانە دەستنووسەکەی لە لای خۆی پاراستبوو.

- مامۆستا (عەبدولڕەزاق بیمار) کە لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا، بابەتی (گەڕانێك بە دیوانی شاعیری گەورەدا: ڕاجی) نووسیوە و بڵاوکردۆتەوە.

- مامۆستا (جەلال زەنگابادی) کە لە ڕۆژی (١٩٩١/٣/١١ - ڕاپەڕینی شاری هەولێر) دیوانە ئامادەکراوەکەی ڕاجی بۆ چاپ، لەگەڵ چەند دەستنووسێکی دیکەدا هەڵگرتبۆوە و لای خۆی پاراستبوونی، دوایش بەخاوەنی کردبوونەوە.

- مامۆستا (عەبدوڵڵا دارتاش) کە لە ساڵانی هەشتادا لەگەڵ (کاوە ڕاجی) هەوڵی زۆری دا بۆ چاپکردنی دیوانەکە، بەڵام ڕاپەڕینی گەلی کوردستان بەسەردا هات و چاپ نەکرا